چیخوف

کۆمەڵە چیرۆک

# زندە خەون

گۆڕینی لە فارسییەوە

**حمە کەریم عارف**

هەولێر - چاپی یەکەم

2001



**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**کوردستان ت. «۲۲۲۹۹۹۲»**

e.mail:mukriani@yahoo.com

- کتێبی ژمارە: « ٦٣»
- کتێب: زندە خەون: کۆمەڵە چیرۆک
- نوسینی: چیخوف
- گۆڕینی لە فارسییەوە: حەمە کەریم عارف
- هونەرکاری ناوەوە: قاسم قادر
- بەرگ: محەمەد قادر
- چاپی یەکەم: هەولێر – ٢٠٠١
- ژمارەی سپاردن «٢٥٦»ی ساڵی ٢٠٠١دراوەتێ.
- چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر

# پێڕست

# وتەیەک

## چیخوف ١٨٦٠-١٩٠٤

چیخوف یەکێکە لە چیرۆکنووسە هەرە دیارەکانی روسیاو شۆرەت ونێوبانگی جیهانی هەیە، بۆ خۆی لەبواری چیرۆکی کورتدا خاوەنی رێبازی تایبەتی بووەو بە دامەزرێنەرێکی هەرەگەورەی ژانری چیرۆکی کورت دەژمێردرێ وپاشان بوو بە قوتابخانەیەکی ئەدەبی ئەوتۆ کە لەسەرانسەری دنیادا پەیرەوانی خۆی هەبوو.

ئەم پیاوە هەرگیز تووشی غرورو خۆپەسندی نەبوو، وێرای ئەوەی پتر لە ٤٠٠ بەرهەمی هەمەجۆری وەک: چیرۆک، چیرۆکی درێژو نۆ ڤلێت. شانۆنامە و یادداشت وگوتار و نووسینی دی بلاوکردۆتەرەو پایەیەکی ئەدەبی یە کجارگەورەی هەبووە، هەرگیز حەزی بە خۆنواندن نەکردووە، حەزی نەکردووە باسبکرێ و پێیدا هەڵبگوترێ، ئەم نامەیەی چیخوف بەلگەی ئەو قسەیەی سەرێمانە،، نامەکە وەلامی نامەی دۆستێکی خۆیەتی بەناوی دکتۆر روسولیموف. کە هاودەورەی زانستگەی پزیشکی بوون. چیخوف لەو نامەیەدا دەڵێت: «.. داوات لێکرد بووم ژینامەی خۆم بنووسم. من لەم نەخۆشی ژیننامە نووسینە زۆر بێزارم. هیچم لەوە لا ناخۆشتر نیە کە هەندێ شت دەربارەی خۆم دەخوێنمەوە. خۆ لەوە ناخۆشتر ئەوەیە کە هەستم دەربارەی خۆم بنووسم و چاپی بکەم. بە هەرحاڵ وا هەندێ شتی کەم، برێ حەقیقەتی بێ رتووش وبێ پەردەم دەربارەی خۆم لە پارچە کاغەزێکی جیادا بۆ نووسیوی ولەوەش پترم لە دەست نایەت. .»

خوێنەری بەرێز بەندەش وا دەقی ئەو شتەکەمەی سەر کاغەزە جیاکە دە خەمە



بەردەستی ئێوەی هێژا: «.. من، ئانتوان چیخوف لە ١٨٦٠/١/١٧ دا، لە تاگانرک هاتوومە دنیاوە. سەرەتا چوومە قوتابخانەی یۆنانی (کلێسای ئیمبراتۆر قە ستەنتین) پاشان لە قوتابخانەی تاگانرک درێژەم بە خوێندن دا. لەساڵی ١٨٧٩ دا چوومە زانستگەی مۆسکۆ، خۆ م لە کۆلیجی پزیشکی ناو نووس کرد. لەو تەمەنەدا هێندە سەرم لە کۆلیجەکان دەرنەدەکرد بیرم نییە بۆچی کۆلیجی پزیشکیم هەڵبژارد. بەڵام پاشان لەم کارەم ژێوان نەبوومەوەلە یەکەم ساڵی زانستگەمەوە دەستم بە نووسین کرد. نووسینەکانم لە گۆڤارە هەفتانەکان و لەرۆژنامەکاندا بلاوەکردەوە. کە زانستگەم تەواوکرد، نووسین بوو بوو بە پیشەم. لەساڵی ١٨٨٨دا خەلاتی پۆشکینم وەرگرت. لە ساڵی ١٨٩٠ دا چووم بۆ تاراوگەی ساخالین تا کتێبێک لەمەڕ نەفیکراوو مەحکومانی رژێمی تزاری بنووسم. لە ماوەی بیست ساڵەی ژیانی ئەدەبیم دا جگەلەرپیۆتاژ، یادداشت وئەوگوتارانەی کە رۆژانە لە رۆژنامەکاندا بلاوم کردونەوەتەوە وئێستا پەیداکرنەوەو کۆکردنەوەیان یەکجار زەحمەتە، پتر لە ٣٠٠ چیرۆک وئەفسانەم نووسیوە و چاپم کردوون. هەروەها نما یشنامەشم ئامادەکردوە.

بێگومان خوێندنی من لە کولیجی پزیشکیدا کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکانم هەبووە. زانیاری و شارەزایی پزیشکی زەمینەی بۆ خۆشکرم کە ووردتر سەرنجی شتەکان بدەم و زانیاریی سەبارەت بە جیهان و خەڵکی دەوڵەمەندکردووم. بایەخی راستەقینەی ئەم زانستەو کاریگەری ورەنگدانەوەی لە کارە ئەدەبییەکانمدا تەنیا پزیشک پەی پێدەبات. کاریگەری راستەوخۆی زانستی پزیشکی و رەنگدانەوەی لە بەرهەمەکانمدا هێندە گەورە بووە کە لە زۆر هەڵەی پاراستووم. ئاشنایەتیم دەگەڵ زانستە سروشتییەکان و رێبازی زانستیدا وای لێکردم هەرگیز لە مەنتیق لانەدەم.

هێندەی بۆم کرابێ و دەسەلاتم پێدا شکابێ هەوڵمداوە دەستورو بنەمای زانستی رەچاو بکەم. هەر کاتێک پێ حەسیابم دەرەقەتی پەیرەوکردنی رێبازی زانستی نەهاتووم، خۆم لەو بابەتە نووسینە بواردووە.

پێویستە ئەمەش بلێم کە داهێنانی هونەری هەمیشە یان هەموو کاتێک لەگەڵ رێبازو دەستوری زانستیدا ناگونجێت. بۆ وێنە مەحاڵە لە سەر شانۆ. مردنی کەسێکی ژەهر خواردوو وەکو چۆن لە واقیعدا روو دەدات، نیشانبدرێ. بەلام دەکرێ بەزەبری رەچاوکردنی رێبازی زانستی، ئەو دیمەنە لە واقیع نزیک بخرێتەوە؛ بە

جۆریّ خـوێنەر یان بینەر لەو کـاتەدا کـە سوور دەزانیّ ئەو دیمەنە واقـیعی نیـیـەو دەستکردە، ئەوەی بۆ دەربکەویّ کە مامەڵە لەگەڵ نووسەرێکی شارەزادا دەکات. من بابایەکی ئەفسانە نووسی خەیاڵ پلاو و خـەیاڵبازنیم کە لەبەردەم زانسـتە کاندا ڕێبـازێکی سـەلبی بگرمـە بەرو نکوڵی لە زانسـتـەکـان بکەم. هەروەها لەو نووسـەرانەش نیم کـە بەپیّ خـاوسی بەناودەکـەون و لە مـەنجـەڵی هەمـوو بابەتیکا ئەسکوێن» .

خوێنەری هێژا ئەوە چیخوف بوو، ئێستـاش با لەوەی پتر لە سەری نەڕۆین و با چیرۆکەکانی ئەم کۆمەڵەیە بە خۆیان بێنە قسان و بۆ خۆتان یەکتر بخوێننەوەو یەکتر کەشفبکەن.

**حەمە کەریم عارف**

**سەرچاوە :**

**دشمنان**

**آنتون چیخوف**

**ترجمه سیمین دانشور**

**چاپ ششم:١٣٦١**

# دژمنان

دکتۆر کریلوف، پزیشکی دەوڵەتی بوو، تاقە کورێکی شەش ساڵانی هەبوو نێوی ئاندرێ بوو، نزیکەی سەعات دەی تاریکە شەوێکی مانگی نۆ ئەم تاقانەیەی بە نەخۆشی ملە خڕە مرد. رێک لەو دەمەدا کە ژنەکەی دکتۆر لە بەردەم قەرەوێڵەی کوڕە مردووەکە یا بە چۆکا هات و یەکە مین شالاوی نا ئومێدی بڕ ستی لێ بڕی، لەزەنگی دەرگاکەیان درا، دەنگی زەنگەکە لە هۆڵەکەدا دەنگی دایەوە.

ماڵی دکتۆر هەر کەزانیان ملەخڕە لە ماڵیاندا پەیدا بوو، بۆ بەیانی هەموو نۆکەرەکانیان ئیزن دا. کریلوف خۆی چووە بەر دەرگا. لە ماڵەوە چۆن بوو واهی چووە بەر دەرگا. کراسێک وئێلەکێکی لە بەر بوو، نە دوگمەی ئێلەکەکەی داخست ونە دەست ودەموچاوی ووشک کردەوە. ئەسفەنیک دەستی سوتاندبوو. دالانەکە تاریک بوو. کابرا هاتە ژوورەوە، نەدە ناسرایەوە، هەر ئەوەندە دیاربوو کە میانە بالا، مل پێچێکی سپی لە مل و رەنگی پەڕی بوو. هێند رەنگی سپی ببوو کە وە ژوور کەوت لە تۆ وایە دالانەکەی روناک کردەوە. کابرای میوان زمانی تێک ئالا بوو، بە هەزار حاڵ تا پرسی: «جەنابی دکتۆر لە ماڵێ یە؟»

کریلوف گۆتی: «بەڵێ لە ماڵم، چیت گەرەکە؟»

کابرای میوان گەشایەوە وگۆتی: «تۆ جەنابی دکتۆری ؟ زۆر خۆشحاڵم.» لەتاریکی یەکەدا دستی بۆ دەستی دکتۆر گێڕا، هەرکە دەستی دکتۆری بەردەستان کەوت بەتوندی گوشی وگۆتی: « زۆر زۆر خۆشحاڵم، جارێکی دیکەش بەخزمەتت گەییوم، ئەگەر بیرت ما بێ من «ئەبوگین»م ناوە. ئەم هاوینە لە ماڵی«گنوشیف» بەخزمەتت گەیشتم. زۆر خۆشحاڵم کەوای لەماڵ. مەعز بۆ رەزای خوا، دەست نەنەی بەروومەوە و بڵێ ی بەم درەنگە شەوە لە گەڵت نایەم. ژنەکەم لە پڕ لەزریکەی داو



کەوت، حاڵی خراپە. عەرەبانەشم لەگەڵ خۆ هێناوە...»

کابرای میوان بە قسەو رەفتاریا دیار بوو پەریشان وخەمبارە.دەتگوت لە ئاگرێکی بێ ئامان یا سەگێکی هار ترساوەو بەئاستەم رۆحی پێ ماوە. تەنانەت نەیدەتوانی جلەوی هەناسە بڕگێ یەکەشی بگرێ. بەدەنگی لەرزۆک و لێکدا لێکدا قسەی دەکرد. راستگۆیی وترسێکی منداڵانە لەقسەکانیا دیار بوو، وەکو یەکێک زارەتەرەک بووبێ، بەپچڕ پچڕی وتێکەڵ و پێکەڵی قسەی دەکرد و گەلێ قسەی بێ سەرو بەرو نابەجێ لە زاری دەردەپەڕین. لەسەری رۆیی:«هەرخەمی ئەوەم بوو کەخوا نەخواستە لەماڵ نەبی.بەدرێژایی رێگا دڵم لەمستمابوو،هیزەخێراکە، فریام کەوە جلەکانت لەبەر کەو بابڕۆین. ئێوارە «پاپچینسکی» هاتە میوانیم، پاشان ئەلکساند زیمیوفچیش هات، هەڵبەتە دەیانناسیت.

دانیشتبوین بۆ خۆ قسانمان دەکرد، پاشان هەستاین بۆ چا خواردنەوە، ژنەکەم هاواری لێ هەستا، دەستی بە دڵی یەوە گرت و کەوت بەسەر کورسی یەکەدا، هەڵمان گرت وبردمانە سەر جێگاکەی، نێوچەوانیم بەدەرمان چەورکرد،ئاوی ساردم بەدەمو چاویا پرژاند، ئیدی بوو بەجەنازەو لەوگۆڕە کەوت. دەترسم دلی وەستابێ، خێراکە بابڕۆین، بابیشی بەنەخۆشی دڵ مرد.»کریلوف مات و بێدەنگ گوێ ی کرتبوو. هێند بێ دەنگ بوو دەتگوت تاقە ووشەیەکی روسی نەدەزانی. وەختێ ئەبوگین جارێکی دی نێوی پاپچینسکی هێناو باسی خەزوری کرد وجارێکی دی کەوتە گەڕان بەدووی دەستی دکتۆرا. دکتۆر سەری باداو هاتە قسان، زۆر بەبێ ئارامی و بێ قەراری قسەی دەکرد:« بم بورە. ناتوانم لەگەڵت بێم، چونکە هەمووی پێنج دقیقە نا بێ کەکوڕەکەم مرد.»

ئەبوگین تۆزێ کشایەوە وگوتی: « بەراست؟ خوایەلەم بەختە! چ رۆژێکی شوومە! چ رێکە وتێکە! بەڵێ ئەمەئیرادەی خوایە و گەڕانەوەی نیە!» ئەبوگین دەستی بەکێلونی دەرگاکەوە گرت. سەری داخست و لەفکران ڕاچوو. دیاربوو نەیدەتوانی بەدەستی بەتاڵ بگەڕێتەوە. دوو دڵ بوو کەبڕوا یا هەوڵێکی دیکەش لەگەڵ دکتۆرا بدات. کەوتە سەر دەست و پێ ی کریلوف و بەخەمباری یەوە گۆتی:« دکتۆر من هەست بەوەزعی تۆ دەکەم. خوائاگادارە خۆم بەشەرمەزار دەزانم لەم کاتەدا تەکلیفت لێ بکەم. بەڵام چ بکەم؟ من ناڵێم، تۆ بڵێ روو لەکوێ بکەم؟ جگەلەتۆ چ دکتۆرێکی دی لەم ناوە نی یە. بیکە بەخاتری خوا لەگەڵم وەرە. خۆت دەزانی شتەکە بۆ خۆم نی یە، من نەخۆش نیم...»

هەردوو بێدەنگ بوون. کریلوف پشتی کردە ئەبوگین. تۆزێک وێستاو ئەوجا بەئەسپایی لەدالانەکەوە خۆی بەژووری میواناکرد. وەزعی نائاسایی و رەفتاری ئامێر ئاسابوو.گلۆپێکی کوژاوەی میزان کرد، تەمەشایەکی کتێبێکی ئەستوری وازی سەر مێزێکی کرد.

دکتۆر خۆشی نەیدەزانی بۆ ئەم کارانە دەکا، چونکە لەو دەمەدا نە مەبەستێکی تایبەتی هەبوو نەبیری لە شتێک دەکردەوە. هەر بیریشی نەمابوو کە کابرایەکی غەریب لەبەر دالانەکە وێستاوەو چاوەڕوانی ئەوە. کپی و تاریکی ژوورەکە هێندەی دی خەمبارو بێ تاقەتیان کرد. کە لە ژووری میوانەوە چووە ژووری کارکردنەکەی خۆی، لاقی راستی لەرادە بەدەر قورس بوو. کەوتە لە پەکوتێ بە دووی کیلونی دەرگاکەدا، ئازای لەشی سست و خاوبوو. وەکو یەکێک بەڕێکەوت رێی کەوتبێتە ماڵێکی بێگانە یا بۆ یەکەمجار لەژیانیا مەست بوو بێ، گێژو سەر سام کەوتبووە بەر شەپۆڵی کۆمەڵێ هەست و سۆزی تازەوە. هێڵە روناکی یەک کەوتبووە سەر کتێبەکانی نێو تاقێکی ژووری نووستنەکەی، ئەم روناکی یە لەگەڵ بۆنی ئەسفەنیک و سپرتۆی ژووری نووستنەکە، تێکەڵ ببوو... دکتۆر شەکەت و خەمبار خۆی دا بەکۆڵی کورسییەکی پشت مێزەکەیا. بۆ ساتێ چاوانی گێژو وێژی بڕینە کتێبەکان کە لەبەر روناکی یەکەدا دەدرەوشانەوە. ئەوجا هەستاو چوو بۆ ژووری نوستن، لێرەدا، لە ژووری نووستندا مەرگ باڵی بەسەر هەموو شتێکا کێشا بوو. هەموو شتێک؛ بچووکترین شتی نێو ژووەکە باسی لافاو و تۆفانێکیان دەگێڕایەوە کە تێ پەڕی بوو. مۆمێک لە نێوان کۆمەڵی شووشە و قوتو و گۆزەدا لەسەر تەپڵەکێ دانرا بوو و دەسوتا. چرایەکی گەورەش لەسەر دۆلابێ دانرابوو. مۆم و چراکە تاقە روناکی ژوورەکە بوون.

کورەکەیان لەسەر قەرەوێڵەیەکی نزیکی پەنجەرەکە رەق راکشا بوو.

چاوانی ئەبلەق ببوون و ماکی سەر سامی یەک بەچارەیەوە دیاربوو. جولەی نەدەکرد، پێ دەچوو چاوە ئەبلەقکانی سات بەسات تاریک و تا ریکتر بێن وزیاتر بەقولا بچن. دایکی دەستی خستبووە سەر لەشی کورەکەی و دەمو و چاوی لە چەرچەفەکانا نقوم کردبوو و بەرانبەر قەرەوێڵەکەی چۆکی دادابوو. ئەویش وەکو کوڕەکەی بێ جۆڵە بوو. بەڵام ئازای بەدەنی وەکو بێ نێو ئاو دەلەرزی! بە هەموو هێزو توانای باوەشی بە قەڕەوێلەکەدا کرد، دەتگوت لەوە دەترسێت ئەو ئارامی یەی باڵی بە سەرخۆی و هەموو شتێکا کێشاوە بشێوێ و سەر لەنوێ بوروژێتەوە.



پەتۆکان، چەرچەفەکان، قاپ و ئامانەکان، ئەو دڵۆپە ئاوانەی سەر عاردەکە، ئەو فلچە و مراکانەی لێرەو لەوێ کەوتبوون، شووشەیەک دەرمانی سپی، هەوای ناخۆشی ژوورەکە هەر هەموو بێ گیان و مات و مردوو دەهاتنە بەرچاو. دکتۆر کە چاوی بە ژنەکەی کەوت هەڵوەستەیەکی کرد. دەستەکانی لە نێو گیرفانی پانتۆڵەکەیدا گرمۆڵە کردن. سەری دانەواند و سەیرێکی کوڕەکەی کرد. چ شتێک لە سیمایدا بەدی نەدەکرا، تەنیا ئەو فرمێسکانەی سەر ڕدێنی نەبێ کە ئەوەیان نیشان دەدا کە تازە گریاوە.

ئەو ترسەی کە لەکاتی باسکردنی مەرگا بەخەیاڵماندا دێ لەو ژووری نووستنەدا نەبوو. بێدەنگی و کپی ژوورەکە، وەزعی دایکەکە، سیمای باوکەکە، هەر هەموو سامێکی تایبەتیان دەخستە دڵ. ناسکی و حەساسی غەمێکی مرۆڤانەی لە وەسف نەهاتووی ئەوتۆ لە ئارادا بوو کە مەگەر تەنیا موسیقا دەرەقەتی وەسف کردنی بێ. کپی وبێدەنگی یەکی یەکجار ناسک و سەیر هەست پێدەکرا. کریلوف و ژنەکەی هێدی و ئارام بوون، نە دەگریان، وەک بلێ ی ئەوانیش ئیعترافیان بە وەزع وحاڵی شاعیرانەی خۆ دەکرد. چونکە هەردووکیان چوو بوونە ساڵەوە، ئومێدی ئەوەیان نەمابوو منداڵی دیکەیان ببێ.

دکتۆر چل وچوار ساڵە، موی سپی بووە و لە تەمەنی راستی خۆی پتر دەنوێنێ. ژنە جەرگ سوتاوەکەشی هەرچەندە تەمەنی سی و پێنج ساڵە، بەڵام تەواو ژاکاوەو تێک چووە. ئاندرێ نەک هەر تاقانەیان بوو بەڵکو دوا منداڵیشیان بوو.

دکتۆر، بەپێچەوانەی ژنەکەیەوە لەو بابەتە مرۆڤانە بوو کە لەکاتی پەستی وغەمباری و سەغڵەتی دا حەز بەجولان دەکەن. ٥ دەقەقەیەک بەدیار ژنەکەیەوە وێستاو ئەوجا لەژووری نووستن وەدەرکەوت. لاقی راستی تەواو بەرزکردەوە، خۆی بەژوورێکی چکۆلەدا کرد کە تاکە قەنەفەیەک ی گەورە نیوەی پڕ کردبۆوە. لەوێوە خۆی بەمویەقەکەدا کرد. بەدەوری وەجاخەکەدا سوڕایەوە. دانەوی یەوەو لە دەرکەیەکی بچووکەوە هاتە بەر دالانەکە دیسان زەلامێکی مل پێچ لە مل و رەنگ پەڕیوی لێ بەدیار کەوت. ئەبوگین هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «هاتیت» کیلۆنی دەرگاکەی گرت و گوتی! «فەموو با بڕۆین.» دکتۆر کەوتە لەرزین، لێی راما و گوتی.

– ئەدی پێم نەگوتی ناتوانم بێم؟ چ کابرایەکی سەیری!

– دکتۆر، ئاخر منیش بە شەرم. وەنەبێ بە وەزعی تۆ نەزانم، باوربکە پڕ بەدڵ

هاوبەشی خەمتم.» ئەبوگێن دەستی خستبووە سەر مل پێچەکەی و بەدەم تکاو رجاوە دەیگوت: «خۆ من بۆ خۆمم ناوێ ی. رجات لێدەکەم ژنەکەم خەریکە دەمرێ. ئەگەر گوێت لە ناڵەو هاواری دەبوو، ئەگەر رەنگو رویت دەبینی ئەوسا نەهەقت نە دەگرتم! سەیری من کە، وامزانی چوویت خۆت بگۆڕی! دکتۆر رجات لێدەکەم، مەعز بۆ رەزای خوا، پیاوی چا بە تا درەنگ نەبووە بابڕۆین.»

کریلوف ماوەیەک بێدەنگ بوو، ئەوجا گوتی: «ناتوانم لەگەڵت بێم» و خۆی بەژووری میواندا کرد. ئەبوگێن دووی کەوت، قۆڵی گرت و گوتی:

– دەزانم تۆش خەمباری و نەهەقت نی یە. بەڵام من بۆ کارێکی سوکەڵە بەدووتدا نەهاتووم، بۆ ئەوە نەهاتووم ددانێ چارەسەربکەی یا گەوا هێنامەیەکی پزیشککگەریم بۆ بنووسیت. هاتووم کە ژیانی مرۆڤێک رزگار بکەی.» عەینی گەدایان دەپاڕێمەوە: «ژیانی مرۆڤێک کەم نی یە، لە هەموو غەمێکی شەخسی گەورەترە. تکات لێدەکەم هیمەتێ بکە، بەناوی مرۆڤایەتی یەوە تکات لێدەکەم.

کریلوف بە دڵتەنگی یەوە گوتی: «ئاخر مرۆڤایەتی دوو سەرەیە، بە ناوی هەمان مرۆڤایەتی یەوە تکات لێدەکەم کە لەگەڵ خۆتم مەبە. خوایە، تووشی چ بووم! من بە تۆبزی خۆ بەپێوە دەگرم وتۆش مرۆڤایەتیم بەگژا دەکەی. باوەڕ بکە بێشم هیچم پێ ناکرێ. بەکەڵکی چ نایەم. ،ئاخر چۆن ژنەکەم بەتەنێ بەجێ بێڵێم؟ نا ،نا...»

کریلوف دەستی هەڵتەکاند. پشتی کردەوە ئەبوگێن، لەسەری رۆ یی: و... لە من گەرەک نی یە، بەداخەوەم. .. بەپێی قانونی مەدەنی، بەرگی سیازدە مەجبورم بێم و تۆش هەقی خۆتە پشتی ملم بگری و بەزۆر لەگەڵ خۆتم بەری، قەیدی نی یە بم کوژە ،بەڵام منناتوانم. تەنانەت ناتوانم قسان بکەم، ببورە.» ئەبوگێن دیسان دەستەو دامێنی کەوتەوە و گوتی:» خوا هەڵناگرێ بەم جۆرە وەڵامم بدەیەوە دوای قانونی مەدەنی و بەرگی سیازدە ببرێتەوە.من هەقیئەوەم نی یە کەبەتۆبزی لەگە خۆمت بەرم.ئەگەر دێی وەرە، نایەی هەواڵە بەخوا بی. بەڵام من چ زۆرێکم نی یە. رجات لێدەکەم. ژنێکی گەنج خەریکە دەمرێ. تۆخوت دەڵێ ی تازەکورەکەت مردووە، جا تۆیەک بەو هەموو خەمەوە لەخەم و ترسی من نەگەی کێ لێم تێ بگا؟

دەنگی ئەبوگێن لەداخاو لەخەفەتا دەلەرزی. ئاوازی قسەکانی گەلێ لە خودی قسەکان کاریگەرتر بوو. ئەبوگێن یەگجار بەخەمەوەبوو.

بەڵام ووشەکانی قەبەوقەڵەوو بێ گیانو دەستکرد دەهاتنە بەرچاو. بەخۆیشی هەستی بەمەدەکرد جا بۆ ئەوەی دڵی دکتۆر نەرەنجێ هەوڵی دەدا ئەگەر بەووشە



دکتۆری بۆ نەیەتە رەدا ئەوا بە رەفتارو کروزانەوە لەوەتەری سۆزی بداو قەناعەتی پی بکا. بەشێوەیەکی گشتی ووشە هەرچەند جوان و ناسک بێ تەنیا کار لەکەسانی بێ خەم دەکەن. ووشە هەمیشە ئەوتواناو دەسەڵاتەی نی یە کەخەڵکانی زۆر شاد یا زۆر خەمبار رازی بکا، چونکە باشترین دەربڕی خۆشحالی زۆر و غەمی زۆر بێدەنگی یە. ئاشقان لەبێدەنگی دا باشتر لەزمانی یەکدی حاڵی دەبن. وەعزدانێکی گەرم و گوڕی سەرکۆڕی مردوویەک تەنیا کار لەبێگانان دەکا. ژن ومنداڵی ئەومردووە، ئەو وەعزە گەرم و گوڕەیانبەلاوە سادرو هیچە، کریلوف مات و بێدەنگ و ێستابوو کەئەبوگێن پتر لەسەر پیرۆزی و فیداکاری پیشەی دکتۆران رۆیی. دگتۆر گوتی: زۆر دوورە؟

– هەرسەعاتە رێ یەکە. ئەسپەکانم ئەسپی چاکن، دکتۆر وەعدی شەرفت دەدەمێ کەبەسەعاتێ بت بەم و بت هێنمەوە.

ئەم قسانەی دوایی گەلێ زیاتر لە چەمکی «مرۆڤایەتی» و«پیشەی پیرۆزی دکتۆران» کاری لە دکتۆر کرد. تۆزێ راماو ئاهێکی هەڵکێشا :«چاکە، بڕۆ با بڕۆین!»

بەپەلە رۆی. بەدوودڵی یەوە خۆی بەژووری کارەکەید کردو خێرا بەپاڵتۆیەکی دەڵبەوە گەڕایەوە. ئەبوگێن گەشایەوە، کەوتە مەرایی دکتۆر، یارمەتی داتا پاڵتوکەی لەبەرکردو ئەوچا بە دووقۆڵی لەماڵ وە دەرکەوتن. دنیا تاریک بوو. بەڵام هێشتاش لەدالانەکەی ماڵی دکتۆر روناکتر بوو. لەتاریکی یەکەدا بالای بەرزو کەمێ کوڕی دکتۆر، ردێنەتەنک و دێژەکەی، کەپوە بەرانی یەکەی بەئاشکرا دیاربوو. لەتەنیشت دکتۆرەوە، دەمو چاوی پان و بێ رەنگی ئەبوگێن کلأوە بچوکەکەی کەبە هەزار حاڵ کەللەی داپۆشی بوو دەبینرا. ملپێچەکەیهەر لەپێشەوە سپی دەچۆوە، لەپشتەوە وەبن قژە درێژەکەی کەوتبوو. ئەبوگێن لەودەمەدا کەیارمەتی دکتۆری دەدا تاسەرکەوێ و لەنێو عەرەبانەکەدا جێگیر ببێ. بەئەسپای گوتی :« باوەڕبکە هەست بەخەمی تۆ دەکەم.»وبەعەرەبانچی یەکەی گوت:« باژۆ لیوک ی ئازیز باژۆ، تادەتوانی خێرا باژۆ.»

عەرەبانچیەکە بەپەلە وەرێ کەوت، یەکەمجار گەیشتنە ئاستی ریزە خانوو یەکی رووت. ئەم خانووانە لە دەوری حەوشەی خەستەخانەیەک گیرسابوونەوە. هەموو لایەک هەرتاریک بوو، تەنیا لەو سەری حەوشەکە نەبێ کە ڕوناکی یەک لە پەنجەرەی ژوورێکە وە دەبریسکایەوەو پەرژینی باخێکی روناک کرد بووە.سێ

پەنجەرەی نهۆمی سەرێ ی خانویەکی تەنیا لە تاریکی یەکەدا بێ رەونەقتر دەیاننواند، ئەوجا عەرەبانەکە کەوتە نێو تاریکی یەکی ئەنگوستەچاوەوە. تەنیا خشەخشی گەڵای درەختان و بۆنی کارگ دەهات. دەنگی پێچکەی عەرەبانەکە. تەیرو توی خەبەر کردەوە و لەنێو لق و پۆپی درەختەکانەوە جم و جوڵ و فریادی خەمناک. وەک بڵێ ی دەیانزانی کوڕەکەی دکتۆر مردووەو ژنەکەی ئەبوگین زۆر نەخۆشە. لەچڕە دارستانەکەرەت بوون،تاک و تەرا لێرەو لەوێ درەختان دەکەوتنە بەرچاو، پاشان تاقە دەوەنێک پەیدا بوو. حەوزەئاوێک بەحاڵ دەدرەوشایەوەو سێبەری گەورە لەباوەشی دا مت ببوون. ئێستا عەرەبانەکە بە پێ دەشتێکی تەخت و هەمواردا دادەکشا. دەنگی تەیروتو زۆر لە دوور دەهات. بەڵام هەر زوو هەموو شتێک کپ و خامۆش بوو. کریلوف و ئەبوگین بە درێژایی رێگە بێدەنگ بوون. تاقە

جارێک ئەبوگین ئاهێکی قوڵی هەڵکێشاو لەبن لێوەوە گوتی: «کەدەردێکی گرانە، بنیادەم هیچکاتێ کەسوکاری بەقەدکاتی خەتەری لەدەست دانیان خۆش ناوێ.»

کاتێ عەرەبانەکە بەهێواشی لە چۆمێک دەپەڕی یەوە. کریلوف لە پڕ راپەری وترسی لێ نیشت. وەک بڵێ ی لە داکشانی ئاوەکە ترسا. بەخەم وکەسەرەوە گوتی: «ئا رێم بکەن با بچم یە کێک بنێرمە کن ژنەکەم، فەقیرە بەتەنیایە. پاشان دێمەوە خزمەتتان.»

ئەبوگین بێدەنگ بوو. عەرەبانەکە بە لەقەلەق بە سەر بەردەکاندا رەت دەبوو، لە کەنارێکی قومەڵان رەت بوو وکەوتە رێ. کریلوف ئالکاوی کول وکەسەری خۆی بوو، بەدەم خەم وخەفەتەوە دەیروانی یە دەور وبەر کۆتایی جادەکە لەبەر تیشکی کزی ستێرەکاندا نەدەبینرا. درەختی بی لەکەنارەکەدا ریزیان بەستبوو وغەرقی تاریکی بوون. پێ دەشتەکەی دەستی ڕۆژهەلات. بێ هەوراز ونشێو، تەخت وساف وەکو ئاسمان بێ کوتاییبوو.جارجارێ لێرەو لەوێ لەدووررا روناکی یەک بەرز دەبووە. پێدەچوو لە کێلگەو پەرێزەکاندا ئاگر بکەنەوە. بەدەستی ڕۆژئاواداو شان بە شانی جادەکە گردۆلکەیەکی بچووک قوت ببووەو بنچک ودەوەن بە سەری یەوە مت ببوون. مانگ سوورو گەورە وبێ جوڵە لە ئاستی گرذۆلکەکە بە ئاسمانەوە وێستابوو. لەتۆ وایە ئێشکی دەگرن تا نەوەک لە پڕ ئاوابێ ولەدەست بچێ! سروشت وهەموو دیمەنەکانی ساردو سڕ وخاڵی لە ئومێد دەهاتە بەرچاو. زەوی وەکو چۆن ژنێکی زیز لە ژوورێکی تاریک ونوتەکدا بەتەنێ دادەنیشێت وهەوڵ دەدا یادی



رابردوو نەکاتەوە، غەمبارو کەسەرداربوو. دەستی لە بەهارو هاوین شوردبوو بەناچاری چاوەنۆڕی زستان بوو. تا چاو هەتەریدەکرد سروشت تاریک وسارد سڕو پڕ کەندوکلۆ دەهاتە بەر چاو. کریلوف وئەبوگین مانگی سور هەلگەڕاو وئەم هەموو شتەیان نەدەبینی ونەیان دەتوانی خۆی لێ ببوێرن.

تا عەرەبانەکە نزیکتر دەبۆوە، ئەبوگین بێ قەرار تر دەبوو. هەڵدەستایە سەر پێیان، لە پشت عەرەبانچی یەکەوە دەیروانی یە پێشی. ئەنجام عەرەبانەکە گەییە بەر قالدرمەیەک کە کەپرێکی بەسەرەوە قوت کرابۆوە. ئەبوگین روانی یە پەنجەرە روناکەکانی نهۆمی ژێرەوە. بەئاشکرا دەنگی هەناسەدانی دەبیسترا.

لەگەڵ دکتۆرا وە ژوورکەوتن، بەغەمباریەوە دەستەکانی پێکدا ماڵێن وگوتی: «ئەگەر شتێ روو بدا دەمرم. ..» گوێ ی بۆ کپی وبێدەنگی ماڵەکە هەڵخست وئەوجا لەسەری رۆی: «چ دەنگێ ناژنەوم، یەعنی ساغ وسەلیمە؟!..» نەدەنگێ نەسرتەیە لە دالانەکەوە نەدەهات. هەرچەند چراکان روناک بوون بەڵام پێ دەچوو هەموو ماڵەکە لەغورا بی خەودا بێ. ئێستا دکتۆر وئەبوگین لەبەر روناکی یەکە یەکدییان بە جوانی دەبینی. دکتۆر زەلامێکی بالا بەرزی نەختێ کۆم بوو. بەخۆی سادە وجل وبەرگەکەی سادەتربوو. لێو ئەستور، قۆلنگەکەپو، دەموچاو ژاکاو، نیگا سارد، بەگشتی پیاوێکی بێباک وبێ منەت بوو. قژی تەنکی، چرچی ولۆچی دەموچاوی، ردێنە تەنکە زوو سپی بووەکەی، رووی گرژو مۆنی، ساردو سڕی لەگەل خەڵکی دا سەر سەختی یەکەی وهەر هەموو ئەمانە رۆژانی تاڵی رابردوو، چارەنووسی پڕ جەوروجەفاو مەشەقەتی ژیان ورەنج بێوەری مرۆڤی بیری بنیادەم دەخستەوە. گەر تەماشایەکی هەیکەل وکەلەشیت کردبا باوەڕت نەدەکرد کە ئەم پیاوە ژنی هەبێ وتوانی بێتی بەدیار جەنازەی منالەکەیەوە گریابێ. بەڵام ئەبوگین جیاواز بوو، توندو تۆڵ وتوکمە بوو، قژی زەردو، کەللەزل بوو، دەموچاوی هەرچەند پان وگەورە بوو بەڵام ناسکی یەکی تایبەتی هەبوو. جلەکانی هەڵبژاردەو لەسەر دوا مۆد بوو. بەجل وبەرگەکەیدا دیاربوو کە دارا ودەوڵەمەندە. کە رێ ی دەکرد سەری قیت دەگرت وسینگی دەردەپەڕاند. دەم ولەبزی شیرین بوو.کە مل پێچەکەی دا دەکەند یاقژی رێک دەخست ناسکی یەکی ژنانە لە رەفتاریدا بە دی دەکرا. هەرچەندە بەدەم دا کەندنی پالتۆکەیەوە بەترسێکی منداڵانەوە دەیڕوانی یە قالدرمەکە. بەڵام ئەم ترسەش نەیدەتوانی بیگۆڕێ. یا خۆ پەسەندی یەکەی وەشێرێ ولە شەوق وزەوقی بخا. لەودەمەدا کە بەقالدرمەکەدا سەر کەوت گوتی: « کەس

دیار نی یە، چ دەنگییَ نایێ. خوایە خۆت رەحم بکەی.»

دکتۆری لە رارەوەکەوە برد بۆ هۆڵێکی گەورە. پیانۆیەکی گەورە لە سوچێکی هۆڵەکە دانرابوو، چرایەک هەڵواسرابوو. لەوێوە چوونە ژوورێکی بچکۆلەی جوان؛ژووری دانیشتن بوو، زۆر خۆش ودڵگیر بوو. روناکی یەکی خۆشی ئامال سوور رۆشنی کردبۆوە. ئەبوگین گوتی:« جەنابت لێرە دانیشە با خەبەریان بدەمێ وهەر ئێستا دێمەوە خزمەتت.» کریلوف بەتەنێ مایەوە. نەجوانی ورازاوەیی هولەکە ونەئەم ماڵە غەریب وبێگانەیە شتاقیان کاریان تێ نەکرد. لە سەر کورسییەک رۆنیشت وروانی یە دەستەبە سپیرتۆ سوتاوەکانی. نیو نیگایەکی گلۆپە سورباوەکەی جانتای چەلۆکەی کرد، وئەوجا کەوتە هەڵڕوانین بە دیوارەکانی ژوورەکەدا تابزانێ سەعاتەکە لەکوێ یە، لە پڕ نیگای لەسەر گورگێکی بە کائاخنراو گیرسایەوە کە وەکو ئەبوگین لەخۆرازی و خۆ پەسەند بوو.

هەموو شتێک کپ و ئارام بوو... لەشوێنیکی یەکجار دوورەوە، لەیەکێک لەژوورەکانەوە کەسێک بەدەنگی بەرز ئاهێکی هەڵکێشا.

دەرگایەکی شووشە چرکەیەکی لێوە هات و ئیدی هەموو شتێک کپ و بێدەنگ بوو. ٥ دەقە رەت بوو. کریلوف ئیدی نەیدەڕوانی یە دەستی خۆی، چاوی بڕی یە ئەو دەرکەیەی کە ئەبوگین لێوەی رۆیی بوو.

ئەبوگین لەبەر دەرگا وێستا بوو. ئەبوگینەکەی جاران نەبوو. وەکو کەو چوو بوو و خۆ پەسەندییەکەی نەما بوو دەموچاو و دەستی، وەزع و حاڵی تەواو گۆڕا بوون، ئیدی یا لەترسا بوو یا لەتاو ئازارێکی بەدەنی بوو. کەپوی، لێوی، سمێلی و سیمای دەلەرزین، بەڵام چاوەکانی بریسکەی ئازارێکی سەیریان دەدا.

ئەبوگین بە هەنگاوی قورس و هەڕاوەوە خۆی گەیاندە ناوەندی ژوورەکە! کووڕ بۆوە، ناڵاندی و دەستی هەڵتەکاند.

هاواری کرد: «فریودرام!» ئەو تا هێزی تێدابوو و دانی بە ووشەی ئەودا نا: «ئەو دێڵە فریوی داوم، رۆییشتوە، بەدرۆ خۆی نەخۆش خست و دەستی بەمنەوە نا تا رەدووی ئەم کەر پیاوە «پاپچینسکی» بکەوێ! ئەی هاوار! هاوار لە خۆم!»

بەسستی بەرەو لای دکتۆر چوو. دەستە سپی و نەرمەکانی گرت بەدەمووچاوی یەوە. بەدەم داخ و خەفەتەوە لەسەری رۆیی: «رۆیشتووە، فریوی داوم، ئاخر ئەم درۆ گەورەیە بۆ؟ ئەی خوای گەورە، ئاخر من چم لێکردووە؟ رەدوو کەوتووە!» فرمێسک وەکو باران لە چاوانی دەباری. گەڕایەوە، کەوتە هاتووچۆ بەژووەکەدا. ئەبوگین بە



چاکەتەکوڵ و پانتۆڵە تەسکەکەیەوە کە مۆدی رۆژ بوو، لاقی لەچاو بەدەنیا یەکجار باریک دەهاتە بەرچاو، بەو قەدو قەڵافاتەوە لەشێر دەچوو. دکتۆر لە پڕ پەلە پەلی پێ کەوت، هەستایە سەر پێ، روو بەرووی ئەبوگین وێستا و گوتی: «باشە نەخۆشەکە کوا؟» ئەبوگین هاواری کرد، قاقا پێکەنی، هون هون گریا، دەستی هەڵتەکاند: «نەخۆشەکە؟ نەخۆشەکە؟ نەخۆشی چی! مەلعونە، ناچیزەیە، نا ئینسانە، شەیتانیش پەی بەم فەندە نە دەبرد: دەستی بەمنەوە نا تا بۆ خۆی رەدووی کەر پیاوێک بکەوێ رەدووی قەشمەرێ، لۆتی یە، چەکلێک بکەوێ! خوایە چم بەسەر هات، خۆزی مردبا، قەت ئەمەم پێ قبوڵ ناکرێ، نە بەخوا قبوڵ ناکرێ.»

دکتۆر رەق راوەستا. چاوی پڕ بوو لە ئەشک. ڕدێنە تەنک و چەناگە باریکەکەی کەوتنە لەرزین. بەسەرنجەوە روانی یە دەورو بەری خۆی و گوتی: «ئەم گاڵتە بازاڕە چی یە؟ مناڵەکەم مردووە، ژنەکەم بەو هەموو کوڵ و کەسەرەوە بەتەنێ لەماڵەوە بەجێ هێشتووە، خۆم لەسەر پێیان ناگرم، سێ دانە شەوە خەو نەچۆتە چاوانم.... و لەوێندەرەوە منی هێناوە تا لەم کۆمیدیا بازاڕی یەدا دەورم پێ ببینێ... من لە مەتێ ناگەم، نەخێر سەر لەمە دەرناکەم!» ئەبوگین یەکێک لەکۆڵەمستەکانی کردەوە، کاغەزێکی چرچ و لۆچ کەوتە سەر زەوی، تا توانی پێ ی پێدانا، دەتگوت پێ بەژەنگە سورەیەکدا دەنێ، بەرقەوە گوتی: «سەیری منی نەفام بکە، چاوم کوێر ببوایە» دەستی گرت بەسەرییەوە. دەتگوت فەلاحێکەو تەبارە گەنمەکەیان پێ شێل کردووە، لەسەری رۆیی: «نەمدەزانی بۆ هەموو رۆژێ سەرمان دەدا، نەمزانی بۆ ئەمرۆ بەگالیسکە هاتبوو؟

تۆ سەیری گیلی منکە! بەستەزمانی دڵپاک!»

دکتۆر کەوتە پرتە وبۆڵە: «من تێ ناگەم، سەرم لەم شتە دەرناچێت، ئەم فێڵ و تەڵەکەبازی یە یانی چی؛ یانی دەست خەڕۆ کردنی خەڵکی، یانی گاڵتە کردن بەدەردو ئازاری خەڵکی.

مەحاڵە... من لە ژیانما شتی وام نەدیوە!».

دکتۆر گێژو وێژو سەرسام. سەرسام وەکو یەکێک لە پڕ هەست بکا کە زاڵمانە پێیان رابواردووە. شانەکانی هەڵتەکاند، دەستی بەیەکدا ماڵین. نەیدەزانی چ بڵێ و چ بکا. نیوەگیان خۆی دا بە کۆڵی کورسییەکدا.

ئەبوگین بە چاوانی پڕ فرمێسکەوە قسەی دەکرد: «ئێستا باشە، باش، ئەوا منی خۆش نەدەویست. دڵی بەپیاوێکی دیکەوە بوو. هەموو ئەمانە بەجێ ی خۆی، بەڵام

ئەم فرِوفێڵە بۆ؟ ئەم ڕیسواییە بۆ؟ ئاخر بۆ؟ لەپای چی؟ ئاخر من چ خراپەیەکم لەگەڵ کردبووی؟» لە کریلوف نزیک بووەوە بەگەرمی گوتی:

«جەنابی دکتۆر گوێت لەبرای خۆت بێ، تۆ بێ ئەوەی بتەوێ تازە بوویت بە شایەتی ئەم کۆستەی من، منیش نامەوێ چ شتێکت لێ وەشێرم. باوەڕ بکە ئەم پڕ چ براوەم خۆش دەویست، بەدڵ و بەگیان ئاشقی بووم. هەموو شتێکم کرد بە قوربانی ئەو.

لەگەڵ کەسوکارم دا تێک چووم، دەست بەرداری کارەکەم بووم و وازم لە موسیقا هێنا. لەشتی وادا چاوپۆشیم لێکردووە کە لە دایک و خوشکی خۆمم نەکردووە. هەرگیز لێ ی توڕە نەبووم، قەت لە گوڵ کاڵترم پێ نەگوتووە، ئاخر ئەم فێڵە بۆ؟ ئاخر ئەگەر دڵت بەمنەوە نەماوە دڵت لە جێ یەکی دی یە، ئەوا ڕێک و ڕەوان بیڵێ و تەواو. بەتایبەتی بەخۆت دەتزانی کە من لێت تێ دەگەم...»

ئەبوگێن بەدەم فرمێسک هەڵڕشتنەوە هەموو نهێنی یەکی خۆی بۆ دکتۆر هەڵڕشت. بەگەرمی قسەی دەکردو بەهەردووک دەستان دڵی دەگوشی. بێ سڵ کردنەوە هەموو نهێنی یەکی خێزانداری خۆی هەڵڕشت. پێ دەچوو خۆشحاڵ بێ بەمەی کە ئەم رازانە لە دڵی وەدەرنێ. ئەگەر سەعاتێ- دووان بەو شێوەیە قسەی کردبا و داخی دڵی خۆی هەڵڕشتبا بێگومان دڵی هێورتر دەبوو.

کێ دەڵێ گەر دکتۆر گوێی بۆ گرتباو دڵی داباوە، ئەبوکین شێتگیر نەدەبوو و کارێکی گەوجانەی نەدەکرد؟ بەڵام بەپێچەوانەوە وەختێ ئەبوگێن قسەی دەکرد دکتۆر تەواو گۆڕا، توڕەیی نیشتە سەر سیمای، چارەی غەمبارتر و توڕەتر بوو. کە ئەبوگێن وێنەی ژنەکەی خستەبەر دەستی دکتۆر و- ژنەکەی جوان و ئێسک سووک بوو، بەڵام عەینی دنیا تەرک کردووان ووشک و بێ دەماغ بوو- لێ ی پاڕایەوە کە سەیری ئەو وێنەیە بکاو بڵێ کە ئایا دەشێت خاوەنی دەموچاوێکی ئاوا درۆیەکی ئاوارێک بخا، دکتۆر لەپڕ وەکو یەکێک حاڵی لێ بێ، ئاگر لە چاوانی بێتەوە، هەستایە سەرپێ و گوتی: «لەگەڵ منتە؟ من نامەوێ گوێ بگرم! نا!» هاواری بەسەریا کردو بەتوندی دەستی بە سەر مێزەکەدا کێشا: «من نامەوێ بە نهێنی هیچ وبێ مەعنای ئێوە بزانم. نەفرەت لە خۆتان ونهێنیتان.. ئاخر تۆ بە چ ڕوویەکەوە ئەم قسە قۆڕانە بۆ من دەکەی! یا لات وایە هێشتا تەواو پێت ڕانەبواردووم؟ چما من گاڵتە چی جەنابتم ها؟»

ئەبوگێن، پاشەو پاش کشایەوە و بەسەر سامی ڕوانی یە کریلوف. دکتۆر بەدەم



ریشە لەرزێوە لەسەری ڕۆیی: «بۆ چی منت بۆ ئیرە هێنا؟ تۆی بێ غیرەت بەملی شکاوت ژن دێنی، تۆی نامەرد بە ئەستۆی ووردت توڕە دەبی و دەیکەی بەم هەرایە، پیم ناڵێ ی من چمە لەم سەریەشەیە؟ داستانی ئاشقێنی ئێوە چ پێوەندییەکی بەمنەوەیە؟ واز لەمن بێنە و هەڕە بەردەوام بە لەسەر دزی ئابڕومەندانەی خۆتو تا دەتوانی دەم لەبیرو باوەڕی مرۆڤ دۆستانە بکوتە!»

دکتۆر بەتیلەی چاوروانییە جانتای چەلۆکە وگوتی: «بڕۆ سازو سەنتوری خۆت لێ بدە، وەکو کەڵەشێری خەسیو خۆت پف بدە، نە خەڵەتابی بە پیاوی ماقوڵ رابوێری. ئەگەر رێزی ناگری ئەوا نەخەڵەتابی توخنی بکەوی!»

ئەبوگێن سور بۆوە و گوتی: «ئەم قسانە چی یە؟»

– ئەم قسانە ئەوەیە کە بەخەڵکی رابواردن کارێکی نامەردانەیە.

من بابایەکم دکتۆر. چمالات وایە دکتۆران وکاسبکارانی بەحورمەت کە وەکو ئیوە گەل بەرەڵا نین و بەمۆزە مۆزە دووی ئافرەتان ناکەون، کرێگرتەو شاگردی ئێوەن. لە ئێوە کەمترن. خۆ ئەگەر واش بیر بکەنەوە هەقی ئەوەتان نی یە کە بابایەکی کاسبکار دووچاری ئەم سەریەشەیە بکەن.

ئەبوگێن بەکاوە خۆ پرسی: «بە چ هەقێ ئەم قسانە دەکەی؟. دکتۆر هەمدیس نەڕاندی بەسەریا و بە توندی دەستی کێشا بەمێزەکەدا:

– ئەدی تۆ بە چ هەقێک منت بۆ ئێرە هێنا؟ بۆیەت هێنام تا گوێ لە قسە قۆڕەکانت بگرم. بەخۆت نەتدەزانی لە چ وەزع و حاڵێک دام؟ بە چ هەقێ گاڵتە بەخەم و خەمباری خەڵکی دەکەی؟» ئەبوگێن هاواری کرد: «تۆ شێتی، پیاوێکی کەڵەمە رەقی، من یەکجار غەمگینمو...و...»

دکتۆر بزەیەکی کرد: «غەمگین! نۆ بەتی ئەو قەوانەیە، تۆ و خەم کوجا مەرحەبا، ئەو بەرەڵلایانەش کەدەستیان دەکەوێتە رووخۆ بە بەدبەخت و غەمبار دەزانن، کەڵەشێری نێرە موکیش غەمگینە. لە چەوری و قەڵەوی خۆی بێزارە. هەی گەجەرو گوجەرانی بێ حورمەت!»

ئەبوگێن هاواری کرد: «قوربان تۆ ئاگات لە خۆ براوە، ئەم جوێنانە زەلامیان لەسەر دارکاری دەکرێ، تێ دەگەی؟»

ئەبوگێن دەستی بەگیرفانی بەر باخەڵەکەیا کرد، دەفتەرچەیەکی دەرێنا، دوو پارچە پارەی کاغەزی دەرێناو توڕی هەڵدانە سەمێزەکە. پەڕەی کەپوی دەلەرزی و گوتی: «فەرموو ئەوە پارەکەت، ئەوە هەقی هاتنە کەت!»

دکتۆر، پارەکانی توڕ دایە سەر زەوی یەکەو گوتی: «بە چ روویەکەوە پارەم دەدەیی، ئیهانەکردن بە پارە خۆش نابێتەوە؛ عوزر لە قەباحەت خراتر.» ئەبوگین و دکتۆر بەرانبەریان لێکدی گرت، تا توانیان جنێوی سوکیان بەیەکدی دا، کەسیان لەژیانیانا تەنانەت لەدنیای بێهۆشی وشێتیش دا جنێوی وا سووک و نەهەق و بێ جێیان بەزار دا نەهاتبوو. غەمی هەردووکیان تەواو سەری کردبوو لێو رێژ ببوو. خەڵکانی غەمگین، خۆ پەرست و نارەسەن و بێ ویژدانن ولە شێت شێتترن و چەند شێتان لێکدی حاڵی دەبن ئەوانیش هەر ئەوەندە. غەم هەرگیز بەشەر یەک ناخا- بەشەر فێری دوو رویی و ریبیا دەکا. ئەگەر کەسێک وابزانێ خەم و خەفەت بەشەر یەکدەخا، ئەوا غەدر دەکاو بەهەڵەدا چووە. لەنێو خەڵکی غەمبارا زۆر و ستەم زیاتر روو دەدا تا لە نێو خەڵکانی بێ خەم و بەکەیف دا.

دکتۆر پرزەی لێ برا، گوتی: «رجات لێدەکەم بمنێرەوە بۆ وێرانەکەی خۆم.»

ئەبوگین بە توڕەیی لەزەنگی دا، کەس بەدەنگی یەوە نەهات، جارێکی دی زەنگەکەی لێدایەوە و ئەوجا بەتوڕەیی زەنگەکەی کێشا بە عاردی دا. زەنگەکە بێ ناز لەسەر مافورەکە کەوت و دەنگێکی خەمناکی وەکو ناڵەی مەرگی لێوەهات.

نۆکەرێ وەژوور کەوت.

ئەبوگین بەمشتەکوڵەتێ ی بەربوو: «باوە حیزی کە رانباو گا و پێم ناڵێ ی لە کوێ بووی! هەرە بێژە عەرەبانەیەک بۆ ئەم پیاوە حازربکەن و عەرەبانە تاک ئەسپی یەکەش بۆ خۆم ئامادەبکەن.» هەر کە نۆکەرەکە ویستی بڕوا گازی کردەوە:

«سەبر کە، سبەی شتاقتان لێرە نامێنن، نمەک حەرامینەی پێ نەزانینە، باروبنەتان وەپێچن و بڕۆن. پیاوی دی رادەگرم، خوێڕیپیانە» ئەبوگین و دکتۆر هەردوو بێدەنگ و ئارام چاوەڕێ ی گالیسکە بوون.

ئەبوگین، گەڕایەوە سەرباری جاران، خۆ پەسەند و لەخۆرازی، بە ژوورەکەدا هاتوو چۆی دەکرد. بەشێوەیەکی جوان و دڵگیر سەری بادەدا، دیار بوو مژولی دانانی پیلانێکە، هێشتا توڕەییەکەی نەنیشتبووەوە. بەڵام دەیویست واخۆی بنوێنێ کە گوێ بە دژمنەکەی نادا. دکتۆر بەپێوە وێستا بوو، دەستێکی لەسەر قەراخی مێزەکە بوو، بەنیگایەکی پڕ گومان و قوڵ و رقنەوە دیروانی یە ئەبوگین؛ نیگایەک کە تەنیا خەڵکی خەمبارو بێ ویژدان لەکاتی دیتنی جوانی دا دەیکەن.

دوای تۆزێک دکتۆر سوار بوو، لەوێندەر دوور کەوتەوە، هێشتا هەر ماکی رق و توڕەیی بەنیگایەوە مابوو. دنیا تاریک بوو. زۆر تاریکتر لەساعتێ بەر لەئێستا کە



بەرێوە بوون بۆ ئێرە. مانگی سورباو کەوتبووە پشت گردەچکۆلەکەوە. هەورەکان رەوی بوونەوە، لەتاریکی یەکەدا گوم ببوون؛ لێرەو لەوێ دەوری ئەستێرەکانیان دابوو. گالیسکە تاک ئەسپی یەکە بەتەق و هۆڕ لە عەرەبانەکەی دکتۆر رەت بوو. ئەبوگین بەسواری ئەو عەرەبانەیە دەڕۆیی، دەڕۆیی تا هەر حەماقەتێکی لەدەست بێ بیکا. دکتۆر بەدرێژایی رێگا نەبیری لای ژنەکەی بوو نە لای ئاندرێ، تەنیا بیری لە ئەبوگین و ئەو کەسانە دەکردەوە کە لەماڵەکەیدا دەژیان. بیرو بیرکردنەوەکانی نارەواو نامرۆڤانە بوو. تاتوانی لە دڵی خۆیدا جوێنی بە ئەبوگین و ژنە بەد رەوشتەکەی و هەموو ئەو کەسانەی لەماڵی دا بوون، دا. بەدرێژایی رێگا نەفرەتی بۆ ناردون وهێشتاش هەر دڵی ئاوی نەخواردەوە، هەزارو یەک تانەو تانوتی لێدان، تاوانباری کردن، خەتاباری کردن وپێ. دەچوو تا مردن ئەم رق و کینەیەی لە دڵ دەرنەچێ.

رۆژگار دەگوزەرێ، غەمی کریلوف دەبڕێتەوە، بەڵام ئەم رق وکینە یە هەرچەند لایق بەدڵی ئینسان نی یە، نابڕێتەوە، نابڕێتەوەو تا مردن لە دڵی دکتۆر و لەبیری دکتۆر دەرناچێ.

## ڕێکەوتێکی هیچ

نیکوولای ئیلیچ بیەلیڤ یەکێک بوو لە موڵکدارانی پترزبورگ.ئاشقی ئەسپ سواری و جریدبازی بوو، خۆشی دەخواردو چاکی دەدڕی. گەنجێکی سی و دووساڵەی گەنم ڕەنگ بوو. ڕۆژێ دەمەوئێوارە خۆی گەیاندە خزمەتی خات «ئارنین» یانی خۆی گەیاندە خزمەتی «ئولگانوڤنا» کە پێوەندی لەگەڵیا هەبوو، یا خۆد خۆی گوتەنی «ساڵانێ لەوەپێش کۆتی ئەشقی پڕ مەشەقەتی ئەوی لەگەردن کردبوو» هەرچەندەلاپەڕەکانی هەوەڵی ئەم دەفتەرە، لاپەڕەی گەرم و گوڕ و پڕ لەجوانی و ئیلهام بوون، بەڵام ئەم لاپەرانە لەمێژ بوو خوێندرا بوونەوەو ئێستا هەر چەندە ناوەناوە هەڵدەدرانەوە بەڵام ئەو گەرم و گوڕی یەی جارانیان نەبوو، ئاسایی بوون.

نیکولای ئیلیچ بیەلیف، کەبینی ئۆلگائیڤا نوڤنا لەماڵ نی یە،خۆی بەژووری میواناکردو بەدەم چاوەڕوانی یەوە لەسەر قەنەفەیک ڕۆنیشت. لەپڕ دەنگی منداڵێک لەگوێی دا زرنیکایەوە.«نیکولای ئیلیچ خێر هاتی، هەنووکە دایکم دێتەوە.لەگەڵ «سونیا» دا چوونەتەکن خەیات:»

ئەلیوشای کوڕی ئۆلکاش لەهەمان ژووردا لەسەر قەنەفەیەک پاڵ کەوتبوو. تەمەنی هەشت ساڵان بوو، بەڵام دیاربوو کە چاک خزمەت دەکرێ بەچاکەتە مەخمەل و گۆرەوی یە ڕەشەکانیا هەر لە وێنەی سەر پۆستکارت دەچوو. لەسەر سەرینێک پاڵ کەوتبوو و لاسایی ئەو پەتبازەی دەکردەوە کە لەسێرک دا بینی بووی. هەرجارەی لاقێکی هەڵدەبڕی، کەلاقە ناسکەکانی ماندوو دەبوون، دەستەکانی تەکان دەدان، یارادەپەڕی و بەچوار چنگۆڵە دەڕۆیی، دەیویست هەردوو لاقی هەڵبڕێ و لەسەر هەردووک دەستی بوەستێ، بەدڵ و بەگیان ئەم کارەی دەکرد، هانکە هانکی پێدەکەوت و دەتگوت لە لەشی خۆی بێزارە.



بیەلیف گوتی: «ئەدی تۆ چۆنی کوڕی باش؟ ئەمە تۆی، نەم بینیت.دایکت چۆنە؟» ئەلپوشا لەم کاتەدا تازە پەنجەی پی ی چەپی بەدەستی ڕاستی گرتبوو و لەوەزعیکی دژوارا بوو.سەری هەڵسوارِاندەوە تاگەییە پاژنەی پێ ی،ئەوجا بازێکی داو لە بیەلیف ڕاما، شانەکانی هەڵتەکاندو گوتی:

– بڵێم چی، بەڕاستی دایکم هیچ کاتێ باش نی یە. بەخۆت ژنان دەناسیت، ئەویش وەکو هەرژنێکی دایمە یەکێک لە بورغوەکانی سیلاگە.بیەلیف بۆ ئەوەی خۆی مژول بکا، کەوتە سەرنجدانی سیمای ئەلیوشا. بیەلیف کە ئولگای دەبینی ئیدی گوێ ی بە ئەلیوشا نەدەداو چ حیسابێکی بۆ نەدەکرد. وەرەکوڕێک لەبەرچاوتا بێ، بەڵام چ دەکا؟ چی نیازە؟ قەت بیر لە وەڵامی ئەوپرسیارە نەکەیەوە.

دەموچاووهەنیەی سپی ئەلیوشا و چاوە گەش و ڕەشەکانی لەبەر بولێڵی خور ئاوادا «ئولگا ئیڤانوڤنا»ی وە بیر بیە لیف هێنایەوە، بەڵام ئولگا ئیڤانوڤنای یەکەم لاپەڕەکانی دەفتەری ئاشقێنیان. ویستی توزێ موجامەلەی ئەلیوشا بکا،گوتی:«وەرە شەیتان،وەرە با لە نزیکەوە تێر تەماشات بکەم.»

ئەلیوشا خۆی لەسەر قەنەفەکە هەڵدایە خوارێ وچووە لای بیەلیف، بیەلیف دەستی خستە سەر شانی ئەلیوشا وگوتی:« ئێ، ئەدی خۆت چونی؟»

– بڵێم چی، جاران زۆر باشتر بووم.

– چۆن؟

– جاران من وسونیا تەنیا موسیقامان دەخوێند ودەرسی خوێندنەوەمان هەبوو، بەڵام ئێستا دەبێ شیعری فەرەنسیش لەبەر بکەین. ئەوەتازە سەرت تاشیوە؟

– بەڵێ، زۆر نی یە.

– نەک بلێ ی. ردێنیشت کورت کردۆتەوە. دەستێکی لێ بدەم؟ نایەشێ؟

– نەخێر.

– ئەوە بۆ وەختێ تاقەموویەک ڕادەکێشی دێشیت، بەڵام ئەگەر چەپکە موویەک رابکێشی وەکو ئەوە وایە نەیەشێت. حەیفێ تۆ ردێنی ئەم لاو ئەولای رووت نایەلێتەوە. هەقی ئێرە وئێرە بیێلی یەوە وتەنیا ئێرە درێژ بکەیەوە.» ئەلیوشا هاتبووە تەنیشت بیەلیف وکەوتبووە یاری کردن بەزنجیری سەعاتەکەی. گوتی:«کە گەورە بووم وچوومە قوناغی ناوەندی دایکم سەعاتم بۆ دەکرێ، پێ ی دەڵێم زنجیرێکی لە مەی تۆم بۆ بکڕێ. قفڵەکەی چەند جوانە. بابیشم یەکێکی وای هەیە، بەڵام ئەمەی تۆ لێرەوە خەت خەتەکە چی ئەوەی بابم لێرەوە پیتی لە سەرەو

وێنەیەکی دایکیشمی تێدا داناوە. ئێستا بابم زنجیرێکی تازەی کڕیوە، ئەلقە ئەلقەنی یە، وەکو شریت سافە.

– تۆچوزانی؟ چما بابت دەبینی؟

– من..ها! نە ء! من!..

ئەلیوشا سور بۆوە. بۆ ئەوەی درۆکەی داپۆشێت، پەریشان وسەرسام کەوتە یاری کردن بەقفلّی زنجیری سەعاتەکەی بیەلیف. بیەلیف چاوی بڕی یە ئەلیوشا وگوتی:« تۆ پێم بلّێ بابت دەبینی؟»

–نە ء!

– بەشەرەفت راست بڕۆ، بەدەموچاوتدا دیارە کە راست نارۆی، زمان درۆ ناکا! پێم بلّێ بزانم بابت دەبینی،دە پێم بلّێ خۆ من وتۆ دوستین.

ئەلیوشا بە سەرسامی پرسی:

– ئاخر بە داکم نالّێ ی؟

– ئەوە قسەیە؟

– ئاخر وەعدی شەرەفم دەدەیێ؟

– وەعدی پیاو بێ.

دەسوێندم بۆ بخۆ.

– سەیری ها!

ئەلیوشا روانی یە دەوروبەری خۆی، چاوەکانی زیت کردنەوەو کەوتە چپە دوو:

– بەلاّم تو خوا بە دایکم نەلّێ ی، چونکە نابێ نە دایکم ونە کەسی دی بەم نهێنی یە بزانێ. خوانەکەران دایکم پێ بزانێ ئیدی وای بە حالی من وسونیا وپلاگیەڤا. دەوجا گوێ بگرە، سونیا ومن هەموو سێ شەمموان وجومعەیەک بابم دەبینین. پلاگیەڤا بەناوی گەڕانەوە بەر لەنیوە رۆژە دەمان بات بۆ شیرینی خانەی «ئاپفل» وبابم لەوێندەر چاوە ڕوانمانە. هەمیشە لە ژوورێکی جیا دادەنیشێت، ژوورەکە مێزێکی مەڕمەڕی جوانی تێدایە، تەپلّەکێکی لەسەرە هەر لەتاژی بێ پشت دەچێ.

– لە وێ چ دەکەن؟

– هیچ، چاکو خۆشی لەگەلّ یەکدی دەکەین، ئەوجا دادەنیشین وبابم قاوەو کێکمان بۆ دەکڕێ. دەزانی سونیا کولیچەی ناوبەقیمە دەخوا، بەلاّم من حەزی لێناکەم، ئەگەر بەکەلەرم وهێلکە دروست بکرێ تۆزێ باشترە! زۆر ناخۆین، دەزانی



بۆ؟ تا نیوەڕۆ کە هاتینەوە نانمان پێ بخورێ ودایکم هەست بە هیچ نەکا،

– باشە لەوێ باسی چی دەکەن؟

– لە گەلّ بابم؟ باسی هەموو شتێ دەکەین. بابم ماچمان دەکا، نازمان دەکێشێ، چیرۆکی خۆش خۆشمان بۆ دەگێڕتەوە.دەلّی کە گەورە بووین دەمانباتە لای خۆی تا لەگەلّ ئەو بژین. سونیا پێ ی خۆش نی یە. بەلاّم من دەلّێم :« باشە، هەرچەندە بە بێ دایکم ناخۆشە، بەلاّم قەیدی نی یە نامەی بۆ دەنێرین.» چەند خۆشە. دەتوانین لە تەعتیلەکاندا سەری دایکم بدەین. ناتوانین؟بابم وەعدی داوە ئەسپێک بۆ من بکڕێ. بابم پیاویکی چاکە، بەلاّم نازانم بۆچی دایکم بەعزی کردووەو نایەوێ ئەویش بێتە لای ئیمە، نازانم دەلّێ ئێمەنابی ئەو بدینین، خۆ بابم دایکیشمی خۆش دەوێ. هەمیشە لەئێمە دەپرسێت حالّی چۆنە، خەریکی چی یە ؟کەدایکم نەخوش بوو سەری دنیای لێ هاتبۆوە یەک. هەمیشە ئاموژگاریمان دەکا کەبەقسەی دایکە بکەین و قەدری بگرین. ئەرێ ڕاستە ئێمە بەدبەخت و نەگبەتین؟

– بۆ؟

– بابم وا دەلّێ، دەلّێ ئیوە منداڵگەلێکی بەد بەختن. من کە گوێم لەودەبێ و دەلّێ ئێوە نەگبەتن، من و دایکتانیش هەر نەگبەتین، زۆرم پێسەیرە.هەمووجار پێمان دەلّێ دوعا بۆ خۆتان و بۆ ئەویش بکەن.

ئەلیوشا چاوی بڕی یە بالّندە یەک کە پوشکەیەکی کەوتبووە نێوچاو، لەفکران ڕا چوو. بیەلیف بۆلّەیەکی لێوەهات:– یانی ئێوە ئەم کارانە دەکەن؟ دەچنە شیرینی خانەو لەگەلّ بابتاندا دادەنیشن ودایکتان پێ نازانێ؟!

– نە! نە! لەکوێ بزانی؟ پلاگیەڤا قسە ناکا پێرێ زەردەلوی بۆکڕین. هێند شیرین بوو دەتگوت مرەبایە، دوو دانەی دایەمن.

–باشە بابت قەت باسی من ناکا؟

– تۆ؟ بلّێم چی؟

ئەلیوشاشانی هەلّتەکاندو تەماشایەکی بیەلیفی کرد:– باسی تۆ!...

– چی دەلّێ؟

– ئاخر زویرنابی؟

–بۆ زویر دەبم؟ خۆ جوێنم پێ نادا؟

–نە، جوێن نا، بەلاّم دەزانی. .. زۆر لەتۆ تورەیەو دەلّێ هەمووی خەتای تۆیە کەدایکم بەدبەختەو تۆ... تۆ... تۆ دایکەت لەرێ دەرکردووە. بەلاّم من باسی تۆم

بۆ کرد. گوتم پیاوێکی باشەو قەت بەسەر دایکم دا نابۆڵێنێ. کەچی ئەو هیچی نەگوت، تەنیا سەرێکی لەقاندو تەواو..

– یانی رێک و رەوان دەڵێ من دایکتم لەرێ دەرکردووە؟

– بەڵێ بەڵام خۆ تۆ گوتت زویر نابی.

– زویر نیم... ئەمە یان تۆ نایزانی، تومەز وێرای ئەوەی کەوتومە داوەوە خەتاباریش دەرچووم.

زەنگی دەرگا لێدرا. ئەلیوشا هەستاو دەرپەڕی یە دەرێ. دوای تۆزێک ژنێک و کیژۆڵەیەک وەژوور کەوتن. ژنەکە، ئولگا ئیڤانوڤنای دایکی ئەلیوشا بوو. ئەلیوشا لە دوای ئەوەوە بە هەڵبەزو دابەزو دەست هەڵتەکاندنەوە وە ژوور کەوت.

بیەلیف کەوتە منجە منج، وەڵڵا بابە خۆشت گۆ ئەدی وایە، جگە لەمن کێ تاوانبارە؟ هەق بەوە، ئەو مێردێکی زوڵم لێکراوە.

ئولگا پرسی:– چی بووە؟

– چی بووە؟ گوێ لە وەعزدادانی مێردە ئازیزەکەت بگرە. یانی من کابرایەکی ئاژاوە چی و پیاوکوژم، خووی تۆو منداڵەکانتم شەڕ کردووە، من لە رێم دەرکردوون. ئێوە هەمووتان بەد بەختن و لەو ناوە هەر من لەو پەڕی بەختیاری دام، زۆر زۆر بەختیارم!

– لێت تێ ناگەم نیکولا، چی بووە؟

بیەلیف ئاماژەی بۆ ئەلیوشا کردو گوتی:– لەم برادەرە بپرسە.

ئەلیوشا سوور هەڵگەڕا، لەپڕ رەنگی گۆڕاو ترس لە سیمای نیشت.

بە دەنگی بەرز گوتی:– نیکولای ئیلچ قسە نەکەی!

بیەلیف بە دەنگی بەرز لە سەری رۆیی:– ئەگەر حەز دەکەی لەو بپرسە. پلاگیە ڤای گەوج و خرف منداڵەکان لەگەڵ خۆی دەبا بۆ شیرینی خانە و لەوێندەر بابی بەرێزیان دەبینن. ئەمەیان هەرنەیسە، گوایە بابی بەرێزیان شەهید بووەو من شەهیدم کردووە. من کابرایەکی ئاژاوەچیم و ژیان و گوزەرانی ئێوەم تێک داوە...

ئەلیو شا بەکەسەرەوە گوتی: نیکولای ئیلچ خۆ تۆ قەولی شەرەفت دامێ...

بیەلیف دەستی هەڵتەکاند: واز بێنە، ئەمە لە کێشی قەولی شەرەف دانی نی یە. چ شتێ نامکوژێ دوو رویی و درۆ نەبێ.

چاوانی ئولگا پڕ بوون لە فرمێسک: «من تێ ناگەم.» رووی کردە کوڕەکەی و پرسی: «لیولکا، ئێوە بابتان دەبینن؟» ئەلیوشا خۆی گێل کردو بە ترسەوە روانی یە



بیەلیف. دایکی گوتی: «مەحاڵە، دەچم لە پلاگیەڤا دەپرسم.

ئولگا لە ژوورەکە وەدەرکەوت. ئەلیوشا لە حەژمەتاندا هەموو گیانی دەلەرزی، گوتی: «خۆ تۆ قەولی شەرەفت دامێ!» بیەلیف دەستێکی هەڵتەکاند و کەوتە هاتوچۆ بە ژوورەکەدا. بیری لەوە دەکردەوە کە چ تانەیەکی لێ دراوە. ئێستاش وەکو هەمیشە ئەلیوشای فەرامۆش کرد بوو. ئەو، ئەو پیاوە گەورەیە هەقی بەسەر منداڵەکانەوە نەبوو. ئەلیوشا لە سوچێکا دانیشت و بەترسەوە بۆ سۆنیای گێڕایەوە کە چۆن هەڵخەتەتێنراوە. دەلەرزی، نزگرەی دەدا، دەگریا، یەکەمجاری بوو لە ژیانیا روو بە رووی درۆیەکی زاڵمانە ببوو. بەر لەمە هەرگیز باوەڕی نەدەکرد کە لەم دنیا یەدا جگە لەزەردەلوی شیرین و کێک و سەعاتی گران بەها، گەلێ شتی دی هەن کە لە زمانی منالاندا ناویان نی یە.

# زنده خەون

دوو سەرباز، کابرایەکی ئاوارەیان گرتووەو وەپێش خۆیان داوەو بۆ مەرکەزی شاری دەبەن. ئەم کابرا ئاوارە یە نێوی خۆی لە بیر کردووە. یەکێک لەسەربازەکان کەتەیەکی زەلامی ردێن رەشە. لاقی هێند کورتن، لە دواوە لە مریشکی لاق کولّ دەچێ. لاقی لە چاو لاقی هاورێکەیەوە هەر زۆر کولّن. سەربازەکەی دی بالاّ بەرزێکی لاوازەو وەکو دار رێک وراست چووە بەئاسماندا. سەربازی یەکەم گەلاّ وگەلّ دەڕوا، بەردەوام دەڕوانێتە دەورو بەری خۆی. ناو بە ناو قولّی چاکەتەکەی دەخاتە دەمی وەدەی مژێ. یا دەست دەکێشێ بە رانیاو لە بەر خۆیەوە وورتە وورت دەکا. تێکرا لە پیاوێکی خۆشباوەڕو بێ سەروبەر دەچێ. سەربازی دووەم لە بنیادەمێکی قورس وسەلار دەچێ. بە هەیکەل وسیمادا لە کەشیشێکی پڕ دیانەت وبە ویقارِ دەچێ. یا لەو سەربازە جەنگاوەرانە دەچێ کە جاران لە سەر پارچە رەسم دەکران. سەربازی یەکەم نێوی «ئاندروپتاکا» یەو دووەم نێوی «نیکاندر ساپۆژنیکف»ە.

ئەو پیاوەی کە ئەم جووتە سەربازە گرتویانەو وەپێش خۆیان داوە هەرگیز لە چەکلو بەرەڵلایان ناچێ. وردیلە وناسکە. کەم نمودو بێ توانایە.رەنگوو روو سیسەڵەو چرچەڵەیە، برۆی باریک، نیگای جوانە، هەرچەند بە رواڵەت لە سی ساڵ زیاترە بەڵام تازە سمێڵی بۆر کردۆتەوە. بەشەرمەوە رێ دەکا، سەری داخستووەو دەستەکانی لە قۆڵی چاکەتەکەیدا وون بوون. یەخەی چاکەتەکەی،کە لەچاکەتی دێهاتیان ناچێ، هەڵدراوەتەوەو لە گەلّ قەراخی کلّاوەکەیدا یەکیان گرتووە، تەنیا کەپووە بچووکەسوور هەڵگەڕاوەکەی بەدەرەوە یە. دەنگی گڕوقسەی نەرمە، دوای هەر قسەیەک کۆکە کۆکی پێدەکەوێ. قەت لەوە ناچێ بابایەکی تەڵەکە بازو



ساختەچی بێ وبەدرۆو بۆ رێ گومکێ وا خۆی بنوێنێ کەناوی خۆی لە بیرکردبێ. پتر لە کوڕە کەشیشک دەچێ کە لێ کەوتبێ وکەوتبێتە دەرۆزەو خوا غەزەبی لێ گرتبێ وفەرامۆشی کردبێ، یا لە کەشیشێ دەچێ بە هۆی بەد رەوشتی یەوە ترۆ کرابێ. هەروەها دەشێت بە کوره بازرگانێ بشوبهێنرێ کە هەموو توانایەکی خۆی لە سەرشانۆ بەکارهێنابێ و ئێستا بیەوێ بەدەم گەڕانەوەوە بۆ ماڵ، دەوری کوڕێکی بەرەڵلای دەست بلاّو ببینێ. رێو رۆیشتنی بە نێو قورە لیتەی پایزدا لە رێو رۆیشتنی کابرایەکی دوو دلّ وراڕا دەچێ. لەگەنجێ دەچێ کە پەروەردەی دێران بووبێ و سەرانسەری روسیا تەی بکاو لەم دێرەوە بۆ ئەو دێر بچێ و بەدلّ وبەگیان عەودالی «ژیانێکی ئارام وخالّی لە هەموو گوناهێک» بێ وهەرگیز نەیگاتێ ولێ ی نزیک نەبێتەوە.

ئەم سێ رێبوارە لە مێژە بەرێوەن، سەرەرای ئەو هەموو رێکردنەیان هەر دەلّێ ی لەجێ ی خۆ چەقیون وناجولّێن. دنیا تەم ومژە بە شەرەشەق دە مەترێکی پێش خۆ دەبینن، ئەو دە مەترەش قوڕە سوورێکی لینجە وبەراز لێ ی دەرناچی. پشتەوە شیان هەروایە تیژترین چاو لە دە مەتر پتر بڕ ناکات. لە دە مەترکەش بەو لاوە چڕە تەمە. هەر دەرۆن ورێیان لە بەر ناچێ ولە جێ ی خۆیاندا گێرە دەکەن. تەم ومژەکە نزیکتر نابێتەوە، دەلێ ی هەر لەشوێنی خۆیدایە. جاجارێ نەبێ شۆستەیەکی سپیواژی نارێک وپێک وە دیاردەکەوێ، یا قۆرتێکی سەر جادەکە دەردەکەوێ، یا چنگێ کاوکۆتی لە لۆریان رژاو دەردەکەوێ. یا بۆ ساتێکی کەمخایەن گۆلاوێکی لێلّ دەبریقێتەوە.یا لەپڕ سێبەرێک دێتە سەر رێگەیان وتا لێ ی نزیکتر دەبنەوە بچووک وتاریکتر دەبێ. نزیک ونزیکتر دەبنەوە پلاکارتێکی کیلۆمەتر ژمێری بەخەتێکی ناخۆش لە سەر نووسراویان لێ بەدیار دەکەوێ وەکو ئەوەی گالّتەیان پێ بکا وایە. یا درەختێکی خەمناکی رووت وتەڕ چەشنی گەدا لە بەر دەمیان قوت دەبێتەوە. درەختەکە رازو نیاز لە گەلّ گەلاّ زەردەکانی خۆی دەکا.

گەلاّیەک دەتۆرێ، جیادەبێتەوە وبەدەم سەماوە دەکەوێتە سەر زەوی هەمدیس تەم ومژو قوڕ وچلّپاوی کەناری جادەکە دەست پێدەکاتەوە. ئاونگی خەست بە سەر پەلکی گیادا دەخزێ. ئەم ئاونگە، لەو دلّۆپە ئاونگە دلّگیرانەنی یەکە هاوینان لە ئاکامی پێک شادبوونی زەوی وتیشکی هەتاو چێ دەبن وتینوێتی دەمەو بەیانی کلاّو کوڕەو بولبول وپەپوە سلیمانی نازدارو دەنوک درێژ دەشکێنن. پێ ی رێبوارەکان تا ئەژنۆ لە پاخوای قورە سووری لینج رۆ دەچێ وبەهەزار کولە مەرگی تا

هەنگاوێ هەڵدێنن.

«ئاندروپتاکا» پیاوێکی چەقاوە سووە، تا حەز بکەی حەز لەقسان دەکا. دەیەوێ هەموو شتێکی ئەم پیاوە وێڵ وئاوارەیەلەبنج وبناوان بکاو بزانێ چۆن دەشێت پیاوێکی ماقوڵ وبێ وەی وگوێ رایەڵ ناوی خۆی لە بیر بکا. دەپرسێ:

– تۆ ئەرتەدوکسیت؟

کابرای ئاوارە لە کورتی دەی برێتەوە ودەڵێ: «بەڵێ، ئەرتەدوکسیم.»

– باشە، تۆ تەعمید کراوی؟

* ئەدی چۆن، خۆ تورک نیم. دەچمە کڵێسا، رۆژوو دەگرم، ئەوکاتانەی گۆشت خواردن قەدەغەبێ، دەمی بۆ نابەم.

– باشە، بەچ ناوێ گازت بکەم؟

# کەیفی خۆتە کاکە گیان!

«پتاکا» شانەکانی هەڵدەتەکێنێ. بەسەرسامی یەوە دەکێشێ بە رانی خۆیدا. سەربازەکەی دی «نیکاندر» وەکو خۆی مات وبێ دەنگە. ئەم وەکو «پتاکا» ساویلکەنی یە، زۆر چاک لەوە حاڵی یە کە بۆچی کابرایەکی ئەرتەدوکسی دەیەوێ ناوی خۆی بشارێتەوە. سیمای جدی و ووشکە. وا دێتە بەرچاو کە بیەوبۆ هەموو کەسێک وهەموو شتێک وتەنانەت بۆ تەمەچرەکەشی بسەلمێنێ کە پیاوێکی فرە گرینگ و وریایە. پتاکا لە سەری دەڕوا: «مەگەر هەر خوا بزانێ تۆ چیت وچ کارەیت! ئایا دیهاتیت یا نا، خانەدانی یانا؟؟ یا دوڕەیت ورەگێکت دێهاتی و رەگێکت خانەدانە؟ جارێ تۆرێکم خستە گۆلێکەوە، حەیوانێکم گرت بە ئەندازەی قامکی خۆم، بەگوێچکە یا ماسی بوو، بەڵام کلکی هەبوو، لە دڵی خۆمدا گوتم دیارە دەبێ جۆرە ماسی یەک بێ. پاشان جوان دیقەتم دا سەیرم کرد پێ ی هەبوو، خوا بمگرێ ئەگەر درۆ بکەم. نە ماسی بوو نە مارمێلکە. هەر خوا بۆ خۆی دەزانێ چ بوو! تۆش وایت، ئاخر تێم ناگەیەنی تۆ لە چ تیرە وتایفەیەکی، سەر بە چ چینێکی؟!»

کابرای ئاوارە ئاهێک هەڵدەکێشێ و دەڵێ: «رەگێکم جووتیارە، دایکم کۆیلە بوو و لەماڵە گەورەیەکدا کارەکەری دەکرد. دایکم لەو ماڵە گەورەیەدا پەرستار بوو، بۆ خۆی نانی کەوتبووە رۆنەوە، ئارەزووی لە چ بوایە لەبەر دەستیا بوو. منیش جگەر گۆشەی ئەو بووم، لە خوێن و گۆشتی ئەو بووم، تا ئەو مابوو منیش لەو ماڵە بووم. خوا هەڵناگرێ نازیان دەدامێ، سەریان دەخستە سەرم، لییان دەدام تا بووم



بەکورێکی تەواو وەکو منداڵی خوا پێداوان و ماڵە گەوران لەسەر سیسەم دەنووستم. هەموو رۆژێ خواردنی چاکم دەخوارد، پانتۆڵم لەبەر دەکرد وپێڵاوی پاژنە نزمم لە پێ دەکرد. دایکم هەرچی یەکی خواردبا منیش دەمخوارد، ئەو ماڵە جل بەرگیان دەدایە دایکم وبەمنیشیان دەدا. ژیانمان کۆڵی خۆش بوو! ئەو هەموو کێک وشەکرلەمانەی من بەمنداڵی خواردوومن ئەگەر ئێستابا دەشیا بەپارەکەی ئەسپێکی چاک چاک بکڕی. دایکم فێری خوێندن و نووسینی کردم. هەر لەمنداڵی یەوە فێری لە خواترسی کردم، ئەوەندە بەرێک و پێکی پەروەردەی کردم کە تا ئەمرۆ ووشەیەکی دزێو یا قسەیەکی قۆڕی وەکو قسەی دێهاتیان بەزارما نەهاتووە. من بابایەکی ئارەق خۆرنیم کاکە گیان! جلی پاک و خاوێن لەبەر دەکەم، لەنیو کۆمەڵدا رێزو حورمەتی خۆم دەگرم. ئەگەر زیندووە یادی بەخێر و خوا ئاگاداری بێ، ئەگەر مردوشە خوا رەحمی لێ بکاو روحی بەرەو حەوت تەبەقەی ئاسمان، بەرەو ئەو شوێنە ببا کە روحیانەتی چاکانی لێ دەهێورێ!»

کابرای ئاوارە سەری کۆت دەکا، قژە زبرەکەی وەکو دڕک رەپ دەوەستێ. چاو هەڵدەبڕێ و دەڕوانێتە ئاسمان، دوو جاران نیشانەی خاچ دەکێشێ و بەدەنگێکی کشاو دەڵێ: «خوایە بیخەیتە بەهشتێ، بەهەشتی بەرین و رازاوە جێ ی بێ» قسەکانی پتر لە قسەی پیرێژنان دەچێ تا قسەی پیاو! و لە سەری دەڕوا: «خوایە کینیای کەنیزەکەی خۆت لە هەرشوێنێ هەیە بپارێزی. ئەگەر ئەو دایکە چاکەم نەبوایە ئێستا من دێهاتی یەکی نەفام دەردەچووم.

کاکە گیان هەر پرسیارێکت هەیە بیکە، هەموو شتێ دەزانم، ئایەتی ئینجیلی پیرۆز، هەموو شتە پیرۆزەکانی خوا، هەموو وێردو دوعاکان، زۆربەی پرسیارو وەڵامە ئاینی یەکان، گشت ئەمانە دەزانم. من بەگوێرەی ئینجیل دەژیم. خراپە دەرهەق بەکەس ناکەم، لەشم بەپاکی رادەگرم. رۆژوو دەگرم، نانێ حەڵاڵ نەبێ نایخۆم، هەندێ کەس لەزەت لە ئارەق خواردنەوەو بەدمەستی دەبینن، بەڵام من دوورم لەو شتانە، هەر کاتێ بێ کار بم لە سوچێکا دادەنیشم وکتێبێ دەخوێنمەوەو بەدەم خوێندنەوەوە فرمێسک دەرێژم، ئەسرین هەڵدەوەرێنم.»

– باشە ئەوە زانییمان کتێب دەخوێنی یەوە، ئەدی بۆ چی دەگری؟

– چونکە ئەوەی لە کتێبەکەدا نووسراوە هێند مەحزونە هەر مەپرسە. جاری وایە مرۆڤ کتێبی بە «٥» کوپیکان دەکرێ، بەڵام هێندە دەگری هێندە دەگری کە لە نا ئومێدی دا...

پتاکا پرسی: «بابت مردووە.»

– باوەڕت بێ نازانم کاکە گیان. پیاو نابێ بەنا هەق چ گوناهێک وەشێرێ. من نازانم بابم کێ بووە؟ واتێ دەگەم حەرامزادە بم و هەر خواو دایکم بزانن لە کێ بم. دایکم لە ژیانیا هەر لەگەڵ پیاوانی بە حورمەت و بەقەدر ونێودارا هەستاوە و دانیشتووە. هەرگیز بەلای ئەوەدا نەچووە شوو بە کەرە دێهاتی یەکی پێ خاووس و لینگ رووت بکا.

پتاکا بەدەم پێکەنینەوە دەڵێ: «بۆیە بەرز فڕیوە وکاکی ئاغا پاک و پوختە هەپەی ناوە!»

– وایە، بەڵام دایکم ژنێکی لە خوا ترس بوو، بۆیە ئەگەر من قسەی وابکەم گوناحم دەگا. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کە پێ دەچێ خوێنی ئاغاو ئەشراف زادە لە دەماری مندا هەبێ. رەنگە سەرو سەکوتم دێهاتیانە بێ، بەڵام لە راستیا رەگ و رەچەڵەکم بچێتەوە سەر خانەدانان و ئەشرافان. هەموو ئەم قسانە بەدەنگێکی بەسۆزو هێدی وهێمن دەکا. نێوچەوانی گرژ دەکا، فڕەفڕی کەپوە بچووکە سورەکەی سەعاتە رێ یە دەڕوا. پتاکا بەدەم گوێگرتنەوە چاوی دەبڕێتێ و دیسان شانەکانی هەڵدەتەکێنێ.

پاش ئەوەی چوار کیلۆ مەترە رێ دەڕۆن، بەسێ قۆڵی لەسەر گردێک دادەنیشن تا پشوویەک بدەن. پتاکا لە بن لێوەانەوە دەڵێ: «سەیرە، سەگ بە سەگی خۆی ناوێکی هەیە. من ناوم«ئاندرو» یە، ئەم برادەرە ناوی «نیکاندر»ە. هەر گووراوێکی خوا ناوێکی هەیە و مەحاڵە یەکێک هەبێ ناوی خۆی لە بیر بکا! مەحاڵە!»

– جا ناوی من بەخەڵکی چی؟!

کابرای ئاوارە ئاخێک هەڵدەکێشێ، دەست دەگرێ بەرووومەتەکانی یەوەو لەسەری دەڕوا: «ئاخر بۆ چی خەڵکی بم ناسن؟ چ قازانجێ دەکەم؟! خۆ ئەگەر ئازادیش بام و بەکەیفی خۆ بەم لاو بەو لادا رۆیشتبام وەزع و حاڵم لە ئێستا چاکتر نەدەبوو. هاودینەکانم! من سەرم لە قانون دەردەچێ و کە مۆکەیەکی لێدەزانم، ئێستا من بابایەکم ئاوارە، نێوی خۆم بیر چووە، جا بەم حاڵەوە ئەگەر بشگیرێم، ئەو پەڕی هەواڵەی سیبریای رۆژهەڵات دەکرێم و ٣٠-٤٠ جەڵدەم بۆ دەبڕدرێتەوە. بەڵام ئەگەر ناوی خۆمیان پێ بڵێم ئەوا دیسان هەمان بەزم و رەزم بەرۆکم دەگرێتەوە، هەم حوکم دەدرێم و هەم کاری سەختم بەسەردا دەدەن، ئەی مەعنای چی، خۆم دەزانم!»



– یانی تۆ مەحکوم بوویت؟

– بەڵێ برا ئازیزەکەم. سەریان تاشیم و چوار ساڵی خشت پێوەند لەپێ و کەلەبچە لەدەست.

– باشە لەسەر چی؟

– لەسەر قەتڵ. کە منداڵ بووم، تەمەنم هەژدە ساڵ بوو، دایکم بەهەڵە لەبری سۆدە، زەرنیخی لە پەرداخەکەی ئاغا کرد. چونکە عەمارەکەیان پڕ بوو لە پاکەتی هەمەجۆر ئیدی هەڵە کردن کارێکی ئاسایی بوو!

کابرای ئاوارە ئاخێک هەڵدەکێشێ، سەرێک بەم لاو بەولادا بادەداو لەسەری دەڕوا: «ئەلهەقی ژنێکی لە خوا ترسیش بوو، بەڵام کێ دەزانێ دەرونی مرۆڤ چی تێدایە؟! دەرون جەنگەڵستانێکی تاریکە. لەوەیە هەڵەی کردبێ، لەوەیە بە ئانقەست ئەم کارەی کردبێ؛ ئاغا خووی دابێتە کارەکەرێکی دی و ئەمی لەبەر چاو کەوتبێ و دایکیشم غیرەتی زەدەدار بووبێ و ئەم تانەیەی پێ قبوڵ نەکرابێ. لەوەشە بەمەبەستێکی دی زەرنیخی بۆ لەپەرداخەکە کردبێ، مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ! من ئەو دەمە منداڵ بووم و سەرم لەم کارانە دەرنەدەچوو. بەڵام ئێستا کە بیر لێ دەکەمەوە، بە جوانی دێتەوە خەیاڵم کە ئاغا دۆستێکی دیکەی گرتبوو و دایکم زۆری خەفەت دەخوارد. مەحکەمەکەمان دوو ساڵ درێژەی کێشا. دایکم ٢٠ ساڵ حوکم وکاری سەختی بۆ بڕایەوە، منیش لەبەر مندڵی حەوت ساڵ حوکم و کاری سەختم بۆ بڕایەوە.

– باشە کە قاتیلەکە گیرا ئیدی تۆ بۆ حوکم درای؟

– بە تۆمەتی شەریکە تاوان. ئاخر من پەرداخەکەم بۆ ئاغا برد. هەمیشە هەر من پەرداخەکەم بۆ دەبرد. من ئەم قسانە لای ئێوە دەکەم، بەڵام توخوا با هەر بەینی خۆمان بێ و کەس پێ نەزانێ...

پتاکا دەڵێ: «خەمت نەبێ نە، کەس ئەم پرسیارە لە ئێمە ناکاو بەکرێش نەگیراوین لە خۆوە باسی بکەین.. ئێ یانی تۆ لە زیندان هەڵاتووی؟

– بەڵێ. چواردە کەس بووین، خوا یارو یاوەریان بێ، ئەوان هەڵاتن ومنیشیان لەگەڵ خۆدا هێنا. ئێستا کورەکە گیان من ناڵێم تۆ بڵێ، پیویست دەکا ناوی خۆم بەکەس بڵێم؟

ئەگەر ناوی خۆم بڵێم دووبارە دەمگێڕنەوە بۆ زیندان و کاری سەخت. بەخویشت دەمبینی چ زەلامێکم؟ بابایەکم نەخۆش، بێ تاقەت و کەم جورم. حەزم لە خواردن و

جێ و ڕێ ی پاکو خاوێنه. حەز دەکەم چرایەکی چکۆڵە یا مۆمێ هەڵگیرسێنم و بکەومە وێردرو پاڕانەوە. حەز ناکەم لەکاتی نوێژ کردندا دەوروبەرم قەرەباڵغ و پڕ هەراو هەنگامەبێ. حەز ناکەم لە کاتی کڕنوش بردن و چوونە سوجدەدا سوجدەگاکەم پڕ لەتف و بەڵغەم بێ. من بۆ ڕزگاری ی دایکم شەو و ڕۆژی چل جاران دەچمە سوجدە.»

کابرای ئاوارە کڵاوەکەی دادەکەنێ و هاوار دەکا: «ئەگەر حەز دەکەن با هەواڵەی سیبریای ڕۆژهەڵاتم بکەن، ترسم لەوێ نی یە.»

– چی؟ بۆ سیبریا باشترە؟

– «ئەمەیان مەسەلەیەکی ئەلاحەدەیە. کە مرۆڤ بەکاری سەخت حوکم دەدرێ لە قرژاڵی گیرۆدەی تۆڕ خراتری بەسەر دێ.

– چی؟ بۆ سیبریا باشترە؟

دەوروبەری قەرەباڵغە. دەڵەکی دەدەن، خۆی پێدا دەکێشن، سوچێکی دەست ناکەوێ کە هەناسەیەکی ڕەحەتی تێدا بدا. زیندان دۆزەخی سەر زەمینە، خوا بەنسیبی کەسی نەکا! مرۆڤ بەدڕندە دەزانن و ڕەفتاری دڕندەی لەگەڵ دەکەن.

ژیانی لە ژیانی سەگ خراترە. خواردنت نا دەنێ، شوێنێ نی یە تاوێ بخەوی، یاوەکو بنیادەم نوێژەکەت بکەی. بەڵام دوورخستنەوە جیاوازە، وردە ووردە خۆت بەگەڵ جماعتێک دەخەی. دەوڵەت مەجبورە زەویت بداتێ، باوەڕ بکە چۆنی دەڵێم وایە. بیستوومە زەوی لەوێندەر هەرزانە، لە بەفر هەرزانترە. هەرچی یەکت بوێ دەتدەنێ. پارچە زەوییەکم دەدەنێ. پارچە یەکیشیان لێ وەردەگرم بۆ باغ وتۆزێکیش بۆ خانوو. ئەوجا وەکو هەر کەسێکی دی بۆ خۆ دەکەومە کشتوکاڵ و شۆو بڕین. بەرە بەرە ڕانێک پێکەوە دەنێم، هەنگ بەخێو دەکەم، بۆ خۆ دەبم بە خاوەنی پەزو سەگ، گوربەیەکی سیبریش ڕادەگرم و بەڕەڵلای گیانی چرج و مشکی دەکەم تا نەیەڵێ ماڵەکەم بخۆن. بۆخۆ خانویەک دروست دەکەم، میحراب ڕۆدەنێم و ئەگەر خوا یاربێ و بەنسیبی بکا زنێکی لێ دێنم و دەبم بەخاوەنی ماڵ و منداڵ.»

کابرای ئاوارە ئێستا لەبەر خۆیەوە دەدوێ و سەیری سەربازەکان ناکا. چاوی بڕیوەتە شوێنێکی دوور دوور. هەر چەندە خەون و خەیاڵەکانی بێ سەرو بەرن بەڵام هێندە بە دڵ و کوڵ قسان دەکا پیاو ناتوانێ باوەڕی پێ نەکا!

سێبەری بزەیەک نیشتە سەر دەمەچکۆلەکەی. سیمای، چاوی، کەپووی هەر هەموو گەشاوەی شادییەکی دوورە دەستن.



سەربازەکان گوێ دەگرن و بەنیگای پڕ بەزەییەوە سەیری دەکەن. ئەوانیش قسەکانی بۆ دەسەلمێنن.

کابرای ئاوارە لەسەری دەڕوا: «بەهیچ جۆرێ لە سیبریا ناترسم، سیبریا و ڕوسیا وەکو یەکن. لەوێندەرش هەمان خوای ڕوسیا دەپەرستن، گوێ ڕایەڵ و مل کەچی فەرمانی هەمان تزارن.

بە هەمان زمانی مەسیحیانی ئەرثەدۆکس دەدوێن، یانی ئەم زمانەی کە من لەگەڵ ئێوەدا قسەی پێدەکەم. بەڵام لە سیبریا هەرزانی یە، خەڵکی پارەداترن. هەموو شتێکی لە ڕوسیا باشترە، بۆ نمونە چۆم و ڕوبارەکانی، چۆم و ڕوباری ئەوێ هەزار هێندەی چۆم و ڕوبارەکانی ئێمە جوانن. ماسی، ماسی! ڕاوە ماسی وێندەر هەر باس ناکرێ! برادەرانی ئازیز بەلای منەوە لەراوە ماسی خۆشتر نەبووە و نابێتەوە. بەپەت و قولاپ، بەتۆر ماسی دەگرم. لە کاتی سەهۆڵ بەنداندا تۆڕی گەورە بەکار دێنم، هەڵبەتە بەتەنێ دەرەقەتی تۆڕی گەورە نایەم، جا کابرایەکی دێهاتی بە «٥» کوپیکان بەکرێ دەگرم ئیش وکاری ئەوەبێ کە تۆڕەکەم بۆ هەڵکێشێتەوە. کە خۆشە خوایە! کە بۆ خۆ کەیف دەکەم... بەڵام هەر ماسی یەک و جۆرە مامەڵەیەکی تایبەتی دەوێ. هەندێ ماسی دەبێ ووردە ماسی بۆ بکرێ بە چەشە. هەندێکی دی دەبێ کرمی بۆ بکرێ بەچەشە، بۆهەندێکی دیکە دەبێ بۆق یان قالۆچە بکرێن بە چەشە. دەبێ هەموو ئەم فەند و فێڵانە بزانی. بۆ نموونە مار ماسی، ماسییەکی درژ پەسەندە، تەنانەت دەتوانی مارمێلکەشی بۆ بکەی بە چەشە. ماسی یە دەم درێژەکان حەز لە کرمی بۆر دەکەن، ماسی یە دڕکاوی یەکان حەز لە شەمشەمەکوێرە دەکەن. لەدنیا دا چ شتێ لەراوی ماسی قەڵەوی نێو ئاوی خوڕ خۆشتر نی یە. قالۆچەیەک یان شەمشەمە کوێرەیەک دەکەی بەسەری قولاپەکە تەوەو دەیدەیتە دەم ئاوەکەوە، پەتەکەی بۆ شل دەکەی تا ٢٠–٣٠ مەترێک دوور دەکەوێتەوە، ئەوجا پیرە پانتۆڵی لێ دادەکەنی و بەلینگی ڕووت وەنێو ئاوەکە دەکەوی و وردە وردە دووی چەشەکە دەکەوی، پاشان لە پڕ بەتوندی پەتەکە ڕادەکێشی و تەماشا دەکەی ما سییەکی گەورەو قەڵەو بەسەری قولاپەکەتەوەیە. دەبێ وریا بی لە کاتی خۆیدا پەتەکە ڕابکێشی، دەنا هەم ماسییەکەو هەم چەشەکەت لەدەست دەچێ، هەر کە پەتەکە خوار بوو، پێویستە خێرا ڕای بکێشی.

نابێ تاقە دەققەیەکیش ماتەڵ بی. وەختێ کە فیرار بووین و حوکمدراوەکانی دی لە پرخەی خەودا بوون، من خەوم لێنەدەکەوت و دەکەوتمە ڕێ تا ڕوبارێ بدۆزمەوە.

روباری ئەوێندەر گەلێک پان وخوڕن وکەنارەکانی نشێوییە. راوە ماسی لەوێ یەکجار زەحمەتە. سەرانسەری کەنارەکان چڕە دارستانە. درەختەکان هێند بەرزن کە بتەوێ سەیری سەرەوەیان بکەی کڵاوت لە سەردەکەوێ. درەختی وای تێدایە لێرە بە ١٠ رۆبڵێ نادەن.»

کابرای وردیلەی مەینەتبار لە ژێر فشاری خەون وخەیاڵی رابوردوو زڕە ئومێدی خۆشی ئایندەدا شەکەت دەبێ ولەقسان دەکەوێ. وەکو یەکێک رازونیاز لەگەڵ خۆی بکا تەنیا لێوەکانی دەبزوون. سێبەری بزەیەکی پڕشادی دەنیشێتە سەری سیمای وخێرا ئاوا دەبێ.سەربازەکان چ شتێ نالێن، سەریان داخستووەو لە فکران ڕا چوون. کپی و خامۆشی پایز، تەمی شێدار لەزەوی هەڵدەستێ و وەکو دیوار لەبەردەم مرۆڤ دا قوت دەبێتەوە و ئەوتۆزە ئازادی یەی کەهەیەتی دەیداتەوە بەرویا، ئاخ کەلەو دەمانەدا خەیاڵی چۆم و روبارانی گەورەو خوڕ چەند خۆش و ئارام بەخشە! چۆم و روبارانێ کە کەناری ئاوەدان و پڕ درەختیان هەبێ! خەیاڵی ئاسودەیی. خەیاڵ بەشێوەیەکی تایبەتی پیاوێک بەرجەستە دەکا کەوەکو خاڵێک بەرووی کەنارێکی نشێوەوە ئارام و ئاسودە لەبەیانی یەکی زوودا گیرساوەتەوە، بەیانی یە کی هێند زوو کەهێشتا شوعلەی سپێدە لە ئاسو جیانەبۆتەوە. لەم بەرو لەوبەری روبارەکە دارکاژی بەدەماخ و پڕ ژیان ریزیان بەستووە و سەریان هێناوەتەوەیەک و بەچپەیەکدی دەدۆێن و بەدڵ دەڕواننە ئەو پیاوە ئازادو سەرفرازە. دەون و رەگوریشاڵ و تاوێرە بەردی زەلام و بنچکی دڕکاوی رێ ی دەگرن، بەڵام ئەوپیاوە چ وەکو بەدەن و چ وەکو ورە بەهێزە و لەهیچ ناترسێت. نەلەدارکارەکان، نەلەتاوێرە بەردەکان، نەلەتەنیایی و نەلەدەنگدانەوەی هەنگاوەکانی خۆی. خەیاڵی سەربازەکان، ژیانێکی ئازادیان لەبەرچاو بەرجەستە دەکا، ئازادی یەکی ئەوتۆ کەتەنیاناویان بیستووە.

ئایا ئەوان، وێنەی ئەو شتە خەیالێیانە بەرجەستە دەکەن کە هەرناویان بیستوە؟ یا ئەم تاسەو خەیاڵی ئازادی یە نێکەڵ بەخوێنیان بووە و لەباوباپیرانی کێوی و دلێریانەوە بەمیرات بۆیان ماوەتەوە؟ تەنیا خوا دەیزانێ!

«نیکاندر» کەتائێستا تاقە قسەیەکی نەکردبوو، بێدەنگی یەکە دەشکێنێ. رەنگە لەدڵی خۆیدا بەغیلی بە خەون و خەیاڵی کابرای ئاوارەبەرێ. لەوەیەلەدڵی خۆیدا بڵێ ئەم خەونە خۆشانە لەگەڵ ئەم تەمو مژو قوڕە لیتەیەدا ناگونجێن. بەهەرحاڵ بەپەستی یەوە دەڕانێتە کابرای ئاوارە و دەڵێ:«برادەر هەموو ئەمانە چاک



و بەجێن، تابلێی جوان و دڵگیرن، بەڵام تۆ هەرگیز ناگەیتە ئەو شوێنە خۆش و بەبەرەکەتە. چۆن دەیگەیتێ؟ تۆبابایەکی بێ تاقەتی، سی کیلۆ مەتر بڕۆی دەمری. تۆ ئەمرۆکە تەنیا چوار کیلومەتر هاتووی وات بەسەرهاتووە! دەڵێ ی بەحەیاتت ئیسراحەتت نەکردووە؟

کابرای ئاوارە نیگایەکی«نیکاندر» دەکا، رەنگ لەرووی نامێنێ و وەکو یەکێک بەدزیەکەوە گیرابێ شەرمەزارو پەست سەرێکی بۆ دەلەقێنێ، دیسان هەموو کڕوکپ دەبنەوە. هەرکەسەو سەرگەرمی بیرو بیرکردنەوەی خۆیەتی.. سەربازەکان هەوڵ دەدەن ئەوماوە دوورەی نێوان خۆیان و ئەو سەرزەمینی ئازادی یە خەیاڵی یە بێننە بەرچاوی خۆ. کۆمەڵێ وێنەی ئاشکراتر بەڵام ترسناک تر لەشێکی کابرای ئاوارەدا دێ و دەچی؛ هۆڵی دادگا، زیندان، دوور خراوەو مەحکومان، قفڵ و دەرگاو زیندان، پشوودانی رێگا، سەرمای زستان، نەخۆشی، مەرگی هاورێیان، هەر هەموو ئەم وێنانە بەئاشکرا دێنە بەرچاوی وبەرجەستە دەبن. چاوەکانی دەکەونە پرتە پرت، دڵۆپە ئارەقە زەنگوڵ زەنگوڵ دەنیشێتە سەرهەنیەی. بەسەری قۆڵی هەنیەی دەسڕێ و هەناسەیەکی سارد هەڵدەکێشێ؛ دەڵێ ی تازە لەکورەخانەیەکی گەرمی گەرمەوە هاتۆتە دەرێ. هەمدیس هەنیەی بەسەری قۆڵەکەی دیکەی دەسڕێ و بەترسەوە ئاوڕ بۆ دواوە دەداتەوە.

پتاکاش قسەی هاورێکەی تەسدیق دەکا:«راستە، تۆ هەرگیز ناگەیە ئەویندەر. تۆ ناتوانی ر ێ بکەی، تۆسەیری خۆت بکە، هەرپێست و ئێسکی! براگیان تۆ هیچ نەتکوژێ ئەم رێ یە دەتکوژێ.»

نیکاندر قسەکەی دەمی هاورێکەی دەقۆزێتەوە:«مەعلومە کە دەیکوژێ، مەحالە ئەم رێ یەی پێ تەواو بکری، یەکسەر دەینێرنە خەستەخانە؛ ئەمە دۆغری یەکەیەتی و چەندو چون هەڵناگرێ.

کابرای ئاوارەی بێ ناو بەترسەوە دەروانێتە سیمای هاوڕێ دێوسیفەتەکانی. ئەوجا چاوی دادەخا، بەپەلە دادەنەوێتەوەو بێ ئەوەی کڵاوەکەی لەسەری دابکەنێ. بەچۆکا دێ. ئازای لەشی دەکەوێتە لەرزین، سەری دەسوڕێ و وەکوکرمێک کەپێ ی پێدا بنرێ دەکەوێتە هەڵپلان؛ نیکاندر هەڵدەسێتە سەر پێیان و هاواری بەسەردا دەکا:» هەستە، هەستە بابڕۆین درەنگە!»

هەرسێ رێبوارەکە دوای تۆزێک دەکەونەوە رێ و قوڕ شێلان. کابرای ئاوارە سەری داخستووەو دەستەکانی لەجاران زیاتر تەپاندونەتە نێو قۆڵی چاکەتەکەیەوە؛

بەڵام پتاکا ما تو بێدەنگە.

# زیک زیکە

## ١

زەمـاوەندی ئۆلگا ئیـڤـانوڤنا بوو. دۆسـتـان و ئاشنایان هەمـوو هاتبـوونە داوەتەکەی. ئۆلگا لێکدالێکدا ئاماژەی بۆ شووەکەی دەکرد و بەئاشنا و دۆستەکانی دەگوت: «ئەنگۆ جوان سەرنجی بدەنێ، شتێکی نادیار لە سیمایدا بەدی دەکرێ». پێدەچوو بۆیە ئەم قسەیە بکا تا نەوەک داوەتکراوان لە دڵی خۆدا بڵێن مێردەکەی چ نییە، پیاوێکی ئاساییە و بەهیچ جۆرێ مایەی سەرنج نی یە.

شـووەکـەی «ئەسیپ ئەسـتپـانوفچ دیموف» پزیشـک بوو، بەناو پلەی راوێژکـاری هونەری هەبوو. لەدوو نەخۆشخاناندا کاری دەکرد.

لە یەکەمیاندا نەخۆشانی دەبینی و لە دووەمیاندا کاری نەشتەرگەری دەکرد. لە سەعات نۆوە تا نیوەڕۆ لە خەستەخانەی یەکەم کـاری دەکرد و نەخۆشانی ئاسایی دەبینی و لەهەمـوو بەشـەکـاندا کاری دەکـرد، کـە کـاری تەواو دەبوو سـواری قـیـتـار دەبوو، دەچوو بۆ نەخۆشـخـانەی دووەم و لەوێندەر سـەرگـەرمی کـاری نەشـتـەرگـەری دەبوو. دەرامەتی ساڵانەی کەم بوو، نزیکەی ٥٠٠ رۆبڵێک بوو. ئەمە دیموف بوو! بەڵام دۆست و ئاشناکـانی ئۆلگا خـەڵکانی ئاسـایی نەبوون. هەر یەکـەیان لە هونەرێکا بەنێـوبانـگ بوو، نێـو و شـۆرەتیـان هەبوو، دیارو ناسـراو بـوون. ئەگـەر هەندێکیـان هێـشـتـا تـەواو شـۆرەتیـان دەرنەکـردبوو ئەوا ئومـێـدی زۆریان بە ئایندە هەبوو.

ئەمیـان ئەکـتـەرێکی کـارامە و هۆشیـار و بەقـەدر بوو، ئەویان پیـاوێکی زەریف بوو، ئەوی دی مـامۆسـتـای هونەری خوتبـەوێژی بوو و ئۆلگای فـێر کردبوو، کە چۆن بەرهەمی ئەدەبی لەبەر بخوێنێـتـەوە. یەکـێکی دییـان دەنگبـێـژێکی شـۆخ و شـەنگی ئۆپرابوو، هەمیـشـە داخی هەڵدەکێشا و گلەیی لە ئۆلگا دەکرد کە خۆی نـاناسێت و



قەدری ئەو بەهرە چاکەی خۆی نازانێ و ئەگەر واز لە تەمەڵی بێنێ و جڵەوی خۆی بگرێتەوە بێگومان دەبێ بە دەنگبێژێکی یەکجار نێودار و ناسراو.

ئاشناکـانی دیکەی ئۆلگا چەند نیگارکێـشێکیـان تێـدابوو کە ریابوسکی دیمەن سـاز سـەرقـافڵـەیان بوو. ریابوسکی سـروشـتی بێ گـیـان و گـیـانداری دەکـێـشـا. پیـاوێکی قژ زەردی قۆز، تەمەنی ٢٥ ساڵ بوو. لە پێشـانگایەکی نیگارکێشی دا شۆرەتی پەیدا کردبوو و دوا تابلۆی خۆی بە ٥٠٠ رۆبل فرۆشتبوو.

ریابوسکی دەسـتکاری سکێچەکانی ئۆلگای دەکرد، رێنوێنی دەکرد و پێشبینی ئایندەیەکی پڕشنگداری بۆ دەکرد. ئاشنایەکی دیکەی ئۆلگا کابرایەکی چەلۆژەن بوو کە ئەو ئامێرەی دەهێنایە زمان. بەراشکاوی ستایشی ئۆلگای دەکرد و دەیگوت لە نێو ئەو ژنانەدا کە ئەم دەیان ناسێت ئۆلگا لە هەموویان لەبارتر و کارامەترە بۆ هاو ئاهەنگی لەگەڵ ئامێرەکەی ئەودا. ئەدیبێکیش لە پێڕی ئاشنایانی ئۆلگا بوو، ئەم ئەدیبە هەرچەند هێشـتا گەنج بوو، بەڵام سەبارەت بە کورتە چیرۆک و شانۆنامەکانی شـۆرەت و نێـوی پەیدا کردبوو. کێ ی دی کێ ی دی؟ ئا، بیـرم کەوتەوە؛ ڤـاسـیلی ڤـاسـیلوڤچ. ئەمـیـان کـابرایەکی دێهـاتی بوو. وێنە سـازێکی بەهرەمـەندو ئاشـقی شوێنەواری مێژوویی و میللی بوو، ئەم کـابرایە، ئاشقێکی گەورەی پیشـەکۆنەکـانی رووس بوو، هەر ئەم ئەشـقـە گـەورەیە ببـو بە هانـدەری و شـاکـاری واقـیـعی لەسـەر کاغەز، چینی، و قاپی گلێن رەسم دەکرد.

لە نێـو ئەم کـۆمـەڵە ئازاد و نـاسک و بەرێکەوت پوخـڵـە دا تەنیـا جـەنابی زاوا کـابرایەکی گـومنـاو وپشت گـوێ خـراو بوو. زاوا لە نێـو ئەم کـۆمـەڵەدا چ جـێـیـەکی نەبوو. هەرچەندە کـابرایەکی باڵا بەرزی نـاوشان پان بوو، بەڵام بێ خێر و بێ مـەعنا دەهاتە بەرچاو.

بیچامەکەی هێندە دەڵب و نالەبار بوو لە تۆ وایە بۆ یەکێکی دی دوراوە. ردێنی دەتگوت ردێنی کـاسبکـارانە. گـەر بهـاتبـا ئەم کـابرایە نووسـەر یا نیگـارکێش با ئەوا ئەو دەمە ردێنی، ردێنی «زولا»ی دێنایەوە یادی مرۆڤ.

نیگـارکێشەکە بە ئۆلگای گوت کە بەقژی لوول وپڕپێچەوەو بەم جلی بوکێنی یەوە رێک لە درەخـتـێکی بەنازی ئالوبالۆ دەچێ کـە لە بەهارانا شکۆفەی سپی و جـوان دەکـا. ئۆلگا دەسـتی کـابرای نیگـارکـێـشی گـرت و گـوتی: «تۆ گـوێ بگرە بزانە ئەم شـوکـردنە لە نـکاوە چۆن رووی دا. گـوێ بگـرە، گـوێ بگـرە. دیموف و بابم لە یەک خەستەخانەدا کاریان دەکرد. کە بابم لە خەستەخانە کەوت، دیموف شەو و رۆژ لێ ی

دوور نەدەکەوتەوە. کە پیاوێکی دڵسۆزە! گوێ بگرە ریابوسکی، تۆش گوێت لێ بێ جەنابی نووسەر، چیرۆکێکی خۆشە، وەرنە پێشترەوە، ئەو هەموو دڵسۆزی یە، ئەو هەموو زەحمەتکێشانە! بەخویشم شەوان نەدەخەوتم و تاکو بەیانی بەدیار بابمەوە دادەنیشتم لە پڕ.. دڵی کوڕەی بێچارەم برد! ئیدی دیموف دیموف لە ئەشقدا غەرق بوو. شتەکان بە جۆرێکی سەیر رێک کەوتن.

کە بابم مرد، ئێمە لێکدی دانەبڕاین، لە گەڕەک و بانا یەکدیمان دەدی. جارجاریش دیموف دەهاتە دیدەنم، لە پڕ شەوێک داخوازی کردم... ئەو شەوە تاکو بەیانی فرمێسکم هەڵڕشت، بەخۆیشم گرفتاری ئەشقی بووم و ئەوەتا بە خۆتان دەبینن کە شووم پێکردووە. ئەرێ بەرای ئێوە شتێکی نائاسایی لە سیمایدا بەدی ناکرێ؟! شتێکی بەهێز؛ وەکو بێباکی و دلێری شێر؟ جارێ دیار نی یە، نیوەی رووی لە ئێمەیە و روناکی یەکە تەواو نی یە. بەڵام کە ئاوڕی دایەوە بڕواننە نێوچەوانی! ریابوسکی تۆ چ دەڵێی؟ دیموف خەریکە باس تۆ دەکەین. چوو مێردەکەی گاز کرد و گوتی: «دیموف وەرە ئێرە، لەگەڵ ریابوسکی دا ئاشنا بن!» دیموف بەزەردە خەنەیەکی سادە و بەرووی خۆشەوە دۆقەی لەگەڵ نیگارکێشەکەدا کرد و گوتی: «خۆشحاڵم لە دانشگا ریابوسکی یەکم لەگەڵ بوو، خزمی تۆیە؟»

## ٢

ئولگا ٢٢ ساڵان بوو و دیموف ٣١ ساڵ. پاش زەماوەندەکەیان بەخۆشی پێکەوە دەژیان. ئولگا ژوری میوانی وەکو پیشانگا لێ کردبوو پڕی کرد لە تابلوکانی خۆی، تابلۆی دۆستەکانی. تابلۆی چوار چێوەدار، وبێ چوار چێوەی لێرەو لەوێ هەڵواسی. دەوروبەری پیانۆکە و شتەکانی دیکەی نێو ژوورەکەی بە چتر و سێپا، تابلۆی رەنگین، خەنجەر، نیوپەیکەر و وێنە رازاندەوە. هەندێ تابلۆی سادەی تری بابەتی زەوقی دێهاتیان لە ژووری نان خواردن هەڵواسی.

ژوورێکی دیکەی بە پێڵاو شەبقەی پوش و داس و شەن پڕ کردەوە، ئەم ژوورەی بە شێوەیەکی میللی رازاندەوە. بۆ وەی ژووری نووستنەکەی وەکو ئەشکەوت بنوێنێ، بن میچ و دیوارەکانی بە پارچەی رەش پۆشی، فانۆسێکی لە سەرووی سیسەمەکەوە هەڵواسی و لەبەر دەرگاشەوە پەیکەرێکی کوتەک بە دەستی دانا، تێکڕا رایان وابوو کە ئەم جووتە گەنجە خانوویەکی جوان و رێک وپێکیان هەیە.



ئولگا هەموو ڕۆژێ سەعات یازدە لە خەو رادەبوو، تاوێ پیانۆی لێدەدا. ئەگەر دنیا هەتاو با بۆیە زەیتی یەکەی دەردەێنا و دەکەوتە نیگارکێشان. سەعات یەکی پاش نیوەڕۆ دەچووە نک خەیات. چونکە نەخۆی و نە دیموف هیچیان پارەدار نەبوون، هەڵدەستا فێڵێکی زیرەکانەی بەکار دێنا، بۆ وەی جلێکی تازە و جوان و مایەی سەرنج و پەسەندی هەمووان لەبەربکا. کۆنە پارچەی جوان، پارچە تۆڕ، پولەکە و دوگمەو مور و مەخمەل و ئاوریشمی دەبردە کن خەیات، خەیاتی دەست رەنگینیش موجیزەی لێ دروست دەکردن. جل، جل نەبوو بەڵکو خەون و خەیاڵی شاعیرانە بوو.

کە ئیشی لای خەیاتی تەواو دەبوو دەچووە کن یەکێک لە ئەکتەرەکانی دۆستی تا دەنگوباسی شانۆگەرییان بزانێ و بلیتی شەوی یەکەمی شانۆگەری یەکە پەیدا بکا، لەوێندەر دەڕۆیی بۆ رەسم خانەی یەکێک لە نیگارکێشەکان یا دەچووە سەیری پێشانگایەکی تابلۆسازی. ئەم هەموو هاتوچۆیە یا بەوە کۆتایی دەهات کە یەکێک لە نێوداران دەعوەت بکا بۆ ماڵەوە یا بە گفتوگۆیەکی ئاسایی و سادە کۆتایی دەهات. ئەم خەڵکانەی کە ئولگا بە نێوداری دەزانین، هەموو ئولگایان بەهاوتای خۆ دەزانی، دەیانگوت گەر ئولگا فرسەتی گونجاوی لە دەست نەدەدا و خۆی خەسار نەدەکرد،زەوق و بەهرە و هۆشیاری لە رادەیەک دایە کە بتوانێ کارێکی گەورە ئەنجام بدا. ئولگا گۆرانی دەگوت، موسیقای لێدەدا، نیگارکێشی دەکرد، دەبوو بە مۆدێل، وەکو هونەر دۆستێک لە شانۆگەریدا بەشداری دەکرد، هەموو کارێکی بە چاکی ئەنجام دەدا. بۆ نمونە ئەگەر گلۆپێ یا بلاجکتۆرێکی دانابا، کە خۆی رازاندباوە، یا بۆینباخێکی بۆ یەکێک بەستبا، بێ چەند و چۆن شاعیرانە و جوان و بێ عەیب دەیکرد. بەڵام هیچ بەهرەیەکی نەدەگەییە بەهرەی دیدەنی و پێشوازی خەڵکانی نێودار هەر کە یەکێک کەمێ نێوی دەرکردبا یا تەنیا نێوی کەوتبا سەرزاران ئەوا ئولگا لەماوەی رۆژێکا دەی دۆزیەوە و بەدیداری شاد دەبوو، دۆستایەتی لەگەڵ دەگرت، بۆ ماڵەوەت دەعوەت دەکرد. ئەو کاتەی خۆشی بوو کە ئاشنایەکی تازە بگرێ. پیاوانی نێوداری دەپەرست، شانازی بە ناسینیانەوە دەکرد و بەدرێژایی شەو خەوی پێوە دەدین. بەهیچ جۆرێ دڵی دانەدەکەوت و تینوێتی نەدەشکا.

تاقمێکی کۆن دەکرد و تاقمێکی تازەی دەگرت، زوو بە زوو لەگەڵتازەکاندا رادەهات و خوی پێوە دەگرتن، زۆری نەدەبرد ئەوانیشی لەبەر چاو دەکەوت و بەهەڵە داوان بەدووی تازەتردا دەگەڕا.

سەعات «٥» لە ماڵەوە لەگەڵ شووەکەیدا نانی دەخوارد. گەلێک لە هۆش و گۆش و ڕەوشت جوانی مێردەکەی ڕازی بوو.

لەسەر کورسییەکەی خۆی هەڵدەستا، پڕی دەدایە مێردەکەی، سەری لەباوەش دەگرت و ماچ بارانی دەکرد! «دیموف تۆ چەند پیاوێکی بە هۆش و شەریفی تەنیا یەک عەیبت هەیە، ئەویش ئەوەیە کە زەوقی هونەریت نی یە.موسیقا و نیگارکێشی بە هیچ نازانی.»

شووەکەی بە خۆشەویستی یەوە وەڵامی دەدایەوە: «من شارەزای موسیقاو نیگارکێشی نیم. من هەموو تەمەنم لە خوێندنی زانست و پزیشکگەریدا بەسەر بردووە، کاتێ خوێندنەوەی هونەرم نەبووە.»

– دیموف ئەم ئیعترافە خەتەرە!

– بۆ خەتەرە؟ خۆ دۆستەکانی تۆش چ زانیارییەکیان لەمەڕ زانست و پزیشکگەری نی یە، کە چی تۆ لۆمەیان ناکەی، هەر کەسەو بەکاری خۆی! من سەر لە ئۆپراو تابلۆیان دەرناکەم. بەڵام لام وایە کە:–

خەڵکانی بەهرەمەند ژیانی خۆ بۆ ئەم جۆرەشتانە تەرخان دەکەن و خەڵکانێکی ئاقل و هۆشیاریش پارەیەکی زۆر بەم شتانە دەدەن، کەواتە دەبێ هونەر شتێکی زەروری و پێویست و بەسوود بێ. بەڵام چبکەم من تێ ناگەم. دیارە تێ نەگەیشتن لە شتێک منانای ئەوەنی یە کە بەهیچی نەزانی.

– دەستی شەریفت بێنە با بیگوشم.

ئولگا پاش فراڤین دەچووە نک دۆستەکانی. پاشان دەچووە شانۆگەری یا ئاهەنگی موسیقاو پاش نیوەشەو دەگەڕایەوە ماڵێ. ئەمەکارو پیشەی هەموو ڕۆژێکی بوو.

ڕۆژانی چوارشەممە، نۆرە دەعوەتی شێو بوو. وەرق بازی قەدەغەبوو. خانە خوێ ومیوانان تێکرا باسی هونەریان دەکرد. ئەکتەر پارچەیەکی لەبەر تەمسیل دەکرد، دەنگبێژ گۆرانی خۆی دەچڕی.

نیگارکێشان تابلۆیان لەنێو ئەلبومە زۆرو زەبەندەکانی ئولگا دەکێشا. خانە خوێ بەخۆیشی نیگاری دەکێشا، دەبوو بەمۆدێل، یارمەتی مۆسیقازانەکانی دەدا گۆرانی دەگوت، لەپاڵ ئەم کارە هونەرییانەوە، باسی کتێبانی تازە، شانۆگەری و هونەریان دەکرد، لەم میواندارییانەدا ژنان دەعوەت نەدەکران، چونکە ئولگا– جگەلە خانمانی هونەرمەندو خەیات– حەزی لەچارەی ژنانی دی نەبوو. کەزەنگی دەرگا لێدەدرا



خانەخوێ ڕادەپەڕی و بەشانازی یەوە هاواری دەکرد: «خۆیەتی» و مەبەستی نێودارێکی تازە بوو کە بۆ یەکەمجار دەعوەتی کردبوو! دیموف بەشداری ئەم کۆڕانەی نەدەکرد. بەڵام دەوروبەری سەعات یازدەو نیو دەرگەی ژووری نان خواردن دەکەوتە سەرپشت، دیموف بەزەردەخەنەیەکی گەرمەوە بەدیار دەکەوت، دەستی پێکا دەماڵین و دەیگوت: «برادەران فەرموون شیو حازرە».

لەم کاتەدا هەموو ڕوویان دەکردە ژووری نان خواردن و هەمیشە هەمان شتەکانی پێشتریان لەبەردەم خۆدا دەبینی: قاپێک سەدەف، پارچەیەک گۆشتی بەراز یا گوێرەکە، پەنیر، خاویار، کارگ، فۆدگا و دوو شەربە ئاو.

ئولگا بەکەیفی سازو زەوقی کۆکەوە دەستی تەکان دەداو هاواریدەکرد: «میوانداری ئازیزم! بەڕاستی تۆ شایانی پەرستنی! کوڕینە ئێوە بڕواننە نێوچەوانی. دیموف ڕوویان تێ بکە. برادەران تەماشای بکەن، دەموچاوی دەڵێ ی دەموچاوی پڵنگە. بەڵام هەمان دڵگیری و جوانی دەموچاوی ئاسکی هەیە، ئازیزەکەم»

میوانەکان ژەمبردە ئاساشانیان لە نان خواردن قایم دەکردو دیقەتی دیموفیان دەدا، بەڵام هەر زوو فەرامۆشیان دەکردەوەو بایان دەداوە سەر باسی شانۆگەری، موسیقا و هونەر.

ئەم دوو گەنجە تەباو گونجاو بوون. ژیانیان زوڵاڵ و سازگار بوو. بەڵام لە سێیەم هەفتەی مانگی هەنگویندا پەڵە هەورێک بەئاسمانی ژیانیانداتێ پەڕی، دیموف لەخەستەخانە کەوت وقژە جوانەکەی هاتە تراشین. ئۆلگا بەدیاری یەوە دانیشت، بەکوڵ گریا. وەختێ ڕووی کردە چاک بوونەوە یەشماغێکی سپی لەسەر بەست و وەکو عەرەبی خیوەت نشینی لێکردو پۆرترێتێکی بۆ کێشاو هەردووکیان خۆشحال بوون.

دیموف چوەوە سەر دەوامی خوێ. پاش سێ ڕۆژان بەد بەختی یەکی دی ڕووی تێکردن. کەدانیشتنە سەر نیوە ڕۆژەگوتی: «نازەپێ دەچی بەخت پشتی تێکردبێن. ئەمڕۆ ٣–٤ عەمەلیاتم هەبوو، دوو قامکی خۆم بڕی، ئائێستا پێم زانیوە. ئولگا ترسا، بەڵام پێکەنی. ئەمەی بە ڕووداوێکی ئاسایی وەرگرت وگوتی کە زۆر جاری دیکەش دەستی خۆی بڕیوە. ئەوجا لەسەری ڕۆیی: «کەدەکەومەئیشکردن ئاگام لەخۆ نامێنێ.»

ئۆلگا خەمی ئەوەی بوو کەبرینەکانی پەنجەی کێم بکەن و لێ ی پێس بکەن،

شەوێ دوعای بۆکرد. بەڵام برینەکانی دیموف چاک بوونەوە. ژیانی شادو بەختەوەریان بێ گرێ دەرۆیی. ئیستایان خۆش بو، بەهاریش بەڕێوەبوو. بەهار ڕۆژ بەرۆژ نزیک دەبۆوە. سەرەتاتکی ی دەکردو مژدەی هەزاران خۆشی و شادی دەدا. مزگینی شادمانی بێ سنوری دەدانێ. سێ مانگەی بەهار لەشار وەدەردەکەون و بەگەڕان وسەیران، خۆیندنەوەو لەگەڵ ئاوازی بولبولان دا دەیبەنەسەر. لەمانگی شەشەوە تاکو پایز سەیران و موتالای هونەری لەکەناری روباری ڤۆلگادا ئەنجام دەدرێ. ئۆلگا وەکوئەندامی ئەنجومەنی هونەر مەندان لەم موتالا هونەریانەدا بەشداری دەکات. ئۆلگا دوو دەست جلی چیتی گران قیمەتی دایەدرون، بۆیە وفلچەو ئەلبوم قەرەوێڵەیەکی سەفەری پەیدا کرد. ریابوسکی هەموو رۆژێ دەهات تابزانی کەکاری نیگارکێشی ئۆلگا گەییوەتە کوێ، کەئۆلگا کارەهونەریکانی خۆی نیشان دەدا، ریابوسکی دەستەکانی دەتەپاندنە گیرفانی، لێوی هەڵدەقوڕتاند ودەکەوتە پڕتە و بۆڵە :« ئاوا!... ئەم هەورانە زەوقیان تێدا نییەو ئەم روناکی یە گونجاو نی یە.

زەمینەکەی پچر پچرە تێ دەگەی... کەوێڵەکە گرمۆڵە بووە، دەبێ ئەو سوچەی تاریکتر بێ. بەڵام بەگشتی خراپ نیە.پەسەندی دەکەم.» هەرچەند قسەکانی ریابوسکی ئاڵۆزتر ونامەفهوم تردەبوو، ئۆلگا باشترتێیان دەگەیی.

## ٣

پاش فراڤینی ڕۆژی دووەمی هەفتەی سێیەم، دیموف کەمێ خواردەمەنی و شیرینی کڕی، سواری قیتار بوو کەبڕوا بۆڤیلاکەیان. دوو هەفتەی تەواوبوو کەژنەکەی نەدیتبوو، زۆری بیردەکرد. کەدابەزی بەپییان وەنیوجەنگەڵە گەورەکە کەوت، بەدەم ڕێگاوە هەستی بە برسێتی وماندوێتی کرد، دڵخۆشی خۆی بەوە دەدایەوە کەئیوارێ لەگەڵ ژنەکەی نان دەخواو تێر تیر دەخەوێ. کەدەیڕوانی یە پریاسکە پڕەکەی ودەستی بە بەستە خاویارو پەنیرو ماسی یە سپی یەکاندا دێنا، خۆشی و شادی بەسەردا دەباری.

بەرلەوەی بگاتە ڤیلاکە خۆرئاوا ببو، نۆکەرە پیرەکەگوتی کەخانم لەماڵێ نی یە، بەڵام زوو دەگەڕێتەوە، هەمان ڤێلای نارێک وپێک بوو، دیوارەکانی نزم، بەکاغەزی نووسین داپوشرابوون، سێ ژووری تێدا بوو. ژورێکیان سیسەمێکی تێدابوو.



ژووری دووەم ئەلبوم و فلچەی دان، فلّچە، کاغەزی پیس وجل و شەپقەی پیاوانەی تێدا بوو کەبەنارێکی لێرەو لەوێ، لەنێو دەرگاو پەنجەرەکاندا توڕ درابوون.دیموف سێ پیاوی بێگانەی لەژووری سێیەمدا بینی، دوانیان ریشن و رەشتاڵە بوون وسێیەمیان کەدیار بوو ئەکتەرە، زەلامێکی کەتەی ردێن تاشراوبوو، کابرای ئەکتەر بەدەنگێکی گڕ پرسی: چت گەرەکە؟

مۆڕەیەکی لەدیموف کردو لەسەری رۆیی:«ئولگات گەرەکە هەنووکە دێتەوە.».

دیموف بەدەم چاوەروانی یەوە ڕۆنیشت. یەکێک لەپیاوە رەشتاڵەکان بەساردی یەوە نۆڕی یە دیموف وگوتی چای دەخۆی؟» پەرداخەکەی خۆی پڕ کرد.

دیموف حەزی دەکرد هەم شتێ بخواوهەم شتێکیش بخواتەوە؛ بەڵام دەترسا ئیشتیهای بتۆرێ؛ بۆیە چایەکەی نەویست. پاش تۆزێ دەنگی هەنگاوو پێکەنینێکی ئاشنای هاتەگوێ. دەرگا کرایەوە، ئۆلگا بەشەپقەیەکی زلەوە وەژوور کەوت. زەمیلەیەکی بەدەستەوە بوو. ریابوسکی لە دوای ئەوەوە بەگۆنای ئالەوە،چەترێ بەدەستێکییەوە وکورسییەکی سەفەری بە دەستەکەی دی یەوە، بەشادی وپێکەنینەوە وەژوور کەوت.

ئۆلگا ئیڤانوڤنا، لەخۆشی و شادیا سورهەڵگەڕاو هاواری کرد:«دیموف» هەردوو دەستی خستنە سەر شانی دیموف، سەری بەسینکی یەوە ناوگوتی،«ئەمەتۆی؟ ئەدی بۆ زووتر نەهاتی؟ ئاخر بۆ؟ دیموف گوتی:« نەم پەرژا نازێ، دایمەسەرم قاڵە و کەلەئیش دەبمەوە ئیدی فریای قیتار ناکەوم تا بێم.»ئۆلگا گوتی:«زۆر زۆر بەخێرهاتی. مەگەر خوا بزانێ چەندم پێ خۆشە! خەونم پێوە دەدی. دونێ شەو تا بەیانی هەر بیرم لای تۆ بووە. خۆزگە دەتزانی چەندم خۆش دەوێی وچەند لەکاتی خۆیدا هاتی! بەراستی تۆ رزگارکەی منی. سبەی زەماوەنێکی خۆشمان بەدەستەوەیە...» بەپێکەنینەوە بۆینباخەکەی بۆ شووەکەی رێک خستەوەو لەسەری رۆیی:«کورێکی تەلەگرافچی گەنج کە نێوی چیکالایفە و لەوێستگادا کار دەکا دەیەوێ ژن بێنێ، کوڕێکی چاکە، هەر لەخۆیەوە دەچێتە دڵەوە،کابرایەکی ئیسک سووک و خۆشەویستە... زۆری یارمەتی داوین و چەندین جار لەبەردەممانا دانیشتووەو بووە بە مۆدێل تا پۆرترێتی روسیای کۆنی لەسەر بکێشین. هەموومان خۆشمان دەوێ و قەولمان داوەتێ کە بچینە زەماوندەکەی... کوڕێکی دەستکورت بێکەس و کارو هەندێ شەرمنە، گوناحە ئەگەر نەچینە زەماوەنەکەی و لەقسەی خۆ ژێوان بینەوە.. پاش تەواو بوونی مەراسیمی کلێسا، شاییەکە دەست پێدەکات.

هەمـوو دەچنە مـاڵی بووکێ.. تێ دەگەی حەیاتم.. لەوێندەر. لەلێرەواران.. لەنێـو ئاوازی پڕ خرۆشی باڵندان لەنێو سەوزە جاڕی هەتاو لەئامێز گرتوو، بەخۆشمـان چەشنی پەڵەی رەنگاو رەنگی سەوز و جـوان.. شـتێکی یەکجار جوان و تازەیە، کوت ومت بەشێوەی نیگارکێشانی ئیمپرسیونیستی فەرەنسایی، بەڵام دیموف گیان من چ لەبەر بکەم؟ جل و بەرگم لەگـەڵ خـۆدا نەهێناوە. هەرهیـچم پێ نی یە؛. نەجلێ، نەگوڵێ،نەدستکێشێ!.. مەگەر هەرتۆ فریام بکەوی. هاتنی تۆ لەم کاتەدا نیشانەی بەختیاری منە. ئەمەش کلیلەکانە حەیاتم! هەر ئێستا سواری قیتار بەو خۆت بگەیەنە ماڵ و جلە سورەکانم لەنێوکەنتۆڕەکە دەربێنەو لەگەڵ خۆتا بیهێنە. دەزانی کامە دەڵێم؟ لەیەکەم خانەی کەنتۆرەکەیە، پاشان چەکمەجەی خانەی دواوە راکێشە، دوو جانتای تێدایە، هەندێ ئۆبە وشڕە و پڕە لەسەر جانتاکانە ئەوانە نا، لەژێر جانتاکاندا گوڵ هەیە، هەموو گوڵەکان لەگەڵ خۆت بێنە!...شتاقیانت بیر نەچێ!... چونکە نازانم کامیـان بەکار دێنم.. کەهێناتن لێرە لێیان هەڵدەبژێرم. جوتێ دەستکێشیشم بۆ بکڕە».

دیموف گوتی: «زۆر چاکە سبەی دەچم دەیانهێنم»

ئولگا گـوتی:« سبـەی چی؟» وورد وورد دیموفی بەنیگا دابێـژت و لەسـەری رۆیی:« سبەی فریا ناکەوی. چونکە یەکەم قیتار سەعات نۆ دەردەچێت و شاییەکە سەعات یازدە دەست پێدەکات، ئەوشەو بڕۆ حەیاتم! ئەگەر زانیت سبەی ناتوانی بگەڕێیتەوە ئەوا بە یەکێکا بینێرە. دەی خێراکە، نەوەک فریای قیتارەکە نەکەوی حەیاتم.»

– بەچاوان.

– چەندم پێ ناخۆشە کەدەت نێرمەوە. بلێ بۆ وەکو شێت قەولم بەتەلەگرافچی یەکەدا کەبچمە داوەتەکەی؟ وفرمێسک لە چاوانی قەتیس ما.

دیموف بەپەلە چایەکی هەڵقـوڕاند. بەرووخـۆشی و رەزامـەندی یەوە بەرەو وێستگاکە گەڕایەوە. ئەوخواردنو پەنیرو ماسییانە»ی هێنابوونی بوون بەقسمەتی کابرای ئەکتەر و دوو زەلامە رەشتاڵەکەی کە وەکو ژەمبردە بەپەلە خواردیان.

## ٤

شەوێکی هەیڤەشەوی کپ و خۆشی مـانگی شەش بوو. ئولگا لەسەر کەشتی



یەکەی نێو رووباری ڤۆلگا ڕاوەستابوو. جارێ دەیڕوانی یە رووبارەکە و جارێ سەیری کەنارە دلگیر و جوانەکانی ڤولگای دەکرد.

ریابوسکی لە تەنیشتی وێستابوو ودڵنیای دەکرد کە:«ئەم سێبەرانە سێبەری تاری ئاوەکە نین.بەڵکو خەوو خەیاڵن. ئەمرووبارە ئەفسوناوی یە بریقەدارە، ئەم ئاسمانە بێ پایانە، ئەم کەنارە چاو بەگریانە.هەموو دەڵێ ی لەتاو بێهودەیی ژیان دەناڵێنن. هەمـوو دەربارەی بوونەوەرێکی باڵاترو بەهێـزتر، دەربارەی شـتێکی سەرمەدی نەمر دەدوێن و بەرەو مەرگ گازمان دەکەن. رابووردو چ نی یە، ئایندەش بێ مەعنایە.

ئەم شەوە پڕ رازە، ئەم تەنیا شەوەی تەمەنیش بە زوویی تێ دەپەڕێ و ئالکاوی ئەبەدییەت دەبێ، کەواتە بۆچی بژین؟»

ئۆلگا گوێی رادەدێرا. هەوەڵجار گوێ ی بۆ ریابوسیکی گرت و پاشان بۆ کڕو کپی شەو. وای هاتە بەرچاو کەهەرگیز نامرێ رەنگی وەنەوشەیی ڤۆڵگا، ئەو رەنگەی کەلەژیانیا نەی دیتبوو، ئاسمان، کەنارەکان، سێبەرە تاریکەکان و ئەو خۆشییە سەیرەی کە دڵی پڕ کردبوو، هەر هەموو ئەمانە بەگوێیاندا دەچپاندکەرۆژێ لە رۆژان دەبێ بەکەڵەنیگارکێش و شانازی و شۆرەت و خۆشەویستی ژیان لە هەمو شوێنی چاوەڕوانین؛ لەشوێنانی دوور، لەپشت شەوانی هەیڤە شەو، لەهەموو دنیا چاوەروانیین وەختـتی بە تاسـەوە چاوی خـەیالی بری یە ئایندەی دوور، ئاپورای خەڵک، روناکی و تیشکی گلۆپان، موسیقای غەمگین و هاواری شادی و لەزەتی هێنایە بەر چاوی خۆی، خۆی لە جلێکی سپی دا بینی کەهەرچوار دەوری هەر گوڵەو گوڵ. خەڵکی بێ ئختیـار بەرەو پیری دێن. قەناعەتی تەواوی لا پەیدا بوو کە هەنووکەش پیاوێکی بەراستی گەورە، بلیمەت، هەڵبژاردەی خوای لەلاوە وێستاوە. پیاوێک کەحاڵی حازر، خاوەنی گەلێ کاری جوان ونائاساییە و ئەگەر عەمر باقی بێ و تەمەن مەودا باو درەختی بەهرەی شکۆفە بکاو گوڵ بگرێ ئەوا شۆرەتی دنیا دەگرێ. ئەمە لەنێو چەوانی نووسراوەو بەراشکاوی لەسیمای دا دیارە، ئەو باسی سێبەر، رەنگی شەو، هەیڤە شەو دەکاو نازانی کە بەهرەی وی، وەستایی و دەسەڵاتی رازئامێزی ئەو سنووری سروشتی بەزاندووە. ئەوبابایەکی قۆزە، ژیانی وەکو ژیانی باڵندەیەکی ئازادی بێ پەروا وایەو لە ووردە شتەکانی ژیان بێگانەو نامۆیە ئولگا بەدەم موچرکەیەکەوە گوتی:«خەریکە ساردی دەکا.»

ریابوسکی، پاڵتۆکەی بۆ کردەوە، رایکێشایە ژێر پاڵتۆکەی وبەسۆزێکی گریان

ئامێزەوە گوتی

– خۆم لە تۆدا دەبینم، بەندەی تۆم، بۆچی ئەوشۆ هێندە جوان و دلڕفێن بووی؟

نیگایەکی سەیری کرد، چاوانی هەندە بەسام بوون کە ئۆلگا نەیورا سەیری بکا. گەرمی هەناسەی ختوکەی گۆنای ئولگای دەدا، بەگویی دا چپاند :«خۆشم دەوێ ی، بۆت شێت بووم. تەنیا قسەیەک بکە، تاقە قسەیەکو چیدیم ناوێ، ژیانم ناوێ.. تەنانەت هونەرەکەشم ناوێ»..

بەوپەڕی غەمگینی یەوە هاواری کرد:«خۆشت بۆێم، خۆشت بوێم.»

ئۆلگا گوتی :«واز لەم قسانە بێنە، ئەم قسانە خەتەرن، ئەدی دیموف؟» ئەوجا چاوەکانی نوقاندن.

–دیموف دەکاتە کێ؟ من هەقم چی یە بەسەر ئەوەوە؟ ڤولگا، جوانی، ئەشقی خۆم، ئەوحاڵەی لێم هاتووە... ئەمانەشتێ.. دیموف هەرنەبووەو نابێ... ئاخ، من ئەمە نازانم، رابوردووم ناوێ، تەنیا یەک ساتم پێ ببەخشە... یەک دەقیقە.

دڵی ئولگا بەتوندی کەوتە لێدان، هەوڵی دا بیر لەشووەکەی بکاتەوە. بەڵام هەموو رابوردووی خۆی، شوکردنەکەی، دیموف، تەنانەت میوانداری و شەوکۆڕیش بێ بایەخ، قێزەوەر، بێ فایدەو بێ مەعنا هاتنەبەرچاوی. لەراستیشا... دیموف دەیکردەکێ؟

ئەو چ پێوەندییەکێ بەدیموفەوە هەبوو؟ ئایا بەراستی دیموف هەبوو یاتەنیا خەون و خەیاڵ بوو؟

چاوی نوقاندن و لەفکران ڕاچوو: «ئەم پیاوە ئاساییە بەشی خۆی و بگرە زیاتریش رای بواردووە.» و:«نەفرەتم دەکەن، لۆمەم دەکەن بابیکەن، من هەموو لەزەتێک دەچێژم و بلا پاشان بمرم، تۆزم نەمێنێ. ئا دەی چێژم و ئەوجا دەمرم..ئێمە دەبێ هەموو لایەنێکی ژیان بجرپێنین. خوایە چەند بەئازارو لەعەینی کاتدا بەلەزەتە!»

ریابوسکی باسکی لەقەدی ئالآند، وەکو تامەزرۆ کەوتە ماچکردنی دەستی ئولگا. ویستی دەستی لابەرێ.

ریابوسکی گوتی:«باشەتەگبیر؟ چ بکەم؟ خوشت دەوێم؟ بەلێ؟ چ شەوێک، چ شەوێکی خواییە!» ئولگا کەوتە وورتە وورت:«شەو ئەمماشەو!» روانی یە چاوانی فرمێسک تێ زاوی ریابوسکی، ئەوجا بەهەر چوار دەورا هەڵی روانی، باسکی لەملی وەرینا تا خوا هێزی دابوبێ لێوی مژی، دەنگێک لەوسەری کەشتی یەکەوە



گوتی:گەییوینەتە نزیکی کنیشما.

دەنگی هەنگاوی سست و خاو لەپشتیانەوە دەهات، فەراشێک لە بارەکەوە وەدەرکەوت، ئولگا لە کەیفان هەم پێ دەکەنی و هەم دەگریا. پڕ بەزاری هاورای کرد: «ئەهای... شەرابمان بۆ بێنە».

ریابوسکی، شڵەژاو و رەنگ پەڕیو لەسەر کەرەویتەیەک رۆنیشت و مەمنون ومنەتبار کەوتە روانینی ئولگا. بەڵام پاش کەمێک، چاوی نوقاند، بزەیەک لەسەر لێوی تاساو وگوتی: «ماندووم» و سەری نا بەقەراخی کەشتی یەکەوە.

## ٥

ڕۆژی دووەمی مانگی نۆ بوو. دنیا گەرم و بای نەدەهات. هەر لەبەیانی زووەوە تەنکە تەمێک سەری روباری ڤۆڵگای گرتبو. سەعات نۆی بەیانی باران دایگرد، پێ نەدەچوو وا زوو خۆش بکاتەوە.

ریابوسکی بەدەم قاوەڵتی یەوە بە ئولگای گوت کە نیگارکێشی قۆڕترین هونەرە، هەروەها گوتی من نیگارکێش نیم و خەڵکانێکی گێل و گەوج وا دەزانن هونەرمەندم و بەهرەیەکم هەیە. ئەوجا دەستی دایە کێردێک و باشترین سکێچی خۆی دادڕی. پاش تاشت خواردن عەینی کوند مۆنی کردو لەبەر پەنچەرەکە هەڵکورماو چاوی بڕی یە رووبارەکە، گەییە ئەو قەناعەتەی کە ڤۆڵگا چ نی یە، بێ تام و ئالۆز و سارد و سڕە. هەموو شوێنێکی ئەو ناوە دەتگوت باسی گرژ و مۆنی پایز و نزیک بوونەوەی دەکا. وا دەهاتە بەرچاوی کە مافوری دڵگیری کەنارەکان، بریسک وهۆڕی ئەڵماس ئاسای ئاو، ئاسمانی ساماڵ وشین وبێگەرد، هەموو شکۆ و جوانی سروشتی لە ڤۆڵگا ساندۆتەوەو لە قاسەیەکی ناوە بۆ بەهار. ئەو قەل و داڵانەی کە بەسەر روبارەکەدا دەفڕین دەتگوت گەمەی پێ دەکەن.

ریابوسکی گوێی بۆ دەنگی قەلەکان رادێرا، ماندوو و وەرەزو بێ تاقەت سەری داخست ولەفکران راچوو. هەموو کارێکی ئەم دنیایەی بەگەوجانەزانی، گلەیی لە خۆی کرد کە نەدەبوو خۆی بەم ژنەوە هەڵواسێ وبێ بەسەربار. بەکورتی ریابوسکی غەمگین وبێ کەیف بوو.

ئولگا لەسەر قەرەوێلەیەک کە لە پشت پەردەیەکەوە بوو، رۆنیشتبوو، دەستی بەقژە جوانەکەیدا دێنا. ماڵەکەی خۆی دێناوە بەرچاو: ژووری میوان، ژووری

نووستن و پاشان نووسینگەی مێردەکەی. خەیاڵ وورده وورده هەڵیگرت و بردی بۆ شانۆگەری، خەیاتخانە ولای دۆستەکانی. ئاخۆ نووکە دیموف لە چ حاڵێکایە؟ بیری ئولگا دەکا؟ بیری ئولگا دەکا؟ دیموف ی ئازیز بە چ سۆزو تا سەو پاڕانەوەیەکی مناڵانەوە لە نامەکانیا لەم دەپاڕایەوە کە بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ؟ مانگانە ٧٥ رۆبلی بۆ ئۆلگا دەنارد.

کە ئولگا بۆی نووسی سەد رۆبلی لە نیگارکێشەکان قەرز کردووە یەکسەر سەد رۆبلەکەشی بۆ نارد. چ پیاوێکی باشە، چەند دڵاواو بەخشندەیە! ئولگا تەواو لە گەشت وگوزاری هونەری بێزار ببوو، خودا خودای بوو زووتر لە دەستی دێهاتیان، لە دەستی رووبار، لە دەستی ئەم سەرگەردانی یە هەڵێ و ڕزگاری بێ. ئەگەر ریابوسکی قەولی بە ئەندامانی ئەنجومەنی هونەری نەدابا کە تا بیستەمی مانگی نۆ دەمێننەوە هەنووکە هەموو دەڕۆیشتنەوە. خۆزی قەولی نەدابا و هەنووکە ڕۆیشتبانەوە!

ریابوسکی بێزارو بێ تاقەت گوتی: «خوایە چ بکەم، تۆ بڵێ ی هەتاو دەرنەکەوێ بەبێ هەتاو چ دیمەنێکم بۆ ناکێشرێ!» ئولگا لە پشت پەردەکەوە وەدەرکەوت و گوتی: «بیرتە هادیمەنێکت کێشابوو کە هەوری بە سەرەوە بوو، ئەوە کەی لای راستی درەخت و لای چەپی مەڕومالات بوو؟ ئەو دیمەنە تەواو بکە».

ریابوسکی رووی گرژ کرد: «چی؟ تەواوی بکەم، پێت وایە هێندە گەوجم کە نەزانم چی بکەم!» ئولگا گوتی: «ئەوەندە» دەزانم بەرانبەر بە من گۆڕاوی» و ئاهێکی هەڵکێشا. «ئەوەندە دەزانم بەرانبەر بە من گۆڕاوی» وئاهێکی هەڵکێشا.

– بەڵێ. ئەم قسەیە دروستە.

ئولگا کەوتە لەرزین، چوو بەلای سوپاکەوەو دەستی بەگریان کرد.

– هەر لە گریانمان کەم بوو! بەسە بیبڕەوە! گریان بۆ من باشە کەچی ناشگریم.

ئولگا هاواری کرد: «بۆ تۆ باشە ها! ئەزانم هۆیەکەی ئەوەیە کە لەمن وەڕەز بووی» و بەدەم گریانەوە لەسەری رۆیی: «با رێک وراست لە مستتی نیم کە تۆ شەرمەزاری ئەوەی کە ئاشقی من بووی، دەتەوێ ئەم ئەشقە وەشێری و کەس پێی نەزانێ بەڵام تازە کار لە کار ترازاوەو لە مێژە هەموو دەیزانن».

ریابوسکی کەوتە پاڕانەوە: «ئولگا تکات لێدەکەم، من تاقە یەک شتم لە تۆ گەرەکە» و هەردوو گوێی گرت و بەردەوام بوو: «تەنیا یەک شتم لە تۆ دەوێ، شەرمەزارم مەکە، لە دینم دەرمەکە، لەمەی پتر چ شتێکی دیم لە تۆ ناوێ».



– دەباشە سوێندم بۆ بخۆ کە هێشتا خۆشت دەوێم.

ریابوسکی دانەکانی ریچ کردنەوە: «ئا ئەمە پیاو دەکوژێ» و لەجێ ی خۆی راپەڕی: «وام لێدەکا بڕۆم خۆم بخەمە رووبارەکەوە یان شێت ببم و بدەمە کێوان، وازم لێ بێنە!»

ئولگا هاواری کرد: «کەواتە وەرە بمکوژە، بمکوژە، بمکوژە، بمکوژە». چووە پشت پەردەکەوە، خۆی دا بەسەر قەرەوێڵەکەداو دەستی بەگریان کردەوە.

لەسەربانی کوختەکەوە دەنگی باران دەهات. ریابوسکی سەری خستبووە نێو هەردوو دەستی و بەنێو کوختەکەدا دەهات و دەچوو. پاشان وەکو یەکێک لێبڕابێ شتێک بسەلمێنێ، شەپقەکەی کردە سەری، تفەنگەکەی هەڵگرت و لە کوختەکە وەدەرکەوت.

کە ریابوسکی رۆیی، ئولگا لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشت و تاتوانی گریا، بیری لەوە کردەوە هەندێ ژەهر بخوا تا ریابوسکی بەسەر جەنازەی سارد و سڕیا بێتەوە. بەڵام زوو بەزوو خەیاڵ فریای کەوت: ژووری میوان و نووسینگەی مێردەکەی هێنانەوە بەرچاو. هەستی کرد هێمن وئارام لە پاڵ دیموف دانیشتووە، ئیسراحەت و پاکو خاوێن لە هیچی کەم نی یە. ئەو شەوانەی بیر کەوتەوە کە گوێ ی لە موسیقا دەگرت. ئارەزووی ژیارو شارستان و خەڵکانی نێوداری شار باڵی بەسەریا کێشا.ژنە دێهاتی یەک وەژوور کەوت و بەو پەڕی بێ تاقەتی یەوە سۆپاکەی بۆ فراقین لێنان ئامادەکرد. دووکەڵ و تەنی ژوورەکەی تەنی بوو، پاشان چەند نیگارکێشێک بە پێڵاوی قوڕاوییەوە وەژوور کەوتن. باران سەروگوێلاکی تەڕ کردبوون، روانیانە تابلۆ و وێنەکان و دڵخۆشی خۆیان بەم قسەیە دایەوە کە رووباری ڤۆڵگا لە رۆژانی بارانیشا جوانی ی تایبەتی خۆی هەیە. سەعاتە چاڵمە هەرزان بایبیەکە هەر چرکە چرکی بوو. پێشکەی سەرما بردەڵە لە دەورو بەری سۆپاکە خڕ ببوونەوەو ویزە ویزیان بوو. سیسرکان بە بن تەختەکاندا فرکان فڕکانیان بوو.

ریابوسکی ئێوارێ گەڕایەوە. کڵاوەکەی توڕ دایە سەر مێزەکە، رەنگو رووسیسەڵە، شەکەت و قوڕاوی خۆی دا بەسەر کەرەوێتەیەکداو چاوی نوقاند. چارەی بەیەکاداو گوتی: «ماندووم». ویستی چاوی هەڵێنێ. ئولگا ئاشت ببۆوەو چی لە دڵا نەمابوو، بۆ وەی ئەمە بسەلمێنێ و خۆشەویستی خۆی بۆ بنوێنێ، هاتە بەرەوەو بە ئەسپایی ماچی کردو کەوتە دەست هێنان بەقژە زەردو لوولەکەیدا.

ریابوسکی وەکو یەکێک شتێکی ساردی بەرکەوتبێ، راچڵەکی، چاوی هەڵێناو

گوتی: «چ دەکەی؟ وازم لێ بێنە، توبی خوا دەست بەردارم بە».

بە هەر دووک دەستــان ئولگای دایە دواوە، سـیـمـای تورەو دڵی تۆرا بوو. ژنە دێهاتی یەکە قاپێ شۆربای هێنا و لەبەردەمیادا اینا. قامکە پیسەکانی لە شۆرباکە راچوو بوو، ریابوسکی بە تاسوقەوە کەوتە خواردنی. ئولگا دڵی لە هەموو شتێک تێک هەڵدەهات، لە ژنە وورگ زلەکە، لە قامکە پیسـەکانی، لە کوختـەکە کە هەوەڵجار زۆری بەلاوە دڵگیر و شاعیرانە بوو. بەساردیەوە گوتی:

– ئیمە دەبێ بۆ ماوەیەک لێکدی دوور بکەوینەوە. دەنا هەر ئەمە حاڵمان دەبێ و لەخـۆڕایی شـەڕ بە یەکـدی دەفرۆشین و هۆیەکـەی ماندویەتی یە. من تەواو بێ تاقەت بووم و ئەورۆ دەڕۆم..

– دەڕۆی؟ بەکەشتی دەڕۆی؟

– ئەو رۆ پێنج شەمەیە و سەعات نۆ و نیو کەشتی یەک دێ.

– «جا لەوە باشتر دەبێ، جێ ی خۆیەتی، زۆر چاکە بڕۆ». ریابوسکی بەنەرمی ئەمەی گوت و داوای خاولی یەکی کرد بۆ سفرە سڕین و گوتی: «ئێرە بە کەڵکی تۆ نایەت، چ کارێک نی یە بیکەی. کوڕم دەوێ بتوانێ دڵی تۆ ڕابگرێ، دوای بیستی مانگی نۆ یەکدی دەبینن.

ئولگا بەخۆشی یەوە جلەکانی خستە جانتاکەیەوە، گۆناکانی لە شادیا سور هەڵگەڕان، لە دڵی خۆیا دەیگوت: «تۆ بڵێی ئەو ساتە بێ؟ تۆ بڵێی بەم زووانە بگەمەوە ژووری میـوان، بێ خەم لێ ی دانیشم و نیگارکێشی بکەم، لەسەر سیسەمێکی رێک و پێک و ماقوڵ بخەوم و دانیشمە سەر سفرەی پاکو خاوێن و تێرو پڕ بخۆم؟» کەمێک دڵی فێنک بۆوە، رقەکەی نیشتەوە،رووی کردە ریابوسکی و گوتی:

«ریابوشا، بۆیەو فلچەکان بۆ تۆ بەجێ دێڵم، ئاگادار بە تەمبەڵی نەتگرێ، هەموویان لەگەڵ خۆت بێنەوە. کەمن رۆیشتم خەم دات نەگرێ و دەستە وئەژنۆ دانیشی، ئیش بکە، باشە روحەکەم!»

ریابوسکی، سەعات دە خواحافیزی لێکردو لەبەر دەرگای کوختەکە دا ماچی کرد، ئولگا بەخۆی دەیزانی بۆیە لەوێندەر ماچی کرد، چونکە نەیدەویست لەکانارەکەداو لەبەر چاوی خەڵکی ماچی بکا.

کەشتییەکە گەییە جێ ئولگا سوار بوو و کەوتە رێ. پاش دوو رۆژ و تاقێک گەییەوە ماڵێ بە هەمان کڵاو و شانێلی بارانی یەوە خۆی بەژووری میواندا کرد،



ئەوجا خۆی گیاندە ژووری نان خواردن.

لە خۆشیان هانکە هانکی پێکەوتبوو. دیموف بەتۆی کراسێک و ئێلەکێکی دوگمە دانەخراوەوە لە پشت مێزەکە دانیشتبوو و کێردێکی تیژ دەکرد. کەڵەشێرێکی سورەوەکراوی لەبەر دەما بوو. ئولگا بڕیاری دابوو هەقیقەت لە مێردەکەی بشارێتەوەوپێ ی وابوو دەرەقەتی ئەم کارە دێ و هۆش وتوانای شاردنەوەی هەیە. بەڵام هەر کە بزەی شیرین و چاوانی پرشنگدار و پڕ شادمانی دیموفی بینی هەستیکرد کە هەڵخەڵەتاندنی ئەم بابەتە پیاوە ئەستەمە، ئەو پەڕی نزمی یە و ئەم کارە هاوتای مرۆڤ کوژی، دزی و تاوانە، لەپڕ لێبڕا سەر لەبەری حەقیقەتەکە بۆ مێردەکەی بگێڕێتەوە. وەختی مێردەکەی لە هەمێزی گرت و ماچی کرد، ئولگا بە چۆکا هات، دەموچاوی لە نێو هەردوو لە پی دەستیا شاردەوە.

دیموف بە نەرمی گوتی: «نازێ ئەوە چیتە؟ ماندو بووی؟!»

ئولگا دەموچاوی لە شەرما سور هەڵگەڕاوی هەڵبڕی و وەکو تاوانباران چاوی پڕ پاڕانەوەی بڕییە دوڕ چاوی مێردەکەی، بەڵام ترس و شەرم رێیان نەدا حەقیقەتەکە بگێڕێتەوە. گوتی: «هیچم نی یە، تەنیا...» دیموف قوڵی گرت، لەسەر کورسییەکی کەنار مێزەکە داینشان و گوتی: «لێرە دانیشە، ئۆخەی کە پێک گەییینەوە! نانەکەت بخۆ، دیارە روحەکەم برسێتی».

ئولگا بە تاسەیەکی تایبەتیەوە هەوای ماڵەکەی خۆی هەڵمژی و دەستی بەنان خواردن کرد. دیموف بە حەزێکی هەڵچووەوە سەیری دەکردو بەو پەڕی شادیەوە بۆی دەگرژایەوە.

## ٦

دیموف لە ناوەندی زستاندا بۆ یەکەمجار دڵی لە ژنەکەی پیس کرد. رەفتاری گۆڕا، پێ دەچوو بە ئازارو سوێ ی ویژدانەوە بتلێتەوە. وەکو جاران راستەوخۆ نەیدەڕوانی یە چارەی ژنەکەی. کەژنەکەی دەهاتەوە وەکو جاران بەبزەی گەرم و ناسک پێشوازی نەدەکرد. بۆ وەی هەر خۆی و ژنەکەی دوو بەدوو نەکەونە ماڵەوە بەزۆری «کوستلوف»ی هاوکاری بۆ نیوە رۆژە لەگەڵ خۆدا دەهێنایەوە. کورستلوف پیاوێکی قژ کورت و دەموچاو تێک قوپاو بوو. لە حوزوری ئولگا دا هەستی بەگێژی وبیر بڵاوی دەکرد.

ئەم هەستەش بەوەدا دەردەکەوت کە ئولگای دەبینی لایەکی سمێڵی بەدەمدا دەبردو و دەکەوتە جوینی. لێکدا لێکدا دوگمەی چاکەتەکەی دەکردەوەو دای دەخست.

هەردوو دکتۆر بەدەم نیوە ڕۆژەوە قسانیان دەکرد. دەیانگوت ئەگەر حیجابی حاجز بەشێوەیەکی نائاسایی بەرزبێتەوە ئەوا دڵ هەندێ جار بێ قاعیدە لێدەدا: دەیانگوت لەم ڕۆژانەدا نەخۆشی ئەعساب زۆر بووە، هەروەها باسی دوا ئیکتشافی دیموف یان دەکرد کە لەکاتی عەمەلیاتێکا پەی پێ بردووە، ئەم عەمەلیاتە، عەمەلیاتی شێرپەنجەی گەدەببوو کە پزیشکانی دی بەهەڵە بەنەخۆشی «کەم خوێنی کوشندە» دەست نیشانیان کردبوو. دیار بوو ئەم جووتە دکتۆرە بۆیە سەبارەت بە پزیشکگەری قسانیان دەکرد تا ئولگا بێدەنگ بێ وفشە نەکا. پاش فراڤین «کورستلوف» دەچوو بەلای پیانۆکەوە و دیموف ئاخێکی هەڵدەکێشا و دەیگوت: «ئاخ، برای ئازیز شتێکی غەمگینم بۆ لێ بدە». کورستلوف شانەکانی هەڵدەتەکاند، دەستەکانی بڵاو دەکردنەوەو چەند ئاهەنگێکی لێدەداو بە دەنگی نزم گۆرانی دەچڕی «تەنیا شوێنێکمان نیشان بدە کە جوتیاری روسی تیا شاد بێ وبۆ بەختی خۆی نەناڵێنی» ودیموف ئاهێکی دی هەڵدەکێشا، سەری دەخستە نێو هەردوک دەستی و لەفکران رادەچوو. ئولگا دەمێ بوو دەستی لە خۆی بەردابوو. هەموو بەیانی یەک بەپەستی وبێزاری یەوە لەخەو ڕادەبوو، هێندەی بیر لەوە دەکردەوە کەریابوسکی چیدی خۆشی ناوێ و گۆڕاوە تا بەهیلاک دەچوو. پاشان هەر خۆی دڵخۆشی خۆی دەدایەوە کەباشتر؛ خۆشی بوێ یا نەوێ وەکو یەکەو هەموو شتێک بەنیسبەت ئەمەوە تەواو بوو.... بەڵام هەرکە قاوەکەی دەخواردەوە دیسان لەفکران ڕادەچوو، قەناعەتی بەخۆ دەکرد کەریابوسکی ئەمی لە مێردەکەی کردووە و ئێستا.

لە هەردوو دینان بووە و هی کەسیان نییە. ئەوجا قسەی یەکێک لە دۆستەکانی بیر دەکەوتەوەکە گوایە ریابوسکی سەرقاڵە و خەریکە تابلۆیەکی جوان بۆ پیشانگایەک ئامادە دەکا. ئەم تابلۆیە تێکەڵەیەکە لە دیمەن و مرۆڤ و حەیوان. لەسەر شێوازی «پلیونوف» دروست کراوە وبینەر شەیدا دەکا. کە دەگەییە ئێرە کەیفی بەوە ەدهات کە ریابوسکی ئیلهامی ئەم تابلۆیەی لەوەوە وەرگرتووەو کاری گەری ئەو نەبوایە ئەم تابلۆیەی بۆ ئەنجام نەدەدرا. ئەی ئافەرین بۆ کاریگەری ئەو. کەواتە ریابوسکی بە شێوەیەکی گشتی باشتر بووەو ئەگەر ئەو، ئەم کاریگەرییەی



نەبوایە ئەوا ریابوسکی بە تەواوی حیسابی ڕۆیی بوو. ئەوەی بیر کەوتەوە کە ئاخر جار ریابوسکی هاتبووە دیدەنی، چاکەتێکی جوانی لەبەر کردبوو، بۆینباخی تازەی بەستبوو، لە ئولگای پرسی بوو: «ئەرێ قۆزم؟» بەراستیش ریابوسکی بەجلی پۆشتەو پەرداخ، بەچاوی شین و بەقژی لوول درێژەوە قۆز بوو، یا ڕەنگە هەر لەبەر چاوی ئەو قۆز بووبێ، ئەو ڕۆژە بەگەرمی و روخۆشی یەوە چاکوچۆنی لەگەڵ ئولگا کردبوو. ئولگا دوای ئەم هەموو لێکدانەوە وحیسابکردنە، جلی لەبەر دەکردو بەکول وکەسەرێکی زۆرەوە دەچوو بۆ ڕەسمخانەکەی ریابوسکی.

ریابوسکی بەکەیف بوو. دڵی بەتابلوکەی خۆش بوو. هیوای گەورەی لە دڵ بوو. وەکوو گێلە پیاوان ڕەفتاری دەکرد و بەسوعبەت و شۆخی یەوە وەڵامی پرسیارە جدییەکانی ئولگای دەدایەوە. ئولگا بەغیلی پێ دەبرد. چاوی بەرایی نەدەدا تەماشای تابلۆ کەبکا. بۆ وەی گلەو کازاندەی نەیەتەسەر ٥ دەقیقەیەک بەدیار تابلۆکەوە وێستاو هەناسەیەکی هەڵکێشاو و لەبن لێوانەوە گوتی: «تۆ جاران بەمجۆرە کارت نەدەکرد. هەر ئەمەش بنیادەم دڵتەنگ دەکا».

ئەو ساڵە ریابوسکی دەپاڕایەوە کەخۆشی بوێ. کەوازی لێ نەیەنێ کە بەزەیی بەوگووراوە بەدبەختەدا بێتەوە! دەستی ماچ دەکرد، بەسەریا دەگریا، ناچاری دەکرد سوێندی بۆ بخوا کە هێشتا خۆشی دەوێ.

شانازی بەوەوە دەکرد کە ئەگەر وی نەبوایە ریابوسکی لەرێ دەردەچوو و بەتەواوی تیا دەچوو. بەو جۆرە هەم لە زەوقی ریابوسکی دەداو هەم خۆی سووکو سەلیم دەکرد. ئەوجا لەوێندەرەوە دەچووەکن خەیات یا دەچووە نک یەکێک لە دۆستە ئەکتەرەکانی تابلیتی شانۆگەری یەک پەیدا بکا.

جارێک ریابوسکی لە ماڵ نەببوو، کاغەزێکی بۆ نووسیبوو سوێندی خواردبوو کە ئەگەر خێرا نەیگاتێ، زەهر دەخوا. ئەویش بەترسەوە هات و نیوەڕۆش لە ماڵی ئولگا مایەوە. بێ ئەوەی چ حیسابێک بۆ مێردەکەی بکا بەو پەڕی راشکاوی یەوە قسەی لەگەڵ کرد. ئولگایش بەهەمان راشکاوی وەڵامی دایەوە. نەبێ یەکدی هەڵیان دەکردو نەبێ شەڕیش دادەنیشتن. بەو پەڕی بێ شەرمی یەوە قسانیان دەکرد.

تەنانەت کورستلوفی فەقیرۆکەش هەستی بەم رووهەڵماڵراوی و بێ شەرمی یەیان دەکرد. ریابوسکی پاش نیوە ڕۆژەوە بەپەلە خوا حافیزی کردو ڕۆیی.

ئولگا لێی پرسی: «کێوە دەچی؟» لەرارەوەکەدا وێستا و بەنەفرەتەوە سەراپای

بەنیگا دابێژت.

ریابوسکی. چارەی دا بەیەکا و نیوی ژنێکی ئاشنای برد، دیار بوو دەیویست ئولگا ئازار بداو لەزەتی لەم ئازاردانە دەبینی. ئولگا چووە ژووری نووستنەکەی خۆی، خۆیدا بەسەر سیسەمەکەیدا. لەرقا، لەشەرمەزاریا، لەبەغیلی و خۆ بەسووک زانیا قەپی بەپشتییەکدا دەکرد، بەدەنگی بەرز کەوتە گریان، دیموف کورستلوفی بەجێ هێشت و چوو بەلای ئولگاوە، گێژو وێژ و خەمبار، بەئەسپای گوتی:

– نازێ دەنک هەڵ مەبڕە، گریان بە چی دەچێ؟ ئێمە نابێ دەنگمان دەرچێ... نابێ خەڵکی بەم ریسواییەمان بزانن، بەخۆت دەزانی ئەوی چوو دەچێ و ناگەڕێتەوە.

ئولگا هەرچی دەکرد نەیەدەتوانی بەسەرخۆیدا زاڵ بێ و ئەو بەغیلی یە بشارێتەوە کەلە ناخیا گینگڵی دەدا. لەفکران راچوو، وای بۆ دەچوو کە ئەوەی چووە دەگەڕێتەوە. هەستا، دەموچاوی شت. سوراوو سپیاوی کرد. بەپەلە بەرەو لای یەکێک لە دەستە خوشکەکانی وەرێ کەوت. کە ریابوسکی لەلای ئەو نەبینی، بەهەڵەداوان چوو بۆ لای یەکێکی دی. کەلەوێش نەبوو، چوو بۆ لای سێیەم.

لەسەرەتادا شەرمی لەم دیدەنی یە کوتو پڕانەی خۆی دەکرد. بەڵام هێندەی پێ نەچوو کە شەرمی شکا، تاقێکی بەدیدەنی دەستە خوشکانی بردە سەرو ئاکامیش ریابوسکی نەبینی و هەموو دەستە خوشکە کانیشی هەستیان بەوە کرد کە ئەم ماستە موویەکی تێدایە.

لای ریابوسکی گازاندەی لەمێردەکەی دەکردو دەیگوت:

– ئەم پیاوە بەسەبر چاوپۆشی دەمکوژێ. هیچ نامکوژێ بێدەنگی و چاو پۆشی ئەم پیاوە نەبێ.

ئەم قسانەی هێند بەئاووتاو دەگوت، هێندە بەزاری خۆش بون تەنانەت لای نیگار کێشەکانی دیکەش دەیگوت ودەیوتەوە: «هیچ نامکوژێ سەبرو چاوپۆشی ئەم پیاوە نەبێ.» بەگشتی چ گۆرانێک بەسەر ئەتوارو رەفتاری دا نەهاتبوو. شەو کۆڕی چوارشەممان وەکو جاران گەرم بوو.

ئەکتەر تەمسیلی دەکرد. نیگارکێش سکێچی خۆی دەکرد. چەلۆژن، ئامێری خۆی دەژەند. دەنگبێژ گۆرانی دەچری. وەکو جاری جاران سەعات یازدەو نیوی شەو دەرکەی ژووری نان خواردن دەکرایەوە، دیموف لەبەر دەرکەوەو بزە لەسەر لێو دەیگوت :«برادەران فەرموون شیوحازرە.»



ئۆلگا وەکو جاران هەڵوەدای پیاوانی نێوداربوو. جونێکی بەردەداو جونێکی تازەی دەگرت. وەکو جاران درەنگ دەهاتەوە بۆماڵ. بەڵام دیموف وەکو جاران نەدەنووست. لەنووسینگکەی خۆیدا رۆدەنیشت وکاری دەکرد. سەعات سێ دەچووە نێو جێگەوە وسەعات هەشت لەخەو رادەبوو.

جارێک ئۆلگا لەبەردەم ئاوێنەکە وێستابوو، خۆی دەگۆڕی تابچێ بۆ شانۆگەرییەک. دیموف بەجلی رەسمی و بۆینباغی سپییەوە خۆی بەژووری نووستنا کرد. سێبەری بزەیەکی بێگەردو شیرین کەوتە سەر لێوی، بەتاسەیەکی تایبەتی یەوە روانی یە ژنەکەی. دەموچاوی پێدەکەنی. دانیشت؛ بەدەم شێلانی لاقی یەوە گۆتی: «ئائێستا لەموناقەشەی نامەکەم بوومەوە.»

ئۆلگا گوتی:– چی؟ نامە؟!

دیموف پێکەنی: «بەڵێ.» لەژنەکەی هاتە پێشێ تا دەموچاوی لە ئاوێنەکەدا بدێنێ.

ژنەکەی هەو بەو دەقەوە کە پشتی لەوبوو، بەردەوام بوو لەسەر رێکخستنی قژی. دیموف دووبارەی کردەوە: «بەڵێ دەزانی چی یە؟ بەتەمام کارنامەی پزیشکگەری تایبەتی لە نەخۆشی گشتی دا وەربگرم، ئەمەش بۆ خۆی شتە.»

بەسیمایا دیاربوو کەئەگەر ئۆولگا بەشداری سەرکەوتن و شادییەکەی کردبا ئەوا دەیبەخشی و چاوی لەهەموو شتێ دەپۆشی. بەڵام «پزیزیشکگەری تایبەتی» و«نەخۆشی گشتی» بەلای ئۆلگاوە بێ مەعنابوو،

ئەمە جگەلەوەی دەترسا کە فریانەکەوێ وشانۆگەرییەکەی لەدەست بچێ، بۆیە هیچی نەگوت. دیموف چەند ساتێ بەبێدەنگی دانیشت، بزەیەکی سارد نشتە سەرلێوی و لەژوورەکە وەدەرکەوت.

## ٧

ئەو رۆژە، رۆژێکی شووم بوو.

دیموف سەری دێشا، نەقاوەڵتی خواردو نەچوویش بۆ خستەخانە، لەسەر قەنەفەی ژوورەکەی خۆی کەوت. ئۆلگا، سەعات یەک چوو بۆلای ریابوسکی تائەو «دیمەنە سروشتی یەی» کەکێشا بووی نیشان باو گلەییشی لێ بکا کەبۆ دوێنێ نەهاتووە بۆ ماڵیان؟ ئۆلگا بەخوێ دیمەنەکە«»ی بەلاوە چ نەبوو، هەربۆ ئەوەی دروست کردبوو تا

بەو بیانووەوە بچێتە دیدەنی ریابوسکی.

بەبێدەنگی خۆی بەماڵەکەی ریابوسکی دا کرد. گەییە رارەوەکە، لەودەمەدا کەخەریک بوو پێڵاوە لاستیکەکانی دادەکەند. گوێی لەدەنگی پێ و خشەخشی جلی ژنێک بوو کەبەپەلە خۆی کرد بەرەسم خانەکەی «مرسم« ریابوسکی دا. خۆی بەرەسم خانەکەدا کرد، چمکی تەنورەیەکی قاوەیی بەرچاو کەوت، تەنورە لەبەرەکە خۆی لەپشت تابلۆیەکی گەورەدا وەشێرد. ئەم تابلۆیە لەسەر سێ پایەک دانرابوو و پەردەیەکی رەشی پێدا درابوو. ئولگا گومانی لەوە نەما کە ژنێک لەوێندەر خۆی شاردۆتەوە، چونکە ئۆلگاش زۆر جار خۆی لەوێندەر دەشاردەوە: ریابوسکی گێژ و سەرگەردان هەردوو دەستی بەرەو ئۆلگا درێژ کرد، وەکویەکێک ئەم هاتنە ناوەختەی پێ سەیر بێ، بەتۆبزی بزەیەکی بۆ کرد و گوتی: بەخێر هاتی سەرچاوانم، خێرە؟»

ئۆلگا شەرمەزارو تورە، فرمێسک لە چاوی قەتیس ما. بەو بایە مردبا نەک لەبەردەم ژنێکی بێگانەدا قسە بکا، جا چ ژنێکیش؟!

ژنێک کەرەقیب و خەنیمی ئەوە، کڵاوی کردۆتە سەری، لەپشت تابلۆکەوە خۆی وەشێردوو بێگومان هەر بە زۆڵێتی پێدەکەنێ. بەدەنگێکی نزم، شەرمەزارو ترسنۆکانە گوتی: «وێنەکەم هێناوە» بەلێوە لەرزێ لەسەری رۆیی: «دیمەنی سروشتی بێ گیانە.»

– چی؟ چی؟ دیمەن؟. وێنەکەی لە دەست وەرگرت، تەماشایەکی کردو ئامێر ئاسا بەرەو ژوورێکی دی وەرێکەوت، ئولکاش بەناچاری شوێنی کەوت.

بەدەنگی بەرز گوتی: «سروشتی بێ گیان» وەکو یەکێک بۆ قافیە بگەرێ تۆزێ داماو لەسەری رۆیی: «لەسەر وەزنی ئاسمان...سەربان...نەردەوان...»

لەرەسم خانەکەوە دەنگی هەنگاوی بەپەلەو خشەخشی تەنورە هات، ژنەکە بوو ورۆیی. بەئولگا بوایە پرپەزاری هاواری کردبا بەربوایەتە سەرو گوێلاکی ریابوسکی. بەڵام فرمێسک بەرچاوی گرتبوو، هیندە شەرمەزار بوو هەر ئەوە بوو نەدەتوایەوە.

هەستی کرد ئیدی ئولگای نیگارکێش نی یە بەڵکو زیک زیکەیەکە.

ریابوسکی دەنگی لە تێری یەوە دەهات، گوتی: «ماندووم» و چاوی بڕی یە ئولگا وسەریکی لەقاند. وەکو ئەوەی بیەوێ خەواڵویی خۆی برەوێنێتەوە بایەکی باڵی خۆیداو لەسەری رۆیی: «جوانە، بەڵام سکێچەو نەت توانیوە گەشەی پێ بدەی...پاریش هەروا بوو، مانگێکی دیکەش هەروا دەمێنێتەوە. نازانم چۆن تاقەتت لێ ی ناچێ؟ من لە جێ ی تۆ بام وازم لە نیگار کێشی دێنا وخووم دەدایە



موسیقا یا شتێکی دیکە. تۆ نا نابی بە نیکارکێش، تۆ موسیقا زانی. ئای کە ماندووم. بابنێرم چایمان بۆ بێنن. باشە؟

لە ژوورەکە دەرکەوت. ئولگا گوێی لێ بوو کە داوای چای دەکرد. ئولگا بۆ ئەوەی چیتر ماتەڵ نەبێ وئەرکی خودا حافیزیش لە کۆڵی خۆی بکاتەوەو بۆ وەی لە سەڵای گریانێ نەدا، بەپەلە خۆی گەیاندە رارەوەکە، خێرا پێڵاوە لاستیکەکانی لە پێ کردو بۆی دەرچوو. کە گەییە دەرێ هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا. هەستی کرد بۆ هەتا هەتایە لەشەڕی ریابوسکی و نیگارکێشی رزکاربووەو ئیدی هەمووشتێ تەواو بوو، لەوێوە چوو بۆ لای خەیات. ئەوجا خۆی کرد بە موغازەیەکدا کە ئامێری موسیقای هەبوو. بەدرێژایی ئەم ماوەیە بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن ئەم داخە بە ریابوسکی بڕێژێ وکاغەزێکی ساردو تورەی بۆ بنوسێت. کاغەزێ کە بیسەلمێنێ ئەو – ئولگا – بنیادەمێکی کم نی یە.

بیری لەوە کردەوە کە ئەم بەهارو هاوینە لەگەل دیموف دا دەچێتە دورگەی قرم وکەوڵی رابوردوو لە خۆی دادەماڵێ وژیانێکی نوێ دەست پێدەکا.

وەکو هەمیشە درەنگە شەوانێ گەیێوە ماڵ. هەر بەو جلانەوە لە ژووری مێوان رۆنیشت وخۆی بۆ نووسین ئامادە کرد. ریابوسکی پێی گوتبوو: نیگارکێش نییە. ئەمەی لەدڵ دەرنەدەچوو، دەیویست بەهەر جۆرێبووە تۆڵەی خۆی بکاتەوەو بۆی بنوسێت ریابوسکی بەخۆی هیچ نی یە. ساڵی تاقە تابلۆیەک دەکێشێ، ئەویش کاوێژ کردنەوەی هەمان بابەتی ساردو سڕە، وێرای ئەو هەموو خۆ ماندوو کردنەش ناتوانێکارێکی هونەری نایاب ئەنجام بدا. دەیویست بۆی بنوسێت لەو کارانەشدا کە تا ئێستا کردونی قەرزارباری ئولکایە، دەیویست بۆی بنوسێت کە ئەگەر هەڵەیەک لەمەوە – ئولگا – رووی دابێ ئەوا خەتای ئەو ژنە بەرڵڵاو بێ سەروبەرانە بووە کەلەپشتی تابلوکانیا خۆ دەشارنەوە. دیموف، لەژوورەکەی خۆیەوە بێ ئەوەی دەرگا بکاتەوە کازی کرد: «نازێ!»

– چی یە؟

– نازێ مەیە ژوورەوە، وەرە بەر دەرگا، ئەئاوا. پێرێ لە خەستەخانە تووشی ملەخڕە بووم وهەنووکە...حاڵم خەراپە، خێرا بنێرە بەدووی کورستلۆف دا.

ئولگا، مێردەکەی وئاشنا پیاوەکانی خۆی بە نێوی شۆرەتیانەوە گاز دەکرد. حەزی لەشۆرەتی «ئەسیپ»نە دەکرد، چونکە «ئەسیپ»ە کەی گوگوڵ وئەو ووشە قورسانەی بیردەکەوتەوە کەکردبوونی بە قافیەی.بەڵام ئەمجارەیان هاواری کرد:

–ئەسیپ وانەڵێ ی!

بنێرە بەشوێنیا ، نەخۆشم». ئولگالە پشت دەرکەوە گوێی لێ بووکە دیموف رۆیی لەسەر قەرەوێڵەکەی راکشاو بەدەنگە گڕەکەی گوتی: «بنێرە!»

ئولگا زۆر ترسا ، بیری کردەوە: «دەبێ چۆن تووش بوو بێ؟ کەخەتەرە!»

بێ وەی چ مەبەستێکی هەبێ، مۆمێکی هەڵگرت وچووە ژوورەکەی خۆی، تیا مابوو چ بکا. خۆی لە ئاوێنەکەدا بینی. کە دیقەتیدا؛ رەنگی زەردو سیمای ژاکاو، قۆڵی چاکەتەکەی دەڵب، پەڕی زەردی بەیەخەیا کردبوو، تەنورە دڕاو،کە خۆی بەو جۆرە بینی لە خۆی ترسا ، لەپڕ دڵی بەدیموف سوتا ، خەمێکی زۆری بۆ ئەشقی بێ پایانی، بۆ خێر لە خۆ نەدیوی، بۆ سیسەمە تەنیاکەی کە ماوەیەک بوو دیموف لەسەری نەدەنووست، خوارد. بزە ناسک و راستگۆکانی بیر کەوتەوە. بەکوڵ گریا ونامەیەکی پڕ پاڕانەوەی بۆ کورستلوڤ نووسی. سەعات دووی بەیانی بوو.

## ٨

ئولگا ، وەختێ سەعات هەشتی بەیانی ی رۆژی دوایی، خەواڵۆو پەشێو، وەکو تاوانباران لە ژووری نووستن وە دەرکەوت، لە ڕاڕەوەکەدا تووشی پیاوێکی ردێن ڕەشی بێگانە ونەناس بوو کە بەسیمایا دیاربوو دکتۆرە. بۆنی دەرمان دەهات.. کورستلوڤ لەپشت دەرگای نووسینگەکەی دیموف وێستا بوو، بەدەستی راستی سمێلی چەپی بادەدا. نیکایەکی نەفرەت ئامێزی ئولگای کردو گوتی: «ببورە، ناتوانم ڕێگات بدەم کە بچی یە زوورەوە. لەوەیە تۆش تووشی ملەخڕەببی وئەمە جگە لەوەی چوونەکەت بێسودە، چونکە دیموف هۆش وهەستی نی یە.»

ئولگا لەبن لێوانەوە گوتی: «یانی بەراستی ملە خڕەی گرتووە؟»

کورستلوف بێ وەی گوێ بە پرسیارەکەی ئولگا بدا ، گوتی: «هەموو کارێکی گەوجانە باجی خۆی هەیە. دەزانی چۆن بووە؟ رۆژی سێ شەممە بە سۆندەیەک کێمی گەروی کوڕێکی هەڵمژیوە، وەکو شێت ملی پێوە ناوە، ئاخر بۆ؟!

ئولگا پرسی: خەتەرە؟ زۆر؟ –بەڵێ، دەڵێن زۆر خەتەرەو پێویستە بنێرین بە دووی «شەرەک»دا. پێویستە..

هەوەڵجار پیاوێکی وردیلەی قژ سوری قژ درێژ وکەپو درێژ کە بەدەمو دوی دا لە جوولەکە دەچوو وەژوور کەوت. پاشان پیاوێکی شپرێوی باڵابەرزی کۆماوەی وەک



حاخامی گەورە، وەژوورکەوت. پاش هەمووان پیاوێکی سورەی گەنجی کە تەی عەینەک لەچاو هاتە ژوورەوە، هەموو ئەم دکتۆرانە هاتبوون یارمەتی هاوپیشە نەخۆشەکەیان بدەن وبەسەری بکەنەوە، کورستلوف کە درێغی نەکردبوو، دەبوا بروا پشوویەک بدا ، کەچی نەرۆی ولەویندەر مایەوە، وێڵ وسەرگەردان حەوانەوەی نەبوو ، لەچ شوێنێ ئۆقرەی نەدەگرت. کارەکەرەکە سەری قاڵ بوو ، پێ یەکی لە مویەقەکە بوو کە چا بۆ دکتۆرەکان داکاو پێ یەکی لەدەرمانخانە بوو، کەسێ نەبوو دەستێ بە ژوورەکاندا بینێ ورێکیان بخا.هەموو شتێک مات وغەمگین بوو.

ئولگا لە ژووررەکەی خۆی رۆنیشتبوو ، لە فکران راچوو بوو ، پێ ی وابوو چونکە فێڵ وخیانەتی لە دیموف کردووە، خوا بەم جۆرە تۆڵەی لێکردۆتەوە. ئەو پیاوە ئارام و هێمنە، ئەو پیاوەی کە لە وەسف کردن نایە، گەچ گلەییەناکا ، ئەو پیاوە فیداکارەی دەڵێ ی لە دڵسۆزی و دڵپاکی وچاکی خۆیدا پوکاوەتەوەو لاواز بووە ئێستا لەسەر قەنەفەیەک کەوتووە وئازار دەچێژی وتەنانەت ناڵەیەک ناکا. چونکە ئەگەر بەدەم بێ هۆشی وتاوە، گلەییک ؛گازاندەیەک بکا ، ئەوا دکتۆرەکان هەست بەوە دەکەن کەتەنیا ملەخڕە بکوژی ئەو نی یە، ئەوجا لە کورستلوف دەپرسن وئەویش هەموو ووردو درشتێک دەزانێ و...بیری کردەوەکە بێ هۆ ولەخۆرایی نی یە کە لە کورستلوف دەپرسن و ئەویش هەموو ووردودرشتێک دەزانێ و... بیری کردەوە کە بێ هۆو لەخۆڕایی نی بەکورستلوف بەرقەوە دەڕوانێتە ژنی هاوڕێکەی وەکو ئەوەی ژنی هاورێکەی بە گوناحکاری ر وتاوانباری ئەسڵی بزانێ وملەخڕەکەی تەنیا بە یارمەتی دەرو شەریکە تاوانی ئەو بزانێ، ئیدی بیری ئەو هەیڤە شەوەی نێو روباری ڤۆڵگای نەکرد، بیری بە لای پەیمانی ئاشقانە و ماچی بەر دەرکەی کوختەکەدا نەچوو. هەر ئەوەی لە بیر بوو کە بەهۆی هەوەسبازی و خۆ پەرستی خۆیەوە هێندە لەوتاوە کە ئاوی هەموو دنیا پاکی نەکاتەوە. کە ئەشقی شێتانەی خۆی دەربارەی ریابوسکی هێنایەوە بەرچاو گوتی: «ئاخ کە کڵاوم کردە سەری. نەفرەتی خوا لە ریابوسکی».

سەعات چوار لەگەڵ کورستلوف دا نانی خوارد. کورستلوف چارەی دابوو بەیەکدا و جگە لەتۆزێ شەرابی سوور چیدی نەخوارد. ئولگاش چی وای نەخوارد. لە دڵی خۆییدا لە خوا پاڕایەوە و شەرتی کرد ئەگەر ئەمجارە دیموف چاک بێتەوە، خۆشی بوێ وژنێکی بە وەفاو ئەمەک بێ لەگەڵی. پاش تۆزێ خۆی لەبیر کرد. روانی یە کورستلوف و لەفکران راچوو! «چەند ناخۆشە بینادم وەکو ئەم کورستلوفە دڵڕەق و

خەڵەفاو و سادە و گومناو بێ، تا ئەم رادەیە غەشیم بێ و ئاگای لە پێوەندییە کۆمەڵایەتی یەکان نەبێ» . وای هەست دەکرد خوا بۆیە ئەم نەهامەتی یەی بەسەردا هێناوە چونکە مێردەکەی پشت گوێ خستووە. کول و کەسەر باڵی بەسەرا گێشا ، هەستی کرد تەلاری ژیانی وێران بووەو هێزی نی یە ئاوەدانی بکاتەوە.

ئولگا ، پاش فراڤین خۆی بەژووری میوانا کرد ، کورستلوف لەسەر کەرەویتەیەک خەوتبوو ، سەری خستبووە سەر پشتییەک و بەدەنگی بەرز دەی پرخاند.

دکتۆرەکان یەک یەک دەهاتن، شتاقیان ئاوڕی لە شپرپوی ژوورەکان نەدەدایەوە. پیاوێکی بێگانە لە ژووری میوان خەوتبوو پرخو هۆڕی بوو. تابلوی قەد دیوارەکان، رازانەوەی سەیرو سەمەرەی ژوورەکە، قڕی شێواو جل و بەرگی لە ئوتو نەدراوی کارەکەرەکە شتاقیان سەرنجی کەسیان رانەدەکێشا ، کەس بەکەس نەبوو.

یەکێک لە دکتۆرەکان پێکەنی، بەڵام پێکەنینەکەی هێندە بەشەرمەوە بوو بە حاڵ دەبیسرا.

ئولگا کە جاری دووەم هاتە ژوورەوە، کورستلوف هەستابوو، هەستایە سەر پێ، جگەرەیەکی داگیراندو بە ئەسپایی گوتی: «ملە خڕەی گرتووە. هەردوو کونە کەپوی پڕ بووە لە کێم...دڵی سستە.. وەزعی خراپە» .

ئولگا گوتی: «واچاکە بنێرین بەدووی شەرەک دا» .

– شەرەکیش هاتووە، ئەویش دەڵێ نەخۆشی یەکە سیرایەتی کردووەو خەریکە کە پوی دەگرێ. تازە شەرەک چی بۆ دەکرێ؟ شەرەکیش هیچی دەسەڵات نی یە ، تەنیا ناوەکەی هەیە. جیاوازی من و ئەو هەر ئەوەیە ئەو شەرەکەو من کورستلوف!...

زەمەن تێکەڵ بەنەبڕانەوە دەبوو. ئولگا هەر بەجلەکانی یەوە خۆی دا بەسەر قەرەوێڵەکەیداو خەون و خەیاڵ بردی یەوە. هەستی دەکرد دێوبێکی ئاسنین بەر دەرکەی لێ گرتوون، هەر کە ئەم دێوە لابچێ ئیدی هەموو شتێکی وەکو جارانی لێ دێتەوە. بەڵام کە بەخۆیدا هاتەوە، بۆی دەرکەوت کە چ دێوێک لە ئارادا نی یەو تەنیا دیموف نەخۆشە.

بیری کردەوە: «سروشتی بێ گیان» ودیسان ئاگای لە خۆ برا:«ئاسمان.. سەربان... نەردەوان، ئەدی شەرەک؟ لەهرزی خۆیدا شەرەکی لەسەر وەزنی گورگ،ورگ، گۆلک رێک خست. پاشان بیری کردەوە: «ئایا هەنووکە دۆستەکانم لە کوێن، ئاگایان لەم خەمە گەورەیەی من هەیە؟ خوای گەورە فریامان بکەوە، رزگارمان بکە! شەرک، گورگ...»



دیسان دێوی ئاسنین. زەمەن تێکەڵ بە نەبڕانەوە دەبوو، سەعاتی رارەوەکە چەند جارێک لێی دا. ناوە ناوە زەنگی دەرگا لێدەدرا.

دکتۆران دەهاتن... کارەکەرێک وەژوور کەوت، سینیەک وپەرداخێکی خاڵی بەدەستەوە بوو گوتی:

– خانم سیسەمەکە رێک بخەم؟

چونکە چ وەڵامێکی نەدرایەوە، لەژوورەکە وەدەرکەوت.

دیسان سەعاتەکە لێی دایەوە، دیسان خەون وخەیاڵ تێکەڵ بەبارانی سەر روباری ڤۆڵگا بوونەوە.

دیسان یەکێک وەژوور کەوت، ئەمجارەیان لە بێگانە دەچوو. ئولگا هەستایە سەرپێ و کورستلوفی ناسی یەوە. پرسی سەعات چەندە؟

– نزیکە ی سێ یە.

– باشە چی بوو؟

– چی بوو! هاتووم کە پێت بڵێم لە حاڵی مەرگ دایە.

بەدەم گریان و هەنسک هەڵدانەوە لە سوچێکی قەروێڵەکەی ئولگا دا رۆنیشت و بەقۆڵی چاکەتەکەی فرمێسکەکانی سڕی. ئولگا لەسەرەتادا حەپەسا ، پاشان گێژبوو ولە جێی خۆی لوول بوو.

کورستلوف بەدەنگێکی ناسک دووبارەی کردەوەو بەدەم گریانەوە گوتی: «دەمرێ، خەریکە دەمرێ، خۆی فیدا کرد! ماڵی وێرانم بۆ ئەو زیانەی لە دنیای زانست دەکەوێ!» ئەوجا بە کۆل و کەسەرەوە لەسەری رۆیی: «ئەم پیاوە لە هەر هەموومان گەورەتر بوو، پیاوێکی بێ هاوتا بوو. یەکپارچە بەهرە بوو! چەندی هاندەداین!» کورستلوف کۆڵەمستی گوشی: «خوایە، خوای گەورە تا دنیا دنیایە زانایەکی وا هەڵناکەوێتەوە. ئوسکادیموف، ئوسکادیموف ئاخر تۆ چت کردبوو؟ خوای گەورە؟ بە نائومێدی یەوە لەسەری رۆیی: «جا رەوشت پاک، دڵسۆز، مرۆڤ دۆست! ئیسنان نەبوو پارچە زێڕێکی خالیسە بوو! چ خزمەتێکی بەدنیای زانست کرد؟ چۆن لە پێناوی زانست خۆی دانا!

شەو رۆژ سەرگەرمی کارکردن بوو. جا بێ تەماح، هیچی بۆ خۆی نەدەویست، ئەم زانا لاوە، ئەم پرۆفیسۆری ئایندەیە ئیسراحەتی لە خۆی حەرام کردبوو، تەنانەت شەوانیش هەر خەریکی وەرگێران بوو تا پارەی ئەم... ئەم شتە قۆڕانە، ئەم پارچە گۆنانە دابین بکا» . کورستلوف بەگومانەوە چاوی بڕی یە ئولگا ، بە هەردوو دەست

پڕی دایە چەرچەفەکە و پارچە پارچەی کرد، دەتگوت چەرچەفەکە تاوانبارە نەک ئولگا.

... دیموف هەرگیز خەمی خۆی نەبوو...«کەسیش خەمی ئەوی نەبوو تازە دوای چی؟ بەچی دەچێ؟» دەنگێکی بەرز لەژووری نان خواردنەوە هات: «پیاوێ بوو لە نێو سەد پیاوا هەڵت بژاردبا». ئولگا ژیانی خۆی و دیموفی هێنایەوە بەرچاو، هەستی کرد کە بەراستی مێردەکەی پیاوێکی هەڵبژاردە بووە، لەهەر هەموو دۆستەکانی ئەم پیاوترو گەورەتر بووە. ئەوەی بیر کەوتەوە کە بابی چ رایەکی دەربارەی دیموف هەبوو. هاوپیشەکانی دیموف چۆن ستایشیان دەکرد. چ شۆرەت و نێوبانگیان بۆ ئایندەی دیموف پێشبینی کردووە. دیوارەکان، بن میچەکان، گلۆپەکان، مافورەکان تێکڕا مۆرەیان لێدەکرد و لێویان لێ هەڵدەقورتاند، وەکو ئەوەی پێی بلێن: «هەموو خەتای تۆ بوو، تۆ بە ئانقەست بەرەڵلات کرد تا بەم دەردە بچێ! تا دیق بکاو خۆی بفەوتێنێ!» بەدەم هاوارەوە لە ژوورەکە وەدەرکەوت. بەژووری نان خواردنا تێ پەڕی، دڕی بەخەڵکەکە داو خۆی بەژووری مێردەکەیا کرد. دیموف ساردو سڕ بێ جوڵە لەسەر قەنەفەکە کەوتبوو، چەرچەفێکی پێ دا درابوو، تەنیا سەرو چاوی بەدەرەوە بوو. دەمو چاوی لاواز، رەنگی زەرد. دیموفەکەی جاران نەبوو، تەنیا برۆ رەشەکانی و زەردەخەنە ناسکەکەی وەکو خۆیان مابوون. ئولگا دەستی خستە سەر سینگی، ئەوجا سەر نێوچەوانی و پاشان سەر دەستی.

هێشتا سینەی گەرم بوو، بەڵام تەوێڵی و دەستی رچی بوون.

چاوە نیمچەوازەکانی لە ئولگا نەبوو، بەڵکو رێک لەچەرچەفەکە بوو ئولگا پڕ بەزاری هاواری کرد:- دیموف! دیموف!

پڕ بە دڵ حەزی دەکرد تێ ی بگەیەنێ کە ئەوەی چوو، چوو هەمووی هەڵە بوو، کە هێشتا فرسەت ماوەو هەموو شتێ لە دەست نەچووە، کە دەشیت ژیان بگەڕێتەوە و پڕ ببێ لە خۆشی و جوانی، کە لەمڕۆ بەدواوە مێردەکەی دەپەرستێت خۆی وەقفی رێزگتنی ئەو دەکا.. هاواری کرد:«دیموف!»و شانی راتەکاندو نەیدەویست قەناعەت بکا کە ئیدی دیموف هەرگیز بێدار نابێتەوە: «دیموف! دیموف!» کورستلوف لە ژووری میوانا بەکارەکەرەکەی دەگوت: پرسیاری نا بەجێ مەکە، خێرا هەرە نک پاسەوانی کلێسا و ئەدرەسی ژنەکانی لێ وەربگرە، ئەوان بەخۆیان دەیشۆن و ئامادەی دەکەن و هەرچی یەک پێویست بێ جێ بەجێ ی دەکەن».

# ماچ

سەعات هەشتی شەوی بیستەمی مانگی پێنج بوو. سەرجەمی ئەفسەرانی هەر شەش لقەکەی هێزی تۆپخانەی «ن» خۆیان بە گوندی مێستچکی دا کرد. ئەم گوندە لەسەر رێگای ئوردوگاکەیان بوو، بەو مەبەستە روویان کردە ئەوێندەر، تاشەوێ وەمێنن و پشوویەک بدەن.

ئەفسەرەکان کردبوویان بە هەراو هەنگامەیە ئەوسەری دیار نەبوو، هەندێکیان خەریکی تفەنگەکانیان بوون، هەنێکی دی لەگەڵ ئەفسەری ئیشکچی دا سەرگەرمی رێک خستنی جێگای قۆشەنەکە بوون. ئەوان هەموو سەرگەرمی کاری خۆ بوونکەلەپڕ لەپشت کلێساکەوە سەرو سەکوتی پیاوێکی مەدەنی پەیدا بوو کە بەسەر ئەسپێکی بەرچاوی یەوە بوو. ئەسپەکەی ئەسپێکی بچکۆلەی کلک کورت بوو.گەردنەجوانەکەی بەشێوەیەکی تایبەتی دەجولاندو بەنێسکە نێسک دەهاتە پێشێ. لاقەکانی لەسەمایەکی سەیرا بوون. دەتگوت یەکێک لەدواوە دەکێشێ بەسمەکانیا.. سوارەکە هەر کەگەییە بەردەم ئەفسەرەکان، جلەوی راکێشا ،کلاوەکەی لەسەر داکەندو بەرێزێکی تایبەتی یەوە گوتی:«قوربان، جەنەراڵ «فنرابک» کەماڵەکەی هالەم نزیکانە، دەیفەرموو بۆچاخواردنەوە تەشریف ببێنە ماڵی ئەوو گەورەی بکەن.»ئەسپەکە سەرێکی تەکاندا، بەدەم سەماولەنجەوە بەرەو دواجما. سوارەکە هەمدیس کلاوەکەی لەسەری داگرتەوە، سەری ئەسپەکەی وەرگێراو لەپشت کلێساکەوە گوم بوو.

هەموو ئەفسەرەکان هاواریان کرد:« عەمری نەمێنێ» وسەرگەرمی کاری خۆ بوونەوە:» ئێمە لەماندۆیتی دا چاومان هەڵنایەت وجەنابی فنرابک دەعوەتی چایمان دەکا. لەم جۆرە دەعوەتەمان زۆر دیوە!».

ئەفسەرەکان هێشتا بیرەوەری دەعوەتەکەی جاری پێشوویان لەیادمابوو. لەکاتی



دوا مانۆڤریاندا لەگەڵ هاورێ سەربازەکانیاندا لەماڵێکی نێودارێکی گوندا کەکۆنە ئەفسەرێکی خانەنشین بوو وجەنابی کونت ی پێدەگوترا دەعوەتی چای کرابوون. خانەخوێیەکەیان پیاوێکی زیتەڵەو روخۆش بوو، زۆری خزمەت کردبوون و بەدەوریاندا هاتبوو، خولقی گەرمی کردبوونو ڤێلی زۆری نواندبوو. هێندە خواردن وڤۆدگای دەرخوارد دابوون مڕی کردبوون. ئەویش شەوێ دەعوەتی کردبوون، هەڵبەتە ئەفسەرەکان لەمەبەگلەیی نەبوون. بەڵام پیرە ئەفسەری خانەنشینی هەقی ئەوەی لێکردبونەوە کە زیاد لەپێویست بەدەوریاندا هاتبوو؛ تابەرەبەیان سەربهوردی خۆی بۆ گێڕابوونەوەو خەوی لێ حەرام کردبوون. بەهەموو ژوورەکاندا گێڕابوونی. تابلۆیگران بەها. بەردی تاشراوی کۆن و چەکی گران بەهای نیشان دابوون، هەرهەموو ئەو نامانەی بۆ خوێندبوونەوە کە لە پیاوانی نێودارەوە بۆی هاتبوون. ئەفسەرەکان کەماندوێتی زۆری بۆ هێنابوون، خوا خوایان ببوو خانەخوێیەکەیان لێ بێتەوەو سەرخەوێ بشکێنن، هێندەیان باوێشک دابوو، هەموو شەویلاگەیان رەق ببوو. وەختێ خانە خوێیەکەیان لێ ببۆوە ئیدی کاتی خەوتن نەمابوو.

ئایا فنرابک یش لەبابەتی هەمان کۆنتی پیر؟ لەوەیە. خۆ ناشکرێ نەچن. ئەفسەرەکان تەراشیان کرد، خۆیان تاس و لوس دا، جلیان لەبەر کردو بەرەو ماڵی فنرابک وەرێ کەوتن. کەگەیینە مەیدانی کلێساکە ئەوجا بۆیان دەرکەوت کەدەبێ بە گردەکەدانشێو ببنەوە وبگەنە کەناری چۆمەکەو لەوێوە بەرەو باخەکانی جەنەڕاڵ داگەڕێن و ئیدی لەوێندەرەوە ڕاستە شەقامێک جیادەبێتەوە ورێک دەگاتە بەر ماڵی جەنەراڵ. خۆ ئەگەربشیانەوێ بەگردەکەدا هەڵگەڕێن ئەوا دەگەنە عەمارەکانی جەنەراڵ کەنیو فەرسەخێک لەگوندەوە دوورە، ئەفسەرەکان ئەم ریگەیەیان گرتە بەر.یەکێکیان پرسی :«ئەرێ ئەم فنرابکە کێ یە؟ خۆ ئەوەنی یە کە لە پلونا فەرماندەی هێزی سوارە بوو؟

– نەء؟

– نەء. ئەو رابک ی رووت بوو.

– هەواکەی زۆر خۆشە ها!

کەگەیینە ئاستی یەکەمین عەمار، دووریانێکیان هاتەپێش، رێ یەکیان بەرەو تاریکی دەکشاو ئەوی دیکەیان کەبە دەستی راست دا پێچی دەکردەوە بەرەو ماڵی جەنەراڵ دەچوو. ئەفسەرەکان تانزیکتر دەبوونەوە هێواشتر قسانیان دەکرد، ئەم بەرو ئەوبەریان یەکپارچە عەماری بەخشت دروستکراوبوو، سەربانی عەمارەکان بەرەنگی

سوور بۆیەکرابوو، لەدوورەوە لەسەربازخانەی شارەکان دەچوو.پەنجەرە روناکەکانی ماڵی جەنەراڵ فنرابک لەدوورەوە گازی دەکردن.

ئەفسەرێکی گەنج هاواری کرد:« کورینە بەختمانیارە! بڕوانن سەگە بەبۆنەکەمان چۆن پێشکەوتووە. پێ دەچێ بۆنی شتێکی کردبێ.»

ئەفسەرەگەنجەکە مەبەستی ملازم لبیتکف بوو. لبیتکف ئەفسەرێکی باڵا بەرزی مل ئەستوور بوو، بەجۆرێ خوێ تاس و لوس دابوو وردێنی تراشی بوو. کێچ لەسەر رووی هەڵدەخلیسکا، هەرچەند تەمەنی ٢٥ ساڵ بوو، بەڵام لەنێو هاورێکانیا بەمێ باز ناسرابوو، مێ بازێکی واکە لە دوورەوە بۆنی ژن بکا وهەر بەبۆن بزانی ژن لەو شوێنە هەیە یانە. کەگوێ ی لە پلاری هاورێکەی بوو ئاورێکی دایەوەو گوتی:« راست دەکا، پڕە لە ژن. دڵم وا دەڵێ.»

کابرایەکی شەست ساڵەی جوان بە جلی مەدەنی یەوە هاتە پێشوازییان. ئەو پیاوە فرانبک بوو. بەدەم تەوقەکردن و خێرهاتنەوە پێ ی راگەیاندن ؛ کەهەرچەندە بەدیداریان خۆشحاڵە. بەڵام داوای لێبوردنیان لێدەکا چونکە جێ ی مانەوەی شەوی ئەوانی نی یە، وهەردوو خوشکەکەی ومنداڵەکانیان و براکەی و چەند دراوسێیەکیش ئەوشەو میوانن و ژووری چۆڵیان بەدەستەوەنی یە. هەرچەند بەگەرمی تەوقەی لەگەڵ کردن و عوزری بۆ هێنانەوەو بەروویانەوە پێکەنی بەڵام ئاشکرابوو کە بەئەندازەی نیوەی کۆنتەکەی پار بەدیداریان خۆشحاڵ نییەو تەنیا بۆ ناوو لەبەر ئەتەکێتی کۆمەڵایەتی دەعوەتی کردوون!ئەفسەرەکان بەقاڵدرمەکاندا سەرکەوتن. قاڵدرمەکان بەقاڵی و مافوری نەرم پۆشرابوون، بەدەم سەرکەوتنەوە گوبیانبۆ دەمو دووی خانەخوێیەکەیان شل کردبوو وئەوەیان بۆ دەرکەوت کەهاتنەکەیان مایەی نارەحەتی و سەربارێکی نابەجێن، لەدڵی خۆیاندا دەیانگوت باشە کەسێک دوو خوشک و هەموو خوشکەزاکانی وبرایەکی وکۆمەڵێ دراوسێ ی بۆ دەعوەتێکی خێزانی دەعوەت کردبێ چۆن کەیفی بە ١٩ ئەفسەری بێگانەدێ کەلەژیانی دا نەیدیتوون؟

ژنێکی باڵا بەرزی بەتەمەن، خۆش هەیکەل ودەموچاو درێژکولەی برۆڕەش لەبەر دەرگای ژووری میوانەوە خێرهاتنی کردن، لەرووی نەزانکەتەوەو بە هەیبەتێکی تایبەتی یەوە بزەیەکی ناسکی بەروویانادا. ئەویش دووبارەی کردەوە کەبەدیداریان خۆشحاڵەوتەنیا خەجاڵەتی ئەوەیە کەجێگای مانەوەی شەویان نی یە، بەڵام هەرکەرووی وەرگێرا، زەردەخەنەپڕ نەزاکەت وبەشکۆکەی سەرلێوانی هەڵفڕی.



بەئاشکرا دیاربوو کەلەسەردەمی خۆی دا گەلێک ئەفسەری دیتوون و ئەم ئەفسەرانەی ئێستای بەلاوە غەریب و سەیر نین وبۆیەی دەعوەت کردوون کەپلەو پایەی خۆی وای خواستوە. دە، ژن و پیاو لەژوورێکی گەورەی نان خواردن دا لە دەوری مێزێک رونیشتبوون و چایان دەخواردەوە. لەپشتی ئەوانەوە چەند پیاوێکی گەنج لەنیوچەرەدوکەڵی جگەرەدا بەپێوە وێستابوون و ئامادەی خزمەت بوون. یەکێک لە وپیاوانە لاوازێکی سمێڵ سووربوو کەبەدەنگی بەرزو بەزمانێکی پس بەئینگلیزی قسانی دەکرد.ئەفسەرەکان لە دەرکەیەکی وازەوە ژوورێکی روناکیان بینی کە بەکاغەزی شینی ئاسمانی پۆشرابوو. چەنەراڵ بە زمانێکی شیرین و رێزێکی تایبەتی یەوە گوتی:«برایان، لەبەر ئەوەی ژمارەتان زۆرە و ناکرێ یەک یەک تەعاروفتان پێ بکرێ. تکا دەکەم خۆتان یەکدی بناسێنن.

میوانەکان، هەندێکیان بەکەش و فشەوە، هەندێکیان بەدەم زەردەخەنەی دەستکردەوەو هەموو ناشیانە سەریان دانەواندو پاشان لەدەوری مێزەکەو هەرکەسەو لەجێی خۆی رۆنیشت.

لەهەموویان ناشینتر نەقیب «ریابوفچ» بوو، کەکابرایەکی باڵا کوڵ و شانوشەپیلک داتەکیو بوو. عەینەکی لەچاو کردبوو، ردێنی هێشتبوە. وەختێ هاورێ ئەفسەرەکانی بە سیمای جدی و بەدەم زەردە خەنەی دەستکردەوە دانەونیەوە سیمای ئەم جەنابی نەقیبە. بەعەینەک و ردێنەکەیەوە وا دەرهاتە بەرچاو کەهاوار بکات:» من لەنێو هێزەکەدا لەهەموویانکەم رووترو شەرمنۆک ترم، لەهەموویان بێ قەدر ترم.» پاش ئەوەی لەجێی خوێ رۆنیشێت تاماوەیەکی زۆر نەیتوانی سەرنجی بخاتە سەر شتێکی تایبەتی. سیمای خەڵکەکە، جل و بەرگ، بوتڵە کۆنیاک و پەرداخ، ئەوپیاڵانەی کە هەڵاویان لێ هەڵدەستا، نەخش و نیگاری گەچینی تاقەکان، هەر هەموو ئەمانە هەستێکی ترسناکیان لەلای وروژاند. پربە دڵ حەزی دەکرد سەری بخاتە نێو هەردوو دەستی، عەینی خوتبەوێژێکی بێ ئەزموون هەموو شتێکی لەبەردەم خۆیدا دەبینی، بەڵام چ شتێکی بۆ دیاری نەدەکرا.

ریابوفچ. بەرە بەرە بەسەر شەرمنۆکی خۆیدا زاڵ بوو وتوانی دەورو بەرەکەی دیاری بکاو بکەوێتە هەڵڕوانین. چونکە بەخۆی کابرایەکی شەرمن و گۆشەگیر بوو، بەر لەهەمو شت سەرنجی لەسەر جورئەتی لەرادەبەری دۆستە تازەکان گیر سایەوە. فنرابک.ژنەکەی، دووژنی دیکەی بەتەمەن، کیژێکی شینپۆش، پیاوە سمێڵ سوورەکە، وای دەهاتە بەرچاو کە«فنرابک» گەنجە. هەموو بێ باک و بێ چ

شەرمێک لەنێو ئەفسەرەکاندا رۆنیشتبوون، وەکو ئەوەی پێشتر مەشقیان کردبێ زوو بە زوو لەگەڵ ئەفسەرەکاندا کەوتنە قسەوباس ومیوانەکانیان سەرگەرم کرد. کیژە شینپۆشەکە پاش گفتوگۆیەکی زۆر ئەوەی سەلماند کەئەفسەری توپچی لە ئەفسەری سوارەو پیادە چاکترە، فنرابک و ژنە بەتەمەنەکانیش قسەکەی ئەویان سەلماند. باسەکە تەواو بێ سەروبەربوو، ریابوفچ گۆێ ی بۆ کیژە شینیپوشەکە رادێرا بوو، ئەو کیژە هێند بەئاوتاو قسەی دەکرد بەتوبوایە هەرگویێ ی لێ بگری.بەلاّم مەخابن باسی شتی وای دەکرد کە ریابوفچ نەحەزی لێدەکردو نەسەری لێ دەردەکرد، هەستی دەکرد کە بزەی دەستکرد لەوەخت و لە ناوەخت دا دەکەوێتە سەرسیمای و ئاوا دەبێ.

هەرچەند خانەوادەی فنرابک بە باسی عەمەلیاتی سوپایی میوانەکانیان سەر گەرم دەکرد، بەلاّم چاویان لەهەموو پەرداخ و دەمێکیش بوو تابزانن هەموو میوانەکان چایان خواردۆتەوە یانا، خەمی ئەوەیان بوو نەبادا چایەکان تاڵ بن: «قوربان بۆ پسکیت نافەرمووی؟ حەز لە کونیاک دەکەی؟» ریابوفچ تا پتر گویێ ی دەگرت و تەماشای دەکرد زیاتر دڵبەندی خانەوادەی بەتەربێتی فنرابک دەبوو.

میوانەکان چایان خواردەوە، هەستان وچونە ژووری میوان، غەریزەی لبتیکف درۆی نەکردبوو. ژووری چی! پر بوو لە ژنی گەنج و ناسک وکیژی جوان و نەشمیل، هێشتا دەققەیک تێ نەپەڕی بوو کەملازمە بەبۆنەکە خۆی گەیاندە تەنیشت کیژێکی جوانی قژ زەردی رەشپۆش. دانەوی یەوە و بەشێوەیەکی زۆر تایبەتی دەستی خستەسەرشانی. بێگومان بێ تامترین قسانی دەکرد. چونکە کیژە قژ زەردەکە زۆر بەساردی گوتی: بەراست! ئەم ووشەیەی هێند بەساردی گوت کە دەبوایە سەگە بەبۆنەکە تەواو دڵنیابێ بەهەڵەچووە و لەهەموو هەورێ باران نی یە.

موسیقا دەستی پێکرد. هەرکەئاهەنگی مۆسیقای سەمایەکی خەمناک لەپەنجەرە وازەکەوە چووە دەرێ، تەواوی میوانەکان وایان هەست کرد کە لە دەرێ ڕا بەهارەو، باوەشی بۆ شەوی جوانی مانگی پێنج گرتۆتەوە. دنیا پر بوو لە بۆنی گەلاّی درەختان و گولاّلەو وەنەوشە. موسیقاکە و بەهار هەردوو بێ ئەندازە دڵگیر بوون. ریابوفچ کەمەستی ئاهەنگەکە و کۆنیاک بوو. بەزەردەخەنەوە روانی یە پەنجەرەکە، ئەوجاسەرنجی لەسەرسەمای رێک وپێکێ ژنەکان گیرسایەوە، بۆی دەرکەوت کەبۆنی گولاّلەو وەنەوشەو درەختان لەدەرێ ڕانایەت و بەڵکو لەدەمو چاوو جل و بەرگی ژنەکان دێ.



سەما دەستی پێکرد و. فنرابک دووتاو لەگەڵ کیژێکی زۆر لاوازدا بەدەوری ژوورەکەدا سوڕایەوە. لبیتکف چووە کن کیژە شینپۆشەکەو تاوێک لەگەڵی رەقسی. ریابوڤچ لەبەر دەرگا و لەپاڵ دیوارە گڵەکاندا وێستا بوو و بەکاوە خۆ دیقەتی هەموویانی دەدا. عاجباتی لە جورئەتی پیاوەکان دەما کە چۆن بەبەرچاوی ئەو خەڵکەوە دەست لە قەدی ژنێکی بێگانە دەئالێنن و سور دەدەن. زۆری هەوڵدا خۆی لە حاڵ و بارێکی وادا بێنێتە بەر چاوی خۆی، بەلاّم بێهودە بوو.

سەردەمانێ بە غیلی بەجورئەت و رووداری هاوڕێکانی دەهات وزۆری خەفەت لە شەرمنی خۆی وشان وشەپیلکە دا کەوتووەکەی دەخوارد، زۆری لەبەرگران بوو کە کەس حیسابی بۆ نەدەکرد، خەفەتی لەوە دەخوارد کە ناشرین وردێن هاتووە. بەلاّم بە تێپەڕ بوونی رۆژگار لەگەڵ ئەم وەزع و حاڵەی خۆیدا راهات.

بەلاّم ئێستا کە روانی یە ئەم بەزمی سەماو سوڕو چەقەنەیە چ بەغیلی یەکی نەهات. بەلاّنەکی هەستێکی خەمگین دایکرت.

کە یەکەم تاوی سەما تەواو بوو، فنرابک هات و ئەو دوو ئەفسەرەی کە سەمایان نەدەکرد، لەگەڵ خۆیدا بردنی بۆ یاری بیلیارد. بە سێ قۆڵی لەژوورەکە وە دەرکەوتن. ریابوڤچ بێ کارو بەتەنێ وێستا بوو، هەستی کرد کە دەبێ بەشداری شتێک بکا، بۆیە لەگەڵ ئەواندا رۆیی. ژووری نان خواردنیان بە جێ هێشت، بەرارەوێکی باریک دا رەت بوون، گەیینە ژوورێکی دی، سێ پێشخزمەت ی خەواڵو بەرزە پێ راپەڕین. ئەو ژوورەشیان بەجێ هێشت و خۆیان کرد بەژوورێکی بچووک دا کە ژووری بیلیاردەکە بوو.

فنرابک و دوو ئەفسەرەکە دەستیان بەیاری خۆ کرد. ریابوڤچ کە تەنیا یاری وەرەقی دەزانی لە نزیکی مێزەکە وێستا بوو و بە ساردیەوە سەیری دەکردن. یاری کەرەکان دوگمەی چاکەتەکانیان کردبۆوە، دار بەدەست ئەم لاو ئەولایان دەکرد. بەدەم سوعبەت و گاڵتەوە زاراوەی هونەری یارییەکەیان بەکار دێنا.

کەس ئاگای لە ریابوڤچ نەما بوو. مەگەر جار جار یەکێک لە یاری کەرەکانی بەرکەوتبا و پێ ی گوتبا: «ببورە». تەواو بێ تاقەت بوو، یاری یەکەی بەجێ هێشت و لێپڕا بگەڕێتەوە بۆ ژووری میوان، لەژووری یاری وەدەرکەوت. هێشتا تەواو دوور نەکەوتبووە هەستی کرد رێ یەکەی لێ تێک چووە. باش بوو ئەو ژوورەی بیرما بوو کە سێ پێشخزمەتەکەی لێ دانیشتبوون. پێنج- شەش ژووری بڕی، هەستی کرد رێ یەکەی گوم کردووە. بە پەلە گەڕایەوەو بەدەستی چەپا پێچی

کردەوە، خۆی لەژوورێکی تاریک دابینی یەوە کە پێشتر نەی دیتبوو. هەڵوەستەیەکی کرد. بە لەپەکوتێ دەستی گەیاندە یەکەم دەرگا و کردی یەوە؛ تاریکستانێ بوو بۆ خۆی. روناکی یەک لەدرزی دەرگایەکی بەردەمی یەوە دەیدا لەژوورەوە. ئەم ژوورەش عەینی ژووری میوان پەنجەرەکانی کرابوونەوە و بۆنی گەڵای درەخت و گوڵاڵە سورە و وەنەوشەی لێدەهات.

ریابوڤیچ نەیدەزانی چ بکا، بۆیە بێدەنگ بوو. بێدەنگی بۆ چەند ساتێ باڵی بەسەر هەموو شتێک دا کێشا. پاشان دەنگی پێ ی یەکێک هاتە گوێ کە بەپەلە دەهات، نەخێر خشەخشی جلیش هاتە گوێ، ئەوجا دەنگی ژنێک کە هانکە هانکی پێ کەوتبوو. هاتە گوێی! «ئاخری یەکەی!...» لەپڕ دوو بازووی لە بۆنا هەڵکشاوی نەرم وشل کە بێ چەند و چون بازووی ژن بوون لە گەردەنی ئالان. گۆنایەکی گەرم لەگەڵ روومەتیا جووت بوو و ماچێکی دەنگدار لەسەر لێوی نەخش بوو. هێشتا ماچەکە بەتەواوی لەژوورەکەدا دەنگی نەدابۆوە کە ژنە نەناسەکە بەپەلە کشایەوە وهەڵهات. ریابوڤیچ وای زانی قێزی لێ ی هاتەوە بۆیە هەڵهات. ریابوڤیچ خەریک بوو هاوار بکا، بەپەلە بەرەو ئەو روناکی یەی کە لەدرزی دەرگاکەوە دیار بوو، تاوی دا.

کە گەیشتەوە ژووری میوان هێشتا دڵی هەر ترپە ترپی بوو، دەستەکانی بەئاشکرا دەلەرزین، ناچار خستنی یە پشت سەری وتێکی ئالاندن. هێند شەرمەزار بوو، پێ ی وابوو هەموو میوانەکان پێیان زانیوە کە هەنووکە ژنێک باوەشی پێدا کردووەو ماچی کردووە. لە سوچێکا دانیشت و بەترس و لەرزەوە روانی یە دەوروبەری خۆی، کە دیتی میوان و خانە خوێ هەموو سەرگەرمی سەماو قسەن، ترسەکەی رەویەوەو خۆی دایە دەم هەست و خەیاڵێکەوە کە یەکەمجار بوو لە هەموو ژیانی دا بەو جۆرە باڵی بەسەردا کێشابوو. بەسەرهاتێکی بێ وێنە رووی دابوو. گەردنی، کە تازە لە ژێر دوو قۆڵی گۆشتنی نەرم وشلی لەبۆنا هەڵکشاو هاتبووە دەر دەتگوت بە رۆن چەور کرابوو. نزیکی سمێڵی چەپی؛ شوێنی ماچەکە، فێنک و خۆش بوو، وەکو ئەوەی چەند دڵۆپە ئاوی پونگەیان پێداکردبێ وابوو. سەراپا غەرقی هەستێکی نائاسایی ببوو، ئەم هەستە نا ئاسایيە سات بەسات و دەم بەدەم گەشەی دەکرد و گەشەی دەکرد... پڕ بەدڵ حەزی دەکرد هەستێ و وەکو ئەو خەڵکە برەقسێ، تا دەتوانێ بەنێو باخەکە داغاربدا، لەقاقای پێکەنین بدا، هەر بیری نەمابوو کە شان و شەپیلکی داتەکیوە، لە هێزەکەیاندا کەس حیسابی بۆ ناکا،



ردێنی هەیە و هەمیشە هەستی بەکەمی کردووە. ئەم هەموو هەست و خەیاڵە خۆشانە بەرەکەتی گەرم و گوڕی لێوی ژنێک بوو کە ماچی کردبوو، کە ژنەکەی فنرابک بەتەنیشتی دا رەت بوو، ئەم هێندبە مەمنونی و منەتباری یەوە بەرووی دا گرژایەوە کە ژنە ناچار ئاورێکی لێ دایەوەو نیگایەکی پرسیار ئامێزی کرد. ئەمیش بە پەلە عەینەگەکەی رێک خستەوەو گوتی: «خوا تێکی نەدا خانوویەکی خۆشتان هەیە!» ژنەکەی فنرابک بەروو خۆشی و زەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە کە خانووی بابێتی، ئەوجا لێ ی پرسی کە ئایا ئەو دایک وبابی ماون؟ چەندە لەسوپا دا خزمەت دەکا؟ ئەدی بۆ ئەوەندە لاوازە؟ پاش ئەوەی وەڵامەکانی ئەوی گوێ لێ بوو لێ ی دارۆیی. هەرچەند قسەیان تەواو ببوو بەڵام ریابوڤیچ خێرا خێرا بزەی بۆ دەکردو بیری لەوە دەکردەوە کە ئاشنا تازەکانی چەند باش ومیوان پەروەرن.

کە شێو هات، ریابوڤیچ هەرچی یەکیان لەبەردەمی دانا وەکو مەکینە خواردی و خواردی یەوە، گوێ ی لە چ قسەیەک نەبوو. هەموو هۆش و گۆشی لای ئەو بەسەرهاتە ئاشقانەیە بوو.

بەسەر هاتەکە چۆن رووی دابوو؟ دیار بوو کە یەکێک لەکیژەکان -بەلێکدانەوەی ریابوڤیچ- ژووانی لەگەڵ خۆشەویستەکەی هەبووە و بەهەڵە ریابوڤیچی ماچ کردووە. بەبیری کێ دا هاتووە ریابوڤیچ رێ هەڵەبکاو لەو ژوورە تاریکەدا بگیرسێتەوە! کەواتە تا ئێرە چ نهێنی یەک لەکارەکەدا نی یە و تەواو رۆشنە. ریابوڤیچ لەخۆی دەپرسی: دەبێ کامە کیژیان بووبێ؟ بەچاوی کڕیارەوە کەوتە روانینی دەموچاوی ژنەکان. بێگومان گەنج بوە. چونکە پیرێژنان ئەم جۆرە رەفتارانەیان نی یە. کارەکەرەکەش نەبووە؛ چونکە بۆن و بەرامەی عەتر و خشەخشی جل و بەرگ و دەنگە ناسکەکە لە هی کارەکەران نەدەچوو.

هەوەڵجار روانییە کیژە شینپۆشەکە، زۆری بە دڵ بوو. شان و بازووی سفت وسپی وجوان، دەموچاوی ساف و زێتەڵە، دەنگی ناسک و زوڵاڵ بوو. ریابوڤیچ خۆزی دەخواست کە خۆی بووبێ.

بەڵام کە بزەیەکی دەستکردی بۆ کرد، چرچ ولۆچ کەوتە کەپوە درێژەکەی، وەکو پیرێژن هاتە بەرچاوی. ریابوڤیچ خیرا رووی لەو وەرگێرا و چاوی بڕی یە کیژە قژ زەردە رەشپۆشەکە. کیژە قژ زەردەکە بچووکتر و ناسکتر و سادەتر و لەبەردڵان تر بوو.

قژی لوول وجوان؛ هێندە بەنازو عیشوەوە پێکەکەی بۆ لێوی دەبرد پیاوی مەست

و خومار دەکرد. ریابوڤیچ خواخوای بوو کە ئەمیان بوو بێ. بەڵام کە بەجوانی دیقەتی دا سەیری کرد دەموچاوی سافە. چاوی بڕی یە کیژەکەی تەنیشتی ئەو، لەفکران ڕاچوو: «سەیرە. ئەگەر شان و بازووی کیژە شینپۆشەکە و قژی زەردو لوولی ڕەشپۆشەکە و چاوانی کیژەکەی تەنیشت لسبیتکف و. ..»

بە خەیاڵ هەموو ئەو جوانیانەی لێکداو مونتاژێکی تەواوی کرد و کیژی دڵخوازی خۆی دروستکرد، ئەو کیژەی کە ماچی کربوو. بەڵام ئەم کیژە تەنیا لە خەیاڵی ریابوڤیچ دا بوونی هەبوو.

شیو تەواو بوو. میوانەکان هەموو رازی و مەست ماڵئاواییان کرد. خاوەن ماڵ و ژنەکەی بەجووتە داوای لێبوردنیان لە میوانەکانیان کرد کە جێگایان نی یە تا شەوێ گلیان بدەنەوە.

جەنەراڵ گوتی: «زۆر بەخێرهاتن، گەلێ گەلێ خۆشحاڵ بووم». ئەمجارەیان پێدەچوو بە راستی بێ، چونکە خواحافیزی کردن و بەڕێکردنی میوانانی نەناس لە خێرهاتن و پێشوازی کردنیان ئاسانترە.

جەنەڕاڵ گوتی: «بەراستی خۆشحاڵ دەبم لەگەرانەوەشتاندا گەورەمان بکەن. ماڵی خۆتانە، شەرم مەکەن. لەکوێوە تەشریف دەبەن؟ لەگردەکەوە، یا لەخوارەوە؟ نا، نا لەخوارەوە بڕۆن، بەنێو باخەکەدا تەشریف بەرن نزیکترە.»

ئەفسەرەکان بەگوێ ی ئەویان کرد. باخەکە لە چاو ئەو ماڵە قەرەباڵغ و چراخانەدا، تاریک بوو. تا بەر دەروازەی باخەکە کەس وورتەی لێوە نەهات. کپی و ئارامی و سامی شەو ئەم پیاوە ناسک و نیوە مەستانەی خستبووە دنیای بیر و خەیاڵی قوڵەوە.

هەر هەموویان هەمان پرسیاری ریابوڤیچیان لە خۆ دەکرد: «ئایا رۆژێ دێ منیش وەکو فنرابک خانوویەکی گەورە و خیزانم ببێ؟ باخم هەبێ؟ میوانداری خەڵکی بکەم؟ چش با ئەم میوانداربیە لە دڵیشەوە دەرنەچێ، پێشوازی خەڵکی بکەم، رازی و مەست و تێر وپڕ بەڕێیان بکەم؟»

هەرکە لە باخەکە رەت بوون، هەموو دەمیان کرایەوەو کەوتنە قسان، لەپرو بێ چ هۆیەک لەقاقای پێکەنینیان دا. رێ یەکەیان دەچۆوە سەر چۆمەکە، کەناری چوومەکە دەوەنە جارێکی چڕوپڕ بوو، هەمووی چاڵ چۆڵ و کەند بوو. شۆڕەبی وسورە چناری کەنارەکە بەخێرایی لەبەر چاوی ئەفسەرەکان بەجێ دەمان. تەنیا رێگاکەی بەردەمیان بەتەواوی دیار بوو. ئەوبەری تاریکستانێ بوو چاو چاوی نەدەبینی! ناوە



ناوە ئاوی چۆمەکە وێنەی ئەستێرە رووناکو پرشنگدارەکانی دەنواندەوەو ئەمە تاقە نیشانەی خوڕی ئاوی چۆمەکە بوو. لەوبەری چۆمەکەوە مەلێکی خەواڵو بۆ تاقە جارێک ناڵاندی و لەجێ ی خۆی کڕ بوو. لەکەناری رێبازەکاندا و لەنێو لق و پۆپی دەوەنێکەوە بولبولێک بێ ئاگا لەو ئاپورایە بە دەنگی بەرز دەیخوێند. ئەفسەرەکان کۆبونەوەو کەوتنە راوەشاندنی دەوەنەکە. بەڵام بولبولەکە خۆی شیلو نەکردو لەسەر خوێندنی خۆی بەردەوام بوو. هەموو کە وتنە ستایشی بولبولەکە: پیری خۆشخوان، دنیای داوەتە بەرکلکان، خۆزگەم بەخۆی.

گەیشتنە سەر جادەکەی مەیدانی کلێسا. هەموو ماندوو ببوون. لەسەر پەڵە گیایەک دانیشتن و کەوتنە جگەرەکێشان. روناکی یەکی ئاماڵ سوور لەدوور دیار بوو. ئەفسەرەکان لەبەر ئەوەی چ قسەیەک نەبوو بیکەن کەوتنە باسی ئەم روناکی یە؛ ئایا روناکی ئاگرێکی هەڵایساوە یا روناکی گلۆپی ماڵێکە، یا هی شتێکی دی یە؟! ریابوڤیچ سەری هەڵبڕی، روانی یە روناکی یەکە، هەستی کرد بەو پێ دەکەنێ و چاوی لێ دا دەگرێ، وەک بڵێی لەکەین وبەینی ماچەکە ئاگادار بێ.

گەیشتنەوە جێ ی خۆیان. ریابوڤیچ بەپەلە جلەکانی داکەندو لەسەر تەختەکەی خۆی پاڵ کەوت. ریابوڤیچ هاوژووری لبیتکف و مولازمێکی دیکە بوو بەناوی «مرز لیاکف» کە پیاوێکی وردیلەی بێدەنگ و سەلار بوو. ئەم مولازمە پیاوێکی زۆر خوێندەوار بوو، بۆ هەر شوێنێ چوبا کتێبی «پەیامبەری ئەوروپا»ی لەگەڵ خۆدا دەبردو هەمیشە موتاڵای دەکرد. لبیتکف بەتۆی کراسێک بەنێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. خوڵامەکەی نارد کە بیرەی بۆ بێنێ.

مرزلیاکف لە سەرپشت راکشا، گری مۆمەکەی چاک کرد، کتێبی «پەیامبەری ئەوروپا» ی بەدەستەوە گرت و کەوتە موتاڵاکردنی. ریابوڤیچ لە دڵی خۆیدا گوتی: دەبێ ئێستا لە کوێ بێ؟ چاوی بڕی یە بن میچە دووکەڵاوی یەکە. هەستی دەکرد جێ ماچەکە هێشتا هەر فێنکە و تەزوویەکی خۆشی پێدا دێ، دیمەنی کیژەکان یەک یەک وەکو شریت بەمێشک و خەیاڵیا رەت دەبوون. شان و بازووی کیژە شینپۆشەکە، قژی لوول و چین لەسەر چینی کیژە رەشپۆشەکە، چاوانی گەش و خوماری کیژەکەی دی، کەمەری باریکی ئەوانی دی، بەرموورو تەوقە و قردێلەی کیژەکانی دیکە تێکڕا چاوشارکێیان لەگەڵ دەکرد. هەوڵی دەدا هەر هەموو ئەم دیمەنانە لەهزر و بیریا وێنە بگرێ و بەئامان و زەمان دەست بەرداریان نەبێ.

بەڵام بێهودە، دیمەنەکان بۆ تاوێ دەدرەوشانەوە، چاوبڕکێیان لەگەڵ دەکردو

پاشان ئاوا دەبوون. کە ئەم دیمەنانە لە تاریکی یەکەدا وون دەبوون، گوێی بۆ دەنگی هەنگاوی گورج وسرکی ژنێک هەڵدەخست، گوێی بۆ خشەخشی ژێر کراسی ژنانە و دەنگدانەوەی ماچەکە شل دەکرد.

خۆشی و لەزەنێکی بێهودە سەراپای داگرت. لەم خەیاڵە خۆش و بە لەزەتەدا بوو کە خولامەکەی لبتیکف بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوەو رایگەیاند کە بیرە دەست ناکەوێ. لبتیکف بە نیگەرانی یەوە کەوتە هاتووچۆ بە ژوورەکەدا. لەپێشا چووە نزیکی ریابوڤیچ، پاشان لە تەنیشت مرزلیاکف وێستا و گوتی: «هەتیوێکی گەوجە. کەرپیاوی وا لە کوێ بیرەی پێ پەیدا دەکرێ. خوێڕی!»

مرزلیاکف بێ ئەوەی چاو لەسەر کتێبی «پەیامبەری ئەوروپا» هەڵبڕێ گوتی «بەم شەوە لە کوێ بیرە لێرە پەیدا دەبێ.» لبتیکف هاواری کرد: «تۆش باوەڕت کرد، لەسەری مانگیش بم. لەماوەی ٥ دەقیقەدا هەم بیرەو هەم ژنیش پەیدا دەکەم. لەبنی عێزیشا بێ پەیدای دەکەم. گەوادبم ئەگەر پەیدای نەکەم!»

بەبێدەنگی خۆی گۆڕی، جگەرەیەکی داگیراندو وەدەرکەوت. لەراراوەکەدا هەڵوەستەیەکی کردو لەبن لێوانەوە کەوتە وورتە وورت: «رابک! گرابک! لابک!.. بەتەنێ نارۆم، هەر دێو کەولم دەکا. ریابوڤیچ وەرە با پیاسەیەک بکەین. چی؟» چونکە چ وەڵامێک نەدرایەوە، گەڕایەوە. بەئەسپایی جلەکانی داکەندو راکشا. مرزلیاکف هەناسەیەکی هەڵکێشا، کتێبەکەی داخست و مۆمەکەی کوژاندەوە.

لبتیکف دووکەڵی جگەرەکەی کرد بەنێو تاریکی یەکەدا و لەبەر خۆیەوە گوتی: تەگبیر؟!

ریابوڤیچ خۆی لەژێر چەرچەفەکەیدا گرمۆڵە کرد، هەوڵی دەدا بەخەیاڵ هەموو دیمەنەکان لێک بداو وێنەیەکی جوان جوانیان لێ دروست بکا، بەڵام خەون و خەیاڵەکان سرک و سڵ بوون وبۆی رام نەدەبوون هەر زوو خەوی لێکەوت. چونکە قەت نازی بەخۆوە نەدیتبوو زۆر شادو خۆشحاڵ بوو بەوەی ژنێک ئاوڕی لێ داوەتەوەو نازی کێشاوە، ئەم بیرو خەیاڵانە لە خەویشا هەر دەست بەرداری نەبوون.

کە لە خەو رابوو، نە چەوریەکەی قەد ملی و نەفێنکایی جێ راموسانەکە نەما بوون. بەڵام لەزەت وەکو دوێنێ شەو بەهەموو دەمارەکانیا دەگەڕا. جامی پەنجەرەکە لەبەر تیشکی هەتاوەکەدا دەبریسکایەوە، گوێی بۆ دەنگە دەنگی دەرێ هەڵخست. یەکێک لە ژێر پەنجەرەکەداو و بەدەنگی بەرز هەژدەر هەژدەر قسەی دەکرد؛ دەنگی «لبدتسکی» فەرماندەی هێزی تۆپخانە بوو کە تازە لە رێوە هاتبوو. نەڕەیەکی کرد و



گوتی:

– چ دی؟

– دوێنێ لە کاتی ناڵ کردنی ئەسپەکاندا، سمی ئەسپەکەی «گولوبچیک» کون بوو. بەیتاڵەکە دەستوری دا کە لەگەچ و سرکە بگیرێ. هەروەها قوربان دوێنێ شەو «ئارتمیڤ»ی میکانیک سەرخۆش بوو و جەنابی سەروان دەستوری دا کە بیخەنە سەر پێشی عارەبانەی تۆپەکە تا بێتەوە سەرخۆی.

سەرلقەکە لەسەر قسەکەی رۆیی: «کاریف بیری چووە سنگی خێوەتەکان و پەتی راکێشانی تۆپەکان بێنێ. ئەفسەرەکانیش شەوێ لەماڵی جەنەراڵ فنرابک میوان بوون.» لیدتسکی بەخۆو ردێنە سوورەکەیەوە لەبەر پەنجەرەکەدا قوت بۆوە، چاوە نزیک بینەکانی بڕیە نێو ژوورەکە. جماعەت هێشتا سست و خەواڵو لە نێو جێگاکانیاندا بوون. چاک وخۆشی لەگەڵ کردن و پرسی: «ئایا هەموو شتێک دروستە، خۆ چ کەموکوڕی یەکتان نی یە؟»

لبتیکف گوتی: «پشتی ئەسپەکەم روشاوە؛ نیرە نوێ یەکە گرتویەتی.» فەرماندە هەناسەیەکی هەڵکێشا، تۆزی داماوگوتی :«بەتەمام بچمە لای «ئەلکساند رایگوزفنا» وبیبینم، خواحافیز. شەوێ لەریگادا پێتان دەگەمەوە.»

پاش چارەکە سەعاتێک هێزەکە کەوتە رێ. وەختێ گەیشتنە ئاستی عەمارەکانی فنرابک، ریابوفچ ئاورێکی دایەوە و روانی یە ماڵی فنرابک،پەردەی پەنجەرەکان دا درابوونەوە، دیاربوو هەموویان خەوتوون.ئەویش، ئەویش کەپێش چەند سەعاتێ ئەمی ماچ کردبوو، هەنووکە لەغوڕا بی خەودایە. هەوڵی دا بەخەوتووی بیهێنێتە بەرچاوی خۆی. پەنجەرەی ژوورەکەی ئەوی هێنایە بەرچاوی خۆی کەلق و پۆی سەوز لە پەنجەرە وازەکەوە سەریان بردۆتە ژوورێ. فێنکی وخۆشی هەوای سپێدە، بۆنی سورەچنار، وەنەوشەو گوڵی سوور، سیسەم، کورسی، ئەو جلە جوانانەی دوێنێ شەو، جۆتێ پاپوجی بچکۆلە، سەعاتێ کەلەسەر مێزێک چرکە چرکی دەکرد ،هەرهەموو ئەمانە لەبەر چاویا بەر جەستەبوون، بەڵام سیمای، بزە تەڕو ناسک و پر مەحەبەتەکەی؛ واتەئەوەی کەگرینک بوو، وەکو چۆن جیوە لەدەستی بنیادەمدا ناوەستێ، لەخەیاڵی ئەودا بەند نەدەبوو پاش ئەوەی نیوقۆناغەرێ رۆییشتن، ئاورێکی دی دایەوە.کلێسازەرد باوەکە، ماڵەکە، باخەکەو چۆمەکە یەکپارچە غەرقی روناکی بوو ئاسمانی ساف و شین، رەخی یەکپارچە سەوزی چۆمەکە کەتیشکی زیوینی رۆژی گرتبووە باوەش، لەرادەبەدەر جوان بوو. ریابوفچ

دوانیگای کردن و وەکو لەشتێکی یەکجار ئازیزو خۆشەویست دابڕابێ هەستی بە خەمێکی گەورە کرد.

ریابوفچ بست بەبستی رێگاکە شارەزابوو، ئەم بەرو ئەوبەری رێگاکە گێڵگەی گەنمی پڕ لە مرۆر بوو. قەل و داڵ بەسەرکێڵگەکاندا دەفڕین و دەنیشتنەوە. بەردەمی تەپوتۆزو پشتی زەلام بوو،پشتەوەی تەپو تۆزو دەموچاوی زەلام بوو. چوار سەربازی شمشێر دار لەبەردەم هێزەکەوە دەڕۆیشتن؛ ئەوانە پێشقەرەوڵ و پاسەوانی هێزەکەبوون. لەدوای ئەوانەوە دەستەی کەڕەناو مۆسیقابوو. پێشقەرەوڵان و دەستەی جۆق و مۆسیقا وەکو دەستەی بەرێکردنی جەنازە کەوتبوونە پێشەوە وگوێپیان بەرێک و پێکی ریزەکە نەدەدا. ریابوفچ «٥» تۆپی لەبەردەم خۆیەوە دەبینی.بۆ بابایەکی نەشارەزا، ئەم کۆڕەوە سەخت و دوورو درێژەی هێزی تۆپخانە شتێکی سەیرە، بابایەکی نەشارەزا قەت لەوەتێ ناگا کەبۆ دەبێ تاقەتۆپێک ئەم هەموو پاسەوانەی لەگەڵ بێ! یا ئەم هەموو ئەسپەی بۆ چی یە؟ بەڵام بۆ یەکێکی وەکو ریابوفچ کەسەری لەو کارانەدا سپی کردبوو ببوو بە کارێکی رۆتینی و بەهیچ جۆرێ مایەی سەرنج نەبوو.ئەودەمێ ساڵ بوو دەیزانی کەبۆچی دەبێ سەرلقێکی شەیپوڕچی قوت و قیت بە سواری ئەسپ لەپشت ئەفسەری هەرتۆپخانەیەکەوە بڕوا، دەیزانی بۆ بەم سەرلقە دەڵێن «ئاردالّ»، دەیزانی بۆ چی ئەفسەران ورێنوێنان لە دوای ئەوەوە دەڕۆن،

ریابۆڤچ دەیزانی کە بۆچی ئەسپە نزیکەکان پییان دەگوترێ ئەسپی سواری و ئەسپە دوورەکان پێیان دەگوترێ ئەسپی یەدەک. هەڵبەتە ئەم زانیاریانە بۆ بابایەکی نابەڵەدو نەشارەزا و ئاسایی مایەی سەرنجن. سەربازێک بەسەر ئەسپێکەوە بوو هێشتا تەپوتۆزی دوێنێی پێوەبوو بەلەکپێچێکی لە لاقی راستی شەتەک دابوو کە تەواو بێ فایدە و بێ مەعنا دەهاتە بەرچاو. بەڵام ریابوفچ کەسوودی ئەم پوزەوانەیەی بەچاکی دەزانی بەلایەوە بێ فایدەو بێ مەعنا نەبوو. عەرەبانچی یەکان خۆ بەخۆ قامچی یەکانیان رادەوەشاند و شریخەیان لێ هەڵدەستاندن و هەندێ جاریش هاواریان دەکرد. تۆپەکان لە خۆوە سەرنجیان رادەکێشا.تورەکەی مشەماو جاوی پڕکاوو جۆ لەپێشی عەرەبانەی تۆپەکان بارکرابوون. مەقلّی و کاسە و گۆزە و قۆری بەتۆپەکانەوە هەڵواسرابوو. تێکڕا تۆپەکمان لە حەیواناتی بێ ئازار دەچون کەلەبەر هۆیەکی نادیار لەلایەن زەلامو ئەسپەکانەوە دەپارێزرا و شەش تۆپچی بەتەنیشت تۆپەکەوە دەڕۆیشتن و بازوویان بادەدا. لەدوای هەر تۆپێکەوەش



فەرماندەو ئەفسەران و سەرلق دەرۆیشتن. تۆپەکانی دیکش بە هەمان دەستور دەهاتن. تۆپەکانی دواوە ناشیرین بوون وشتاقیان سام و تامی تۆپی یەکەمیان نەبوو. چونگە هەرلقێکی تۆپخانە چوار تۆپی هەبوو، وتێکڕای هێزەکە شەش لقی تۆپخانەی هەبوو بۆیە هێزەکە مەودای نیوفەرسەخێکی گرتبۆوە.لەکۆتایی هێزەکەوە عەرەبانەیەک هێدی هێدی دەهات. ئەسپێکی مەجەڕی لە ژێر دابوو. یەکێک لەفەرماندەکانی هێزی تۆپخانە ئەم ئەسپەی لەتورکیاوە هێنابوو. ئەسپەکە سەری نەوی کردبوو؛ وەدەتگۆت بیر دەکاتەوە.

ریابوڤچ خەیالاوی دەچووە پێشێ. جارێ دەیروانی یە بەردە می و شان و ملی تۆزاوی ئەوانەی پێشەوە و جار جارێ ئاوڕی دەدایەوە دەیڕانی یە چارەی ئەوانەی دواوە، هیشتا هەر لەنەشئەی ئەو ڕێکەوتەی دۆینێ شەوابوو دەناوا نەبا ئێستا وەنەوزی دەدا. ئێستا غەرقی خەیاڵی خۆش و تازە بوو، ئەو رۆژە کە هێزەکە کەوتبووە رێ قەناعەتی تەواوی بەخۆی کردبوو کەمەسەلەی ماچەکە تەنیا رێکەوت بووەو هیچی دی، بەخۆی دەیزانی کەئەم ماچە چ بایەخێکی واقیعی نی یەو ئەگەر بەجدی بیگرێ و بەقوڵی بیری لێ بکاتەوە ئەوا خۆی دەخەڵەتێنێ. کەچی زوو بەزوو ئەقڵ و هۆشی باریان کردو تەسلیمی خەیاڵات وزندوە خەون بوو.

بەخەیاڵ خۆی لەژووری نان خواردنی فنرابک دادەبینی یەوە کەسەرگەرمی قسەوباسە لەگەڵ جوانێکا کەجوانی وناسکی کیژە شینپۆشەکەو کیژە قژ زەردەکەو کیژە رەشپۆشەکەی لەخۆدا کۆکردبووەوە. چاوی دەنوقاندو ئەمجارەیان خۆی لەگەڵ کیژێکی بێگانەی دی دا دەبینی یەوە، نازی دەکێشا، بەسەرشان وملی دا دادەنەو یەوە. ئەوجاخەیاڵی شەڕ و جیابوونەوەی بە سەردا دەهات.. ئەوجا دیدارو پێک گەیشتنەوە.. هەرجارێ کە دەگەیشتنە سەرگردێک ئەم فەرمانە لەگوێ هەمووان‌دا ذەنگی دەدایەوە:« لەسەر خۆ بڕۆن» ریابوفچ ش هەمان فەرمانی دووبارە دەکردەوە:« لەسەر خۆ بڕۆن.» وهەر جارێ کەفەرمانەکەی دووبارە دەکردەوە ترسی لێ دەنشت کەنەبادا تەلیسمی ئەفسونەکە بشکێ ودنیای خەیاڵی لێ بشێوێ.

ئەم تەلیسمە تا نزیکی نیوەرۆ نەشکاو باڵی بەسەر هزرو بیریداکێشا، نیوەڕۆ لەو سەری هێزەکەوەو بەدەنگی بەرز جاڕی فەرمانێک درا: «ئەفسەرەکان وریابن! بڕواننە راست!» جەنەرالی بەرپرسی هێزەکە بەگالیسکەیەکی دوو ئەسپی ی سپی یەوە وە دەرکەوت، چەند ئەفسەریک کەریابوڤج ش یەکێک بوو لەوانە غاریان دا. جەنەرال گوتی :« کارو بارتان لەچ دایە؟» ئەوجا چاوەسورەکانی تروکاندن ولەسەری

رۆیی:

« خـۆکـەس نەخـۆش نی یە ؟!» جـەنەراڵی وردیلەی لاواز پاش ئەوەی وەلام درایەوە، کەمێ تێفکری و رووی کردە ئەفسەرێک و گۆتی:« ئەوە بۆ ئەسپ سواری تۆپی سێـیـەم زەنگاڵەکەی داکەندووەو بەتۆپەکەوەی هەڵواسیـوە؟ خوێڕی سزای بدە؟!» پاشان رووی کردە ریابوڤچ و گوتیی: زینی ئەسپەکانی لقەکەی تۆش لە شل و شێواو دەچێ. چەند شتێکی تری لەوبابەتەی گوت و ئەوجا رووی کردە لبتیکف وبەپێکەنینەوە گـوتی:« مـلازم لبـتـیک ئەوە بۆ وا چارەت داوە بەیەک دا، بیـری خاتوو «لوپوخوف» دەکەی ها؟ کوڕینە وا دیارە بیری خاتو لوپوخوف دەکا.»

خاتوو «لوپوخوف» ژنێکی باڵا بەرزی قەڵەو بوو، تەمەنی نزیکەی پەنجا دەبوو. چونکە جەنەراڵێ بەخۆی حەزی لەژنی قەڵەو دەکردو هێندەگوێ ی بەتەمەن نەدەدا، وای دەزانی ژێر دەسـتـەکـانیـشی هەمـان زەوقـیـان هەیە. ئەفـسـەرەکـان بەڕێزەوە پێکەنین. جەنەراڵ زۆری کـەیف بەوە هات کـە قـسـەیەکی خـۆشی بۆ ئەفـسـەرەکـانی کردووە. دەستێکی دا بەپشتی گالیسکەچی یەکەداو سەڵاوێکی کردو گالیسکەکە رەت بوو.

گالیـسکەکەی جـەنەراڵ تەپوتۆزوگـەدەلوولی لەدوای خۆیەوە هەستـانـد. ریابوڤچ بەدەم تەماشاکردنی گەردەلوولەکەوە لەفکران ڕا چو: «تومەز ئەوەی لای من خەیاڵە، لەلای خەڵکی ئاساییەو زۆر کەس پێ ی گەیشتون. ئەم ڕێکەوتە، هەمـوو رۆژێکی خـوا روو دەدا و هەر هەمـوویان مـاچیـان جـەڕباندووە. بۆنموونەئەم جـەنـەراڵە پیـرە لەگەنجی دا بەقەد تووکی سەری من ئاشقێنی کردووە و ئێستاش ژن و منداڵی هەن. نەقیب - فاشتر - ش ژنی هەیەو ژنەکەشی خۆشی دەوێ، خۆ چارەشی دوو فلسی قـەڵب نایەنێ. ..سلمـانوف پیـاوێکی تورەو ترۆیەو هەرلەمـەغـولیـان دەچێ کـەچی بەئاشقێنی ژنی خواستووە!... یانی ئەم شادی یە هەر بۆ خەڵکی رەوایە؟ من پێ ی ناگـەم؟! نا، نامنیش درەنگ یا زور هەرپێ ی دەگـەم» .دڵخۆشی خۆی بەوە دایەوە کـەئەویش وەکـو خـەڵکی یە و لەهیچ کـەسـێک کـەمـتـر نی یە، ئەمـجـارەیان بە جورئەتەوە جلەوی بۆ خەیاڵ شل کردو، ئەوو خۆی هێنایە بەرچاو کەلەوپەڕی خۆشی و شادی دابوون.

دەمەوخۆرئاوا هێزەکە گەیشتەجێ ولایدا. ئەفسەرەکان هەموو شەکەت و ماندوو لەخێوەتی خۆدا لێ ی کەوتن. بەڵام ریابوڤچ، مرزلیـاکف و لبیـتکف سـەندوقـێکی پڕیان کـرد بە مـێـزو شیـوەکـەیان لەسـەر خـوارد. مـرزلیـاکف بەدەم نان خـواردنەوە



کـتـێـبـەکـەش ی دەخـوێندەوە، لبـیـتکف هەژدەر هەژدەر قـسـەی دەکـردو بیـرەی لەپەرداخەکەی خۆی دەکرد. ریابوفچ کە گێژ وکاسی زندە خەوی بەردەوامی رۆژ بوو، بەبێـدەنگی نانی دەخـوارد. پاش پێکی سێـیـەم مـەست بوو، گـیـانی سـست بوو، شـەرمی شکاو کـەوتە گـێـڕانەوەی بەسـەر هاتەکـەی خـۆی:« کـوڕینە من لە مـاڵی فنرابک تووشی شتێکی سەیر بووم» دەیوست واخۆی بنوێنێ کەئەم شتانەی بەلاوە ئاسـاییـەو گـاڵتـەی پێ دێ :« ویسـتم لەژووری بیلیـاردەکـە بێـمـە دەر کـەچی لەریگادا...» بە ئاووتاو هەموو وردو درشتێکی ماچە مێژوویەکەی گێڕایەوە. بەو بوایە گـێـڕانەوەی ئەم داسـتـانە خـۆشـە هەر تەواو نەبوایە و تا بەیانی درێژە ی بکێشایە.

وەختێ ریابوفچ لەگێرانەوەی بەسەرهاتەکەی بووەوە،لبتیکف کەبەخۆی پیاوێکی درۆزن بوو و باوەری بە قسەی چ کەسێک نەدەکرد، لەرووی نەباوەڕێ یەوە پێکەنی. مـزرلیـاکف برۆکـانی وێک هێنایەوەو بەدەم مـوتاڵا کـردنەوەو بەبێ مـوبالاتی یەوە گـۆتی:«خـوا دەزانێ کێ بووە؟ ووتت خـۆی پێـتـا هەڵواسی و هاواریشی نەکـرد؟ یادەبی ئەقلی سووک بوو بێ یا شێت بو وە!؟ ریابوفچ گوتی :« قسەی تۆیە رەنگە شێت بووبێ.»

لبـیـتکف گـوتی:«ئەوە منیش جـارەک شـتـێکی، وام لێ هەڵکەوت. دەچووم بۆ «کوڤنو» سواری قیـتار بووم و بلیـتی نمرە دووم بڕی بوو.فـارگۆنەکە پڕ پڕ بوو، خەوم نە دە هات. هەستام رۆبلێکم دایە پاسەوانی قیـتارەکە، جانتاکەی هەڵگرتم و برد می یە فـارگـونێکی نمرە یەک. لەوێ راکـشـام و پەتۆکـەم بە خـۆم دا دا،زۆر تاریک بوو. لەپڕ هەسـتـمکرد یەکـێک دەسـتی خـسـتـە سـەرشـانم، نەخـێـر هەناسـەی بەر دەموچاوم کەوت. دەستم درێژ کرد،بەرئانیشکی کەوت. چاوم هەڵبڕی چ ببینم! ژنێ بوو چاوانی رەش وەکـو زوخاڵ، لێوی سـوور عـەینی یاقـوتی ئەسڵ، هەناسـەی بۆنی ئەشقی لێدەهات مەمکی قوت و توند...»

مـرزلیـاکف بەهێمنی قسەکەی پێ بری!» دە فشە فش! سەبارەت بەمەمکەکانی هەرچی یە بلێ ی رەنگە باوەڕت پێ بکرێ، بەڵام کـە زۆر تاریک بوو، چۆن لێـوە سوورەکانیت بینی؟» لبیـتکف بۆ ئەوەی درۆکەی خۆی پینە بکا پێکەنی. ریابوفچ زانی گاڵتەی پێ دەکا، بۆیە نارەحەت و دڵتەنگ هەستاو چوو لەسەر تەختەکەی خۆی راکشاو سۆیندی خوارد کە ئیدی هەگیز باوەڕ بەکەس نەکا.

ژیانی ئوردوگاکەیان بەشێوەیکی ئاسایی دەڕۆیی، رۆژان چون یەک تێ دەپەڕین.

ریابوفچ ئاشقانە بیری دەکردەوە.

بەیانیانی زوو کەخولامەکەی ئاوی ساردی بۆ دێناو ئەو دەموچاوی پێ دەشت لەپڕ ئەوەی بەبیرا دەهات کە:« ژیانی گۆڕاوەو ئەو دنیا چۆڵ و هۆڵەی جاران نی یە.»

شەوان کەهاوڕێکانی باسی ئاشقێنی و ژنانیان دەکرد، ئەو لەنێو کورسی یەکەی دەخزی، ودەتگوت سەربازێکی پیرەو باسی ئەو جەنگانە دەگێڕێتەوە کە بەشداری تێدا کردوون. هەندێ جار ئەفسەرەکان، ملازم لبیتکف ی مێبازیان دەدایە پێش خۆو دەچوون بۆ مێبازی. ریابوفچ بەناچاری بەگەڵیان دەکەوت، بەڵام ویژدانی نارەحەت بوو، رەفتارو ئەتواری ساردو سڕبوو، لەدڵی خۆیدا پۆزشی بو «ئەو» یانی دەنکە خەیالی یەکەی دێناوە. ئەو شەوانەی کەخەوی دەزڕاو مێشکی پڕ دەبو لەبیرەوەری منداڵی، باوکی ودایکی وهەموشتێکی دیکەی دڵگیری بیر دەکەوتەوە. ئاکام بەوە دەشکایەوە کەیادێکی میستچکی، ئەسپەجوانەکە، فنرابک، ژنەکەی کە دەتگوت شای جوانانە، ژووره تاریکەکە، روناکی یەکەی دزری دەرگای گۆرین بکاتەوەو بیرەوری یە خوشەکانی پێ برازێنێتەوە.

لە ۵/۳۱ دا ریابوفچ لەگەڵ دوو مەفرەزەدا گەڕایەوە،ریابوفچ وەکو چۆن دوورخراوەیەک بۆ وولاتی خۆی بگەڕێتەوە لە خۆشیان لەپێستی خۆی نەدەهێوری و بەر دەوام زندە خەونی دەبینی،تامەزرۆی دیداری ئەسپەکە، کلێساکە، فنرابک، تامەزرۆی ژووره تاریکەکەبوو. تامەزرۆی ئەو دەنگە نەمرە بوو کەلەگۆی ی هەموو ئاشقاندا دەنگ دەداتەوە و ئاشقانی دابڕاو لەیارفربودەدا.ئەو دەنگە نەمرە لەگۆێیدا دەنگی دەدایەوە و دڵنیای دەکرد کە: «جارەکی دیکە دەی بینێتەوە.» بەڵام گۆمان بەهیلاکی دابوو. چۆن دەی بینێتەوە؟چی پێ بڵێ؟ ئاخۆ ماچەکەی بیرماوە؟! ئەدی ئەگەر بۆنەگبەتی هەرگیز نەی بینێتەوە؟هەرخۆێ دڵخۆشی خۆی دەدایەوە کە« جارێکی دی خۆی بەژوورەتاریکە کەدا دەکاتەوە و هەرنەبێ یادێکی گەرم و گوڕی شەوی گۆرین دەکاتەوە.»

دەمەوئیوارە، عەمارە سپێ یەکان وکلێساکە لە دوورەوە بەدیار کەوتن. دڵی ریابوفچ کەوتە پەلە پەل. ئەفسەرەکەی تەنیشتی قسەی دەکرد. بەڵام ئەم گوێ ی لی نەبوو. ئاگای لە دنیا نەمابوو.بە تاسەوئەڵهایەکی سەیرەوە چاوی بڕیبە ئەوچۆمەی کەلەدوورەوە دیاربوو ولەدیاری مەحبوبەدا دەبرسکایەوە. روانی یە سەربانە سەوزەکان، روانی یە ئەو کۆترخانانەی کەکۆتری جوان جوان بەسەریاندا دەفڕین



وهەتاوی دەمەوئێوارە تیشکی زێڕینی دابوو لەباڵیان.

ریابوفچ رووی ئەسپەکەی کردە کلێساکە، دیسان دەنگە گرەکەی ئەفسەری دارایی لەگوێچەکەیدا گیرسایەوە.. بەتەمابوو لە ئان و ساتدا سوارێ لەپشت پەرژینەکانەوە دەرکەوێ و دەعوەتی چایان بکا. بەڵام ئەفسەری نێوبراوقسەکەی خۆی تەواوکرد، ئەفسەرەکانی دی بەپەلەروویان کردە گوندەکەو چ هەواڵێک لەئەسپ سواری گۆرینەوە نەبوو.

ریابوفچ بەوە دڵی خۆی دەداوە کە:«ئەگەر فنرابک پێ بزانی کە گەڕاوینەتەوە دەنێرێ بەشوێنماندا» هێند لەم مەزەندەیەی خۆی دڵنیا بوو کەوەختێ خۆی بەکوختەکەدا کرد پێ ی سەیر بوو هاورێکانی مۆمیان هەڵایساندوەو دەستور بە خوڵامەکانیان دەدەن سەماوەر پێ بکەن!

ئارەزویەکی پڕسوێ نارەحەتی کردبوو، لەسەر تەختەکەی پاڵکەوت.پاش تۆزێک هەستا تابزانێ سوارەکە دەرکەوت یانە؟ چ سوارێ دیارنەبوو، دیسان پاڵ کەوتەوە. هەمدیس هەستایەوە. ئەمجارەیان بەرگەی نیگەرانی نەگرت و کەوتە کوچە و کۆڵانان و رووی کردە مەیدانی کلێساکە.مەیدانەکە تاریک و چۆڵ وهۆڵ بوو. سێ سەرباز هێدی و ئارام لەسەرگردەکە وەستابوون، کەئەویان بینی رەق راوەستان و سەلامیان بۆ کرد. سەلامەکەی سەندنەوەو بە رێگای خۆیدا نشێو بووەوە.

پەڵە هەوری ئەرخەوانی بەئاسمانی پشت چۆمەکەوە دیاربوو. مانگ ووردە ووردە بەرز بوەوەو لەنێو ئەوپەڵە هەورە ئەرخەوانیانەوە بەدیار کەوت. دوو ژنە دێهاتی بەدەم قسەکردنەوە بەنێو بێستانێک کەوتبوون و گەڵا کەلەرمیان دەکردەوە. ماڵەکانیان کەوتبووە پشتەوەو لەتاریکی یەکدا مت ببوون. کەناری چومەکە هەروەکو خۆی وابوو، هێشتا هەرسەوزبوو، بنجک و دەوەنەکان وەکو خۆیان بوون. بەڵام ئەمجارەیان چریکەی بولبول نەدەهات و بۆنی درەختی چنارو گیای تازەکەم ببوو.

ریابوفچ گەییە ئاستی ماڵی فنرابک، چاوی نابەکونی دەروازەی باخەکەوەو دزەنیگایەکی کرد. هەموو شتێک هەربێدە نگ وتاریک بوو. لێرە ولەوێ کۆتەرە دارێک بەئاستەم سپی دەچووەوە. باخەکە کش و مات بوو. ریابوفچ گوێی هەڵخست، چاوی بری یە ژورەوە؛ نزیکەی چارەکە سەعاتێک بەو دەقەوە مایەوە، پاشان بێ ئەوەی دەنگێ بژ نەوێ یاروناکی یەک بدینێ، شەکەت و خەمبار گەڕایەوە.

گەیشتە قەراغ چۆمەکە، گەرماوەکەی جەنەراڵ لەبەردەمی دا بوو، خاولی سپی و توکن درابوون بەسەر تەیانی پردەکەدا، لەپردەکەوە سەرکەوت و تاوێک وێستا. دەستێکی لە خاولی یەکان دا !تەڕو سارد بوون. لەسەرێ را روانی یە چۆمەکە، چۆمەکە بەخێرایی دادەکشا. هاڕە و هاژەی ئاوەکە لەغەڵبە غەلبێکی نامەفهوم دەچوو؛ وەک ئەوەی جنێوبێ و بەپایەی گەرماوەکە بدرێ!بەدەستی چەپاو لەسوچێکەوە تریفەی سورباوی هەیڤ لە نێو ئاوەکە عەکس ببووەوە.شەپۆلی چۆمەکە، جارێ ئەم روناکی یە سورباوەی لە ئامیز دەگرت، جارێ وەکو شمشێر دوولەتی دەکردو جارێ ووردو خاپوری دەکردو چەشنی ئاومالکەو نەمامی بچووک رای دەماڵی.

ریابوفچ چاوی بری یە شەپۆلەخێراکان و گوتی :« چەند بێهودەیە! ئەرێ وەڵڵا بیهودەیە ! خوایە؛ هەموو شتێک پوچ و بێ مەعناو بێهودەیە!»

وەختێ هیوای لەدڵدا نەما، ناچار لەئەسپی خەیاڵ دابەزی.مێژووی ماچەکە، بێ قەراری خۆی، گڕی ئەشقەکەی. ئارەزووە ئالۆزەکانی، سەرلەبەرکەوتنەبەر روناکی یەکی ئاشکرا، دەستی لە هاتنی سوارەکەو دیتنی ژنەکە شۆرد؛.. ئەوژنەی کەبەرێکەوت ئەمی لەبری یەکێکی دی ماچ کردبوو.

ئاوی چۆمەکە بەتەنیشتیا دەڕۆیی، کەس نەیدەزانی بوکوێ دەڕوا. مانگی پێنج بوو وکەچی ئاوەکەهەر خێرا دادەکشا، ئیدی چۆمەو عەودالی روبارە، روبارەو ئاشقی دەریایە، دەریایەو ئالکاوی تەم و مژو شەپۆلی زەلامەکە لەوەیە ئەم ئاوە هەمان ئاوی گۆرین بوو بێ کەئیستا بەمجۆرە بەبەرچاوی ریابوفچەوە دەڕۆیی. بەڵام بۆ؟ مەبەستی چ بوو؟ سەرلەبەری دنیاو ژیان لەبەرچاوی ریابوفچ تاریک بوو وبێهودە دەی نواند.

چاوی لە چۆمەکە گواستەوە و روانی یە ئاسمان. ئەوەی بیری خۆی هێنایەوە کە چۆن قەدەر بۆ تاقەجارێک بەسەری کردەوە و ژنێکی نەناسی رەخساند کەماچی بکا. چ خەون و خەیالی شاعیرانەی هەبوون وەکو فیلم بۆ خۆی لێدایەوەو سەیری کرد سەرلەبەری تەمەن و ژیانی پوچ و بێهودەو بێ مەعنابووە.

کەگەیشتەوە کوختەکەی خۆیان، هاوڕێکانی لەوێندەر نەبوون.

خولامەکەی پێ ی راگەیاند کە: «هەموو چوونە بۆ مالی جەنەرال فنرابک، جەنەرال سوارێکی بەدوودا ناردبوون و دەعوەتی کردبوون.» گەشکەیەکی کورت خایەنی کەوتە نێو دڵ و دەرون. بەڵام ریابوفچ ئەم گەشکەیەی سەرکوت کردو دای



مرکاندەوە؛ بەدەم گلەیی کردنەوە لە بەختی خۆی، خۆی دا بەسەر تەختەکەیداو وەکو یەکێک بیەوێ تۆڵە بستێنێ، خوێ لەدەعوەتەکەکەڕ کردو گو ێی نەدایێ.

# هەڵاتن

سەربەهوردێکی بێ کۆتایی بوو. پاشکاو دایکی لە باراندا تەڕ ببون، چەندین قۆناغ بەپێیان هاتبوون. دەشت و پەرێزیان بڕی بوو. ئەوجا گەیی بوونە سەر جادە جەنگەڵی یە کان. جادەکان یەکپارچە گەلای رژاوی درەخت بوو. تاکو سپێدە هەر بەپێیان هاتبوون. پاش ئەو هەموو رێکردنە دوو دانە سەعاتی خشت لە بەر دەرگای عیادەدا وەستابوون وچاوەنۆڕ بوون دەرگایان لێ ڤەبێ. هەڵبەتە ژێر کۆڕنیشی دەرگاکە لەدەرێ گەرمتر ووشکتر بوو. بەلام وا دیاربوو بایە لاسارەکە ئەویشی پێ رەوا نەدەبینین و پروشە بارانی لەگەڵ خۆدا دێنا. هەرکە ژێرکۆڕنیشەکە پڕ بوو لەنەخۆش و دەردە داران. پاشکاخۆی بەنێو ئاپوراکە دا کردو دەموچاوی کرد بەژێر چمکێکی فەروەکەی دا کەبۆنوی ماسی خوێکراوی لێدەهات، خەوبردی یەوە.

ئەنجام دەرگە کرایەوە، پاشکاو دایکی خۆیان لە هۆڵی چاوڕوانی دا بینی یەوە، دیسان چاوەڕوانی... نەخۆشان لەسەر تەخت و کەرەویتەکانی نێو هۆڵەکە رۆنیشتن. کەس جوڵەی نەدەکرد.کەس زاری هەڵنە دەهێنا. پاشکا ئەبڵەق و واق وڕماو چاوی بڕی یە ئاپوراکە. هەر چەندە زۆر شتی سەیرو پێکەنین هێنەری بەر چاو کەوت، بەلام لێوی لەبەر یەک هەڵنەهێنان. تەنیا جارێک نەبێ کە کورێک بەتاقە لاقێکەوەو بەهەڵقون هەڵقون وەژوور کەوت، پاشکا ژەنی یە قەپرغەی دایکی یەوە و سەری وەبن فەروەکەی خست و بەپێکەنینەوە گوتی: «دایکە تەمەشا، حاجی لەق لەق»

– کڕ بە رۆڵە.

لە پشت پەنجەرەیەکی بچوکەوە، سەرو سەکوتی خەوالۆی پزیشکیارەکە وە دیار کەوت و گوتی: «وەرن ناوەکانتان بنووسم.»

نەخۆشەکان تێکڕاو لە هەموویان دیارتر کورە یەک لاقەکە بەرەو پەنجەرەکە هێرشیان هێنا. پزیشکیارەکە ناو وشۆرەت و ناوی گوند و نەخۆشی هەر یەکیکیانی



دەپرسی و وورده پرسیاری دیکەشی لێدەکردن. پاشکا بە وەڵامەکەی دایکیا بۆی دەرکەوت کەناوی «پاڤل گالاکتیوننف»ە، عەمری حەوت ساڵانە، لە جەژنی ئیستەرەوە تا ئێستا نەخۆشە.

نەخۆشەکان ناونووس کران، هەر یەکەو چاوەڕوانی نۆرەی خۆی بوو. دکتۆوەکە بە بەرکۆشەی سپی یەوە و خاولی یەک بەسەر شانی یەوە لە هۆڵی چاوەروانی یەوە تێ پەڕی. کە گەییە ئاستی کورە یەک لاقەکە دەستێکی دا بەسەر شانی داو گوتی: «عەجەب وولاغێکی، توخوا تۆ وولاغ نیت؟ من پێم گووتیت دوو شەممە وەرەوە کە چی جومعە هاتویەوە. من لە تۆ پتر خەممە. ئەگەر ئاگات لە خۆت نەبێ لاقت لە دەست دەدەی، ها!» کورە یەک لاقەکە گرژ بوو، وەکو گەدایان کەوتە پاڕانەوە: «ئیڤان نیگولاڤیچ...مەعز بۆ خوا...»

دکتۆرەکە بەسەر زەنشتەوە گوتی: «ئیڤان نیکولاڤیچی چی! پێم گوتیت دوو شەممە. دەبێ بەقسەم بکەی. بەلام فایدەی نی یە تۆ وولاغیت قسە ناچێ بەگوێت دا.»

دیداری نەخۆشان دەستی پێکرد. دکتۆر لەژووری خۆی ڕونیشت و کەوتە گازکردنی نەخۆشەکان، لە ژووری دکتۆرەوە دەنگی گریانی منداڵان، ئاهو ناڵەی نەخۆشان، گلە و گازندەی تورەی دکتۆر دەهاتە گوێی: «هاوار مەکە، خۆ ناتکوژم، ئارام دانیشە!» ئاخری نۆرەی پاشکا هات. دکتۆر گازی کرد: «پاڤل گالکتیونڤ».
دایکی پاشکاهەوەڵجار گێژ بوو، بەلام خێرا هاتەوە سەرخۆ، دەستی پاشکای گرت و بردی بۆ ژووری دکتۆر. دکتۆر لە پشت مێزێک دانیشتبوو، راستەیەکی بەدەستەوە بوو و خۆ بە خۆ دەیکێشا بەکتێبێکی ئەستوردا.

دکتۆر بێ ئەوەی سەری هەڵبڕێ و سەیریان بکا گوتی: «چی یەتی؟»

دایکی پاشکا گوتی: «ئانیشکی کوڕەکەم لووی لێهاتووە» بەجۆرێ دەموچاوی گرژ بوو وەکو ئەوەی بەخۆی ئازاری لوی کوڕەکەی بچێژێ.

دکتۆر گوتی: «جلەکانی داکەنە.» پاشکا بە هانکە هانک مل پێچەکەی کردەوە. کەپوی بەسەری قۆڵی سڕی و دوگمەی پالتۆکەی ترازاند.

دکتۆرەکە بە تورەییەوە گوتی: «خاتوون خۆ نەهاتویتە میوانی؟ بۆ پەلە ناکەی، خۆ هەر تۆ چاوەڕوان نیت؟»

پاشکا بەپەلە چاکەتەکەی داکەند و فڕێی دایە سەر عاردەکەو بەیارمەتی دایکی کراسەکەشی داکەند. دکتۆر بەساردی یەوە کەوتە سەیر کردنی، ئەوجا کێشای بە

وورگی داو گـوتی: «کـاکـە پاشکا گـەورەش بووی!» ئەوجـا گـوتی: «ئادەی ئانیشکت.» پاشکاکە چاوی بەجامێکی خوێناوی کەوت ترسی لێ نیشت! چاوی بڕی یە بەرکۆشەی دکتۆرەکەو دەستی بەگریان کرد. دکتۆر بە گاڵتەوە گوتی: ئای لەوە، شەرم ناکەی، بڕوانە تۆ وەختی ژن هێنانتە و کەچی دەگریت، عەیب ناکەی لە خۆت!»

پاشکا دەیویست بەسەر گریانەکەیدا زاڵ بێ. چاوی بڕی یە دایکی.

سیمای دەیگوت: «دایکە کە چووینەوە لای کەس نەڵێ ی لە خەستەخانە گریاوم.»

دکتۆر تەماشای ئانیشکی پاشکای کرد. یەک- دوو جار نووشتانی یەوە ئاهێکی هەڵکێشا؛ لێوی هەڵقورتاندو دووبارە دەستی بە ئانیشکی پاشکا دا هێنا. گوتی: «خانم خاس هەقی بەرد بارانت بکەن، بۆ زووتر نەت هێناوە؟ بازووی منداڵەکەت فەوتاوە، تۆ تەماشاکە کەرە، نابینی جومگەکەی فەوتاوە.» دایکی پاشکا گوتی: «تۆ باشتر دەزانی باوکە گیان.»

– باوکە گیان! بازووی منداڵەکەی فەوتاندووەو لە باوکە گیان باوکە گیانی خۆی ناکەوێ! ئەوە ئەگەر بە ئاستەم سەری کەپوی ئاوسابا هەر لەوێوە تائێرە بەغار دەهاتی. بەڵام لەبەر ئەوەی بازووی بەدەرەوە نی یە داش بڕزێ، کرمێ بێ گوێی نادەیێ. ئێوە هەمووتان وەکو یەکن!»

جگەرەیەکی داگیراند، بەدەم دوکەڵی جگەرەکەوە شەڕی بەدایکی پاشکا دەفرۆشت. لەبن لێوانەوە وورتە وورتێکی کرد، ئەوجا سەری هەڵبڕی و لەفکران ڕاچوو. پاشکا بەرووت و قووتی لەبەر دەمیا وێستا بوو، گوێ ی بۆ وورتە وورتەکە ڕادەدێراو چاوێکی لەدووکەڵی جگەرەکە بوو. کە جگەرەکەی تەواو بوو ئەوجا بەکاوەخۆ کەوتە قسان: «گوێ بگرە خانم، چەورکردن و دەرمان بێفایدەیە، دەبێ لێرە بیخەوێنی.»

– تۆ چۆنت پێ چاکە با وابێ.

– دەبێ عەمەلیات بکرێ...«تۆش پاشکا دەبێ لێرە بمێنی یەوە!»

ئەمەی گوت و دەستێکی پڕ سۆزی بەشانی پاشکادا داو لەسەری ڕۆیی:

«دایکت دەنێرینەوە تۆ لای من دەمێنی یەوە. ئێرە ناخۆش نی یە، من لێرە دارو درەختیشم هەن، هەرکە تۆزێ چاکتر بووی پێکەوە دەچینە ڕاوەکێشکە. ئەوجا ڕێویت نیشان دەدەم، باشە؟ دەمێنی یەوە؟ دایکیشت سبەی دێتەوە بۆ لات.»



پاشکا نیگایەکی پرس ئامێزی دایکی کرد. دایکی گوتی: «دەبێ وەمێنی ڕۆڵە.»

دکتۆر بەروو خۆشییەوە گوتی: «ئا، ئا دەمێنێتەوە، ئاقڵە، جا ڕێوییەکی زیندوو زیندووی نیشان دەدەم. پێکەوە دەچینە جومعە بازاڕ و شەکرلەمەی بۆ دەکڕم. ماریا دنیستونا، بیبە سەرێ.»

دکتۆر بەزمانی شیرین پاشکای ڕام کرد. پاشکا هەرگیز نەچوو بووە جومعە بازاڕ، ڕێوی زیندووی نەبینی بوو، زۆری دڵ پێوە بوو کە جومعە بازار و ڕێوی زیندوو بدینێ. بەڵام دڵێکی هەر لای دایکی بوو، چۆن تەگبیری ئەمە بکا؟ لە دڵی خۆیدا تەگبیرێکی باشی بۆ ئەمەش کرد، لێپرا تکا لە دکتۆر بکا کە بێڵێ دایکیشی لەگەڵیا بمێنێتەوە. بەڵام بەر لەوەی زار بکاتەوە، پەرستارەکە رای رفاندە سەرێ. حەپەساوو ئەبڵەق کەوتە هەڵڕوانیین. قاڵدرمەکان، دیواری ڕاراوەی ژوورەکان، دەرگاو پەنجەرەکان هەموو بە بۆیەکی زەردی جوان بۆ یەکرا بوون. لە هەموو لایەکەوە بۆنی داو دەرمان دەهات، دەتگوت بۆنی کەرە یەکە و زۆر ماوەتەوە.

فەرش و مافور لە هەموو شوێنێ ڕاخرابوو، بۆری سپی و بریقەداری ئاو بەقەد هەموو دیواریکەوە بوو. بەڵام پاشکا لە هەموو ئەمانە پتر دڵی بەجێگەکەی دەکرایەوە.لێفەیەکی توکنی کەوەی بەسەرەوە بوو. کە دیقەتی پشتی و سەرین و لێفەکانی دا، گەییە ئەو قەناعەتەی کە دکتۆر ماڵێکی چاک و پۆشتەی هەیە.

ژوورێکی چکۆڵەبوو، سێ تەختی تێدابوو، تەختی یەکەم چۆڵ بوو، دووەم هی پاشکا بوو، تەختی سێیەم پیرەمێردێکی لەسەر ڕۆنیشتبوو. چاوەکانی تەڵخ و لێل، لێکدا لێکدا دەکۆکی و تفەکەی ڕۆ دەکردە کاسەیەکەوە. پاشکا لەسەر تەختەکەی خۆیەوە دوو تەختی نێو ژوورەکەی بەرانبەریشی لێوە دیار بوو.

پیرەمێردێکی لاوازی ڕەنگوو ڕوو سیسەڵەو چرچەڵە کە کیسەیەک سەهۆڵی لەسەر سەر دانرابو لەسەر یەکێکیان ڕاکشابوو. تەختی دووەمیش دێهاتی یەکی سەر پێچراوی بەسەرەوە بوو چۆنت دیقەت دەدا هەر لە پیرێژن دەچوو.

پاشکا هەر کە گەییە سەر تەختەکەی خۆی، پەرستارەکە بەجێ ی هێشت و خێرا بەدەستێ جلەوە گەڕایەوە و گوتی: «ئەمە هی تۆیە هەستە لەبەریان بکە.»

پاشکا جلە کۆنەکانی داکەند، جلە تازەکانی لەبەر کرد، ئەوجا ڕۆبە کەوەکەی بەسەریانا لەبەر کرد. بە شادی یەوە ڕوانی یە خۆی، چەند حەزی دەکرد بەم جلە تازانەوە بە کوچە و کۆڵانانی گوندەکەی خۆیاندا بسوڕێتەوە. جلەوی بۆ خەیاڵ شل

کرد، دایکی هێنایە بەرچاوی خۆی کە ئەمی ناردووە بۆ باخەکەی کەناری چۆمەکە تاگەڵا کەلەرم بۆ بەرازەکە یان بێنێ، کورو کچی گوندەکەیان دەوریان داوەو بە بەغیلی یەوە لێ ی راماون و ئەبلەق ئەبلەق دەڕواننەرۆبەکەی.

پەرستارەکە کەجاری دووەم گەڕایەوە دووقاپ و دوو مراک ودوو پارچەنانی لەگەڵ خۆ هێنابوو. یەکێکیانی دا بەپیرەمێردەکەو ئەوی دیکەیانی دایە پاشکاو گوتی: «بخۆ». پاشکا لەقاپەکەوورد بووە، سەیری کرد پڕە لەگۆشتاوی چەور، وگرتکە گۆشتێکیشی لە بن دایە، دیسان لەدڵی خویدا گوتی کەژیانی ئەم دکتۆرە خۆش و ئاسوودەیە. وەکو بەرواڵەت تورە دیارە نابێ وابێ، چونکە ئەم نازو نیعمەتەو تورەییان نەگوتووە!گۆشتاوەکەی بە تاسوقەوە خوارد، هەموو جارێکیش مراکەکەی بەلەزەتەوە دەلستەوە.کەهەموو گۆشتاوەکەی خواردو تەنیا گرتکە گۆشتەکەی لەبەر دەم داما ،لەبن ڕا نیگایەکی پیرەمێرەکەی کردو پڕ بە دڵ بە غیلی پێ برد، ئاهێکی هەڵکێشا. کەوتە سەرگۆشتەکە، هەوڵی دا تا دەتوانێ درەنگتر بیخوا وتەواوی بکا. بەڵام بێفایدە بوو، گۆشتەکەی پاکودا. ئەوجا نۆرەی نانەکەبوو. نانی بێ پێپخۆر خۆش نی یە. چاری نەبوو وئەویشی خوارد. هەرکەلێ بووەوە پەرستارەکە بە دوو قاپی دیکەوە گەڕایەوە لایان. ئەمجارە گۆشتی گوێرەکەی سوورەوەکراوو پەتاتەیان تێدابوو. پەرستارەکە رووی کردەپاشکا:«کوا نانەکەت؟ پاشکاچ وەلامێکی نەدایەوە،گوێپەکانی پرکردن لە هەواو پوپ دەری پەڕاند. پەرستارەکەبەخەمباری یەوە گوتی:« ئەویشت خوارد؟ ئەدی ئەم گۆشتە بەچی یەوە دەخۆی؟»رۆی و پارچە نانێکی دیکەی بۆ هێنا.

پاشکالەژیانیا گۆشتی گوێرەکەی سوورەوەکراوی نەخواردبوو.زۆری لا خۆش و بەلەزەت بوو. لەماوەی چەند دەققەیەک دا گۆشتەکەی خواردوو نانەکەی هێشتەوە. پیرەمێردەکەکەلەنان خواردن بووەوە، نانەزیادەکەی لەچاوی مێزەکەیدا قایم کرد.پت؛پاشکاش لێبڕا چاولەو بکا. بەڵام پاش تۆزێک بیرکردنەوە نانکەشی خوارد!

پاش فراڤین هەستاو کەوتە گەڕان. لەژوورەکەی بەرانبەردا، جگە لەو تەختەی لەژوورێرا دیتبونی.چوارپیاوی دیکەیبینی. تەنیا یەکێکیان سەرنجی راکیشا ،ئەم یەکەیان کابرایەکی دێهای بالا بەرزبوو. هێندە باریک وبنێس بوو پێستی بەسەر ئیسکی یەوە هیشک ببوو، دەتگوت لە قەبر دەرهێنراوەتەوە. دەموچاوی توکن وگرژ بوو.لەسەر تەختەکەی رۆنیشتبوو وسەرە لەقێ ی بوو، بازووەکانی وەکو بەندۆڵی



سەعات بەم لاو بەو لادا دێناو دەبرد. پاشکا نەیتوانی چاوی لێ وەگوێزێ. هەوەڵجار وای زانی هەر بۆگاڵتە و سەرگەرمی خەڵکەکە وا دەکا. بەڵام کەتەواو زەینی دایێ بۆی دەرکەوت کەئەم رەفتارەی کاردانەوەی ئازارێکی دژوارو سەختە. زۆری دڵ پێ سووتا.ئەوجا خۆی کرد بە ژووری سێیەمدا، دووپیاوی سوزفلی تێدا بوو. دەموچاویان هیند سوور بوو دەتگۆت بەگڵە سوور تەڕاوکراون. بێ جوڵە لەسەر تەختەکانیان رۆنیشتبوون.

سیمای سەیر و سەمەرەیان لەخواوەندی بت پەرستان دەچوو.پاشکا لە پەرستارەکەی پرسی: «ئەرێ پورێ ئەمانە بۆ وان؟»

–ئەوە ئاوڵەیان دەرداوە رۆڵە.

پاشکا گەڕایەوە ژوورکەی خۆی. لەسەرتەختەکەی دانیشت، چاوەرێ بوو دکتۆر بێ و پێکەوە بجنە راوە کێشکان یاجومعە بازاڕ.بەڵام دکتۆر نەهات. پزیشکیارەکە تۆزێ لەبەر دەرگای ئەو بەرەوە وێستا، بەسەرئەونەخۆشەدا کەکیسە سەهۆڵەکەی خرابووە سەر سەر دانەو یەوەو بانگی کرد... میخایلوف!» میخایلوف ئاگای لەدنیا نەبوو، وورتەی لێوە نەهات. پزیشکیارەکە دەستێکی هەڵتەکاند و رۆیی.

پاشکا هەر بە دەقی خۆیەوە چاوی بڕی بووە دراوسێکەی، بەتەمای هاتنی دکتۆر بوو. پیرەمێردەکەی دراوسێی لێکدا لێکدا دەکۆکی و تف و بەڵغەمەکەی رۆ دەکردە کاسەکەی تەنیشتی. خیزە خیزی سینگی لەدورەوە دەبیسترا. کەلەکۆکەکۆک دەکەوت و هەناسەی هەڵدەکێشا شتێک لەسینگی دا دەنگی دەهات، پاشکا زۆری پێ سەیر بوو، خۆی پێ نەگیراو پرسی :« باپیرە ئەوە چی یە لەسینگتا فیکە لیدەدا؟» کابرای پیرە مێر وڵامی نەدایە، پاشکا کەمیک بێدەنگ بوو وئەوجا پرسی : باپیرە رێوی لە کوێ هەیە؟»

– رێوی چی؟

– رێوی زیندوو.

– لەکوێ هەیە؟ لەچەم وبێشاندا هەیە.

کات تێ دەپەڕی و دکتۆر دیارنەبوو. پەرستارەکە چای بۆ پاشکا هێنا. پزیشکیارەکە گەرایەوە، ویستی میخایلوف بێدار بکاتەوە. گڵۆپەکان هەڵبوون، دکتۆر هەردەرنەکەوت. ئیدی درەنگ ببوو، زەحمەت بوو فریای راوەکێشکان یا جومعە بازار بکەون. پاشکا لەسەر تەختەکەی راکشاو لەفکران ڕاچوو. خەیال هەڵیگرت.ئەوشەکرلەمەیەی هاتە بەرچاو کە دکتۆر قەولی دابو بۆی بکرێ.. رەنگ

و دەنگی دایکی هاتەوە بەرچاو. کوخە تاریک و نوتەکەکەی خۆیانی بیرکەوتەوە، بیری شەڕە منداڵی «یگورفنا»ی کرد. لەپڕ ماندوو وبێ تاقەت خەم دایگرت، بەوە دڵخۆشی خۆی دەداوە کەسبەی دایکی دێتەوە بۆلای بەدەم ئەو خەیاڵانەوە خەوی لێکەوت.

لەدەنگە دەنگ و غەڵبە غەڵب خەبەری بۆوە. چەند پیاوێک لەرارەوە کەدا بوون و هەرورتەوورتیان بوو. شەو بوو.لەبەر رۆشنایی گڵۆپەکاندا سێ تارمایی بەدیار تەختەکەی میخایلوف ە وە دیار بوون. یەکێکیان پرسی :«بەدۆشەکەکەوە هەڵیگرین یا هەروا؟

-هەروا، هەروا، لەوێندەر جێی دۆشەک نی یە. کەلەوەختێکی خراپا مرد، خوا عافوی بکا. ئەوجا یەکێک لەهەردووشانی ویەکێکی دی لە هەردوولاقی نەوین و هەڵیان گرت. دەڵنکی بیجامەکەی شۆڕ ببۆوەو تەکەتەکی بوو. زەلامی سێیەم کەلەپیرێژ نەدێهاتیاندەچوو دانەوی یەوە، بەسێ قۆڵی وبەدەم پێ گیر بوونیان لە دەلنگی بیجامەکەی میخایلوف ەوە رایانرفاندو لەژوورەکە وەدەرکەوتن.

خیزەخیزی سینکی کابرای پیرە مێر سەعاتە رێ یە دەڕۆیی. پاشکا کەگوێ ی لێ بوو خەریک بوو زراوی بتۆقێ. لەجێ ی خۆی ڕاپەڕی، بەترسەوە روانی یە پەنجەرە تاریکەکان، بەنیگەرانی یەوە لەتەختەکەی هاتە خوارێ پڕ بەزاری هاواری کرد: دایکە! بێ وەی چاوەڕێ ی وەڵام بێ خۆی کرد بەژوورەکەی ئەوبەرا.روناکی گلۆپەکان دڕی بەتاریکی شەو دابوو. نەخۆشەکان هەمووماتو خەمبار لەشوێنی خۆ کز دانیشتبوون. هەموو سەرو قژ شێواو دەتگوت جن و پەرین. هەموو گەورەو زەبەلاح دەهاتنەبەرچاو. زۆر

لە ولاتر کابرایەکی دێهاتی لە سوچێکی تاریک دا رۆنیشتبوو و بازووەکانی وەکو بەندۆڵی سەعات دێناو دەبرد.پاشکا دەرکەکەی بەوازی جێ هێشت. لەژووری ئاوەڵەدارەکائەوە خۆی گەیاندە رارەوەکە و لەوێوە خۆی بەژوورێکی بێ کۆتایی داکرد. هێند تاریک و نوتەک بوو، هێند ترسناکبوو، لەتۆ وایە پڕە لە خێوو دێوو درنج. ئەوجا خۆی وەژوورێکی ژناندا کرد و لەوێندەرەوە دیسان بۆ رارەوەکە، بەقاڵدرمەکاندا بەرەو نهۆمی خوارەوە داگەڕا.کاتێکی بەخۆزانی ها لە ژووری چاوەروانی. وەکو کێوی کەوتە گەڕان بەدووی دەرگادا. کیلۆنی دەرگایەک دەنگی لێوە هات، کزەبایەکی سارد هوڕوژمی هێنایە ژوورێ. پاشکا سەرەسمێکی داو دەرپەڕی یە نێو حەوشە. تەنیا هەڵاتنی لەبیربوو. هەرچەندە نابەڵەد بوو بەڵام پێ ی



وابوو چ چارێکی نی یە غەیرەز هەڵاتن، تەنیا هەڵاتن دەی گەیەنێتەوە نگ دایکی. مانگ لەبەینی پەڵە هەورەکانەوە سەرەتاتکێی بوو.

پاشکا هەر لاقێکی کرد بە دوو. تاوێکی باش بەدەوری پەرژینێکدا غاری دا، ئەوجا هەڵوەستەیەکی کرد، پاشان بەرەو نەخۆشخانەکە گەڕایەوە، تاوێک بەدەوری ئەویش دا غاریدا. لەپڕ بەدوو دڵی یەوە وێستا، هەرکەچاوی بەخاچە سپی یەکانی گۆڕستانەکە کەوت، پڕ بەزاری هاواری کرد: دایکە! دیسان گەڕایەوە. پەنجەرەیەکی رووناکی لێ بەدیارکەوت.

لەوتاریکی یە بێ سنورەدا، ئەم پەڵە روناکی یە سوور باوە سامناک دەهاتە بەرچاو. بەڵام پاشکاکەلە ترسا تەواو پەشۆکا بوو و نەیدەزانی کێوە بچێ. بەئاسودەییەوە رووی کردە ئەم پەڵە روناکی یە. قاڵدرمەیەکی چەند پلەیی و دەرگایەک لە پاڵ پەنجەرەکە هەبوو، ئیعلانێک بەدەرگاکەوە چەسپێرابوو.پاشکا بەپلەکاندا سەرکەوت، لەپەنجەرەکەوە تەماشایەکی کرد،شادی یەکی کوت و پڕ ئازای گیانی داگرت؛ دکتۆرە رووخۆشەکە لەژوورێ دانیشتبوو وکتێبێکی بەدەستەوە بوو. پاشکا لە خۆشیاپێکەنی، ویستی هاوار بکا، بەڵام هێزێکی نادیار بینی گرت، لاقی سست بوو، سەری سوڕاو لەسەر پلەکان کەوت.

کاتێ بە هۆش هاتەوە دەوروبەری تەواو روناک بوو.ئەودکتورەی کەقەولی دابووپیێ بیبا بۆ جومعە بازاڕو راوە کێشکان و رێوی زیندووی نیشانبدا دەمی نابوو بە گوێ یەوە و دەیگوت: «پاشکاتۆ وولاغی، هەر بەراستی وولاغی، پێویستە قەساس بکرێ ی...».

## ڤانکا

«ڤانکا ژوکوف» کورێکی نۆ ساڵان بوو. سێ مانگ بوو، بوو بوو بە شاگردی «ئالیاخین»ی خەفاف. شەوی بەر لە دایکبوونی مەسیح خەو نەچووە چاوانی. چاوەڕوانی کرد تا وەستاو وەستا ژن و شاگردەکانی دی چوون بۆ کڵێسا، شووشەیەک مەرەکەبی بچووک و پەڕەموچێکی تەپوتۆزاوی لەنێو سەندوقەکەی وەستا دەرهێنا، ئەوجا کاغەزێکی چرچ و لۆچی لەبەردەم خۆی داناو دەستی بەنامەنووسین کرد.

بەر لەوەی کە یەکەمین کاغەزی خۆی بنووسێت، دزە نیگایەکی دەرگاو پەنجەرەی ژوورەکەی کرد. چەند جارێک روانییە وێنەی تاریکی مریەمی پیرۆز کە ئەم لاو ئەولای بە قاڵبی پێڵاو و پوت تەنرا بوو،و ئاهێکی کەسەرداری هەڵکێشا. پارچە کاغەزەکەی لەسەر کەرەویتەیەک دانابوو. خۆشی بەرانبەری لەسەر چۆکان دانیشتبوو، دەستی بە نووسین کرد.

«ئازیزەکەم، بابە گەورە کونستانتین ماکاریچ، وا ئەم نامەیەتان دەنێرمە خزمەت. هیوادارم جەژنتان بەخۆشی و شادی بگوزەرێ و هەموو خێرو فەرێکی خواتان بۆ دەخوازم. منی بێ باب و دایک تەنیا تۆ شک دەبەم...» ڤانکا، روانییە پەنجەرەکە، پەنجەرەکە رووناک بوو، و رۆشنایی مۆمەکەی لەخۆیدا عەکس کردبووەوە. بابە گەورە «کونستانتین، کاریچ»ی لەبەرچاوی خۆیدا بەرجەستە کرد. ئەو پیرەمێردە هەموو شەوێک لە دەوروبەری «شیفارەف»دا ئێشکی دەگرت، پیاوێکی وردیلەو ناسک بوو، هەرچەندە تەمەنی «٦٥» ساڵ بوو، بەڵام هێشتا وریاو دڵتەڕو گورجوگۆڵ بوو. هەمیشە پێدەکەنی، چاوەکانی ریپۆقاوی و ئاوسا بوون. هەموو رۆژێ لە موبەقەکەدا لای نۆکەرو خولامەکان دەنووست. یان لەگەڵ ئاشچییەکاندا سەرگەرمی قسان دەبوو. شەوان فەروە پان و پۆڕەکەی لەبەر هەڵدەکێشاو بەدەوری شوێنی ئێشکەکەیدا دەسوڕایەوە. گۆپاڵەکەی بە جۆرێ لە



عاردی دەدا کە دەنگی دەدایەوە. هەردوو سەگەکەشی سەریان دادەخست و دووی دەکەوتن. سەگە گەورەکەی ناوی «کاشتانکا»و ئەوی دی ناوی «ڤاپون» بوو، چونکە درێژکۆڵەیەکی رەشی رەش بوو. لە ماسی دەچوو. ڤاپون، سەگێک بوو یەجگار دەچووە دڵەوەو زۆر بە ئەدەب بوو. هێندە بە میهرەبانی دەیڕوانییە بێگانان وەکو ئەوەی خاوەنی خۆی بن، بەڵام بەقای پێنەدەکرا، چونکە هەرچەندە بەرواڵەت گوێڕایەڵ و بە ئەدەب بوو، بەڵام موخەنەت و لەبنەوە بڕو نهێن گیر بوو. هەر لێی غافڵ بوایەی پەلاماری دەدایت و قەپاڵێکی پڕ بەزاری لەڕانت دەدا. یان هەر ئەوەندەت دەزانی خۆی بە کولانەیەکدا دەکردو مامری جوتیارێکی دەدزی.

پتر لە جارێک خەریک بوو لاقی بشکێنن و دووجاران منداڵان دارکاریان کرد. هەر هەفتەی بەڵایەکی وەهای بەسەردا دەهات دەگەییە حاڵی مەرگ، کەچی لەپڕ وەک نەبای دی بێ و نەباران چاک دەبووەوەو سەرلەنوێ تێهەڵدەچووەوە.

بێگومان نهو باوە گەورەی ڤانکا لەبەر دەرگا وەستاوەو دەڕوانێتە پەنجەرە ئامال سورو روناکەکانی کڵێسای گوند، چەکمە درێژەکانی لەپێ هەڵکێشاون و لەگەڵ خەڵکانی نێو حەوشەکەدا خەریکی شۆخی و سوعبەتانە. گۆپاڵەکەی بەکەمە ریا کردوەو لەسەرما دەستەکانی خستونەتە بن باخەڵی، وەکو پیرەمێردان وشکەکۆکە دەکات. نوقورچ لە کارەکەرەکان دەگرێ یان سەر دەکاتە سەری ئاشچییەکان. قوتوی برنوتییەکەی دەردەێنێ. لەبەردەم ژنەکاندا رایدەگرێ و دەڵێ: «برنوتیت ناوێ؟» ژنەکانیش تۆزقاڵێکی لێ هەڵدەگرن و لەپڕ دەپژمن. ئیدی پیرمێرد لەبەر پێکەنین دەبورێتەوە. هاوار دەکات: «کار لە موخی بنیادەم دەکات!» برنوتی دەداتە سەگەکانیش تا بۆنی بکەن. کاشتانکا دەکەوێتە پژمە. کەپوی دەخورێنێ و رەنجاو و دڵشکاو دوور دەکەوێتەوە.

ڤایون..ی نارەسەن دێتە پێشێ، بەڵام بۆنی ناکات و دەکەوێتە کلکەسوتێ. کەشوهەوا خۆشە. تەنانەت کزەبایەکیشی نایەت. دنیا ساف و سەهۆڵ بەندانە. تاریکەشەوە، بەڵام سەراپای گوند بەرگی سپی پۆشیوە. سەربانان یەکپارچە بەفرە. لوولە دوکەڵ لە دوکەڵکێشی ماڵانەوە بەگژ ئاسماندا دەچن. درەختانی بەفرگرتوو وەکو زیو دێنەبەرچاو. جریوەو چاوشارکێی ستێران، ئاسمانیان کردۆتە چراخان، رێی کاکێشان هێند ساف و بێگەردە، هێندە بە بریق و باقە دەڵێی بۆ پێشوازی پشووی جەژن، تارای زیوی بەسەردا دراوە. ڤانکا ئاهێکی هەڵکێشا، پەڕەموچەکەی لە مەرەکەبەکە هەڵکێشاو کەوتەوە نووسین:

«دویَ شەو، وەستام مارهەنجنی کردم. هەموو قەبرغەو پەراسومی کوتایەوە، قژی راکێشام. بردمییە نێو حەوشەو بەقایشێکی چەرم بەربووە وێزەم، ئەمە چییە وەختێ بێشکەی منداڵە جیقنەکەیم رادەژەند، بۆ نەگبەتی خەوم لێکەوت. هەر لەم هەفتەیەدا وەستاژن پێی گوتم ماسی پاک بکەم، منیش لە کلکییەوە دەستم پێکرد. ژنەی تاین، ماسییەکەی هەڵگرت و کێشای بەدەم و قەپۆزما، بکوتە کوێت دێشێت! شاگردەکان جنێوم دەدەنێ. دەمنێرن بۆ دوکانی ئارەق فرۆشان تا ڤۆدکایان بۆ بکرم. ناچارم دەکەن لە ئاروەکانی وەستایان بۆ بدزم، ئەویش لێم دەدا. شیوو فراڤێن..مان نییە.

قاوەڵتیش دەبێ بەنانی وشک بکەین. ئەگەر نیوەرۆیەک گۆشتاو هەبێ ئەوا شیومان نانی وشک دەبێ. عەسرەچای و وردەشتی دی ئەوە تایبەتە بەوەستاو وەستاژن و بەتەنێ دەیخۆن. لە راڕەواندا دەنووم، خۆ ئەگەر منداڵەکەیان بگری ئەوا نابێ بخەوم، دەبێ بەردەوام بێشکەکەی رابژەنم. باوەگەورەی ئازیزم مەعز بۆ رەزای خوا لەم دوکانەم دەربێنەو ببەوە ماڵ. لەوەی پتر هەڵناکەم. خاکی بەرپێت ماچ دەکەم و هەمیشە دوعای خێرت بۆ دەکەم. نوێژت لەبری دەکەم. لێرەم رزگاربکە دەنا دەمرم...»

لچی ڤانکا شۆڕبوونەوە. بەدەستی مەرەکەباوییەوە چاوەکانی هەڵگڵۆفت و کەوتە گریان و هەنسک هەڵدان: «..توتنەکەت بۆ پوختە دەکەم. دوعای خێرت بۆدەکەم. ئەگەر پێم خوار دانا، ئەوا وەکو بزنەپۆشی خۆمان بەرکوتەکم بدە. ئەگەر پێت وایە چ کارێکم چنگ ناکەوێ ئەوا خۆم دەچمە کن کوێخاو بەسەر پێڵاوەکانیدا دەکەوم، بەڵکو لەجیاتی «ڤدیا» بمکات بە بەرخەوان. باوە گەورەی ئازیزم! لەوەی پتر لێرە هەڵناکەم. دەمکوژێت. ویستم بۆ گوند بگەرێمەوە، بەڵام پێڵاوم نەبوو. زۆریش لە سەهۆڵبەندان دەترسام. کە گەورەبووم ئاگام لێت دەبێت. خزمەتت دەکەم. دەتخەمە سەر سەرم و کەس زاتی ئەوە ناکات خراپ سەیرت بکات. کە مردی دوعای خێرت بۆ دەکەم تا خوا لێت خۆش ببێت. وەکو چۆن دوعای خێر بۆ «پلاگیڤیا»ی دایکم دەکەم..».

«بەڵام ئەگەر باسی شاری مۆسکۆت دەوێ، ئەوا شارێکی گەلەک گەورەو بەربڵاوە. هەر هەمووی کۆشک و سەرای ئاغایانەیە. پڕە لە ئەسپ، بەڵام پەزی لێ نییە. سەگ و کسۆکانی ئێرە فەقیرو بێ وەین منداڵان لەکاتی جەژندا لەدەوری یەکدی خڕنابنەوە چ کەسێکیش گۆرانی و لاوژە نابێژێ. رۆژێک لەموغازەیەکدا



قولاپ و تۆڕی ماسی گرتنم بەرچاوکەوت. یەک دنیا بوو. هەمووی بۆ فرۆشتن بوو. شتێکی گەلێک چاک و نایاب بوو. جۆرە قولاپێک بوو ماسی گەورەشی پێدەگیرا.

هەندێ موغازە هەن، تفەنگ دەفرۆشن، عەینی تفەنگەکەی ئاغا، بەڵام پێم وایە زۆر گران بێ. لەوەیە بایی سەد رۆبڵ ببێ. لە قەسابخانەکاندا هەموو جۆرە گۆشتێک هەیە، گۆشتی: کەڵەباب، مامر، کەو، کەروێشک، بەڵام ئەمەیان لەکوێ هێناوە؟! کاکی قەساب بەکەس ناڵێ. باوە گەورەی ئازیزم، کە ئاغاکانت درەختی جەژنیان هەڵگیرساند گوێزێکی سەوزو تەڕوبڕ بخەلاوەو لە قوتوە سەوزەکەی خۆمدا تاقەتی بکە. لە خانمی چکۆڵە «ئولگائیگناتیڤا»ی وەربگرەو بڵێ بۆ ڤانکام دەوێ....».

ڤانکا تەزویەکی ساردی پێدا هات، ئاهێکی هەڵکێشاو دووبارە روانییە پەنجەرەکە، ئەو رۆژانەی بیرکەوتەوە کە هەر جارێک باوەگەورەی بچوایە بۆ دارستان تا درەختی کاژی جەژن بهێنێتەوە، ئەویشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. چ رۆژگارێکی خۆش بوو! شەختەو زوقم خرمە خرم لە ژێر پێیاندا دەشکا. باوە گەورە لەسەرماندا هەڵدەلەرزی و دانەچۆقەی پێدەکەوت. ڤانکاش هەمان رەفتاری ئەوی دەکرد. بەر لەوەی درەختی جەژن هەڵکەنن، باوەگەورە سەبیلێکی تێدەکرد، تۆزێ برنوتی دەردێناو بۆنی پێوە دەکردو ڤانکای بەستەزمانی قەلەندەری لەسەرما لەرزیوی دەستخەڕۆ دەکرد. درەختانی کاژ یەکپارچە بەفرو زوقم و چلورە بوون، بێدەنگ و بێ جوڵە وەستابوون و چاوەنۆڕ بوون بزانن کامیان لەپێشدا بەلادا دێ و دەکەوێ. لەپڕ کەروێشکێک لە سوچێکەوە دەردەپەڕی و بەسەر بەفرا دەکەوتە غاردان. باوەگەورە هاواری دەکرد: «بیگرە، بیگرە، ئەهای شەیتانی کلک بڕاو!». کە درەختەکە دەکەوت، باوەگەورە بەرەو ماڵی ئاغا بکێشی دەکرد. لەوێندەر رۆدەنیشتن و دەیان رازاندەوە. خاتو ئولگای بچکۆلە کە زۆری ڤانکا خۆش دەویست، لە هەموویان پتر زەحمەتی بەو درەختەوە دەکێشا. کە پلاگیوڤا-ی دایکی ڤانکا مابوو و کارەکەری ماڵی خاتوو ئولگا بوو، ئولگا تا دەیتوانی شەکرلەمەی دەتەپاندە دەمی ڤانکاوە، چونکە بێکار بوو دەرسی پێی دەگوتەوە. ڤانکا دەیتوانی بخوێنێ و بنوسێت و تا سەد بژمێرێ تەنانەت فێری «سەمای چوار قۆڵی»شی کرد. کە دایکی مرد، لە موبەقەکەیدا جێیەکیان دایە ڤانکاو باپیری. لەوێوە ناردیان بۆ مۆسکۆ بۆلای ئەلیاخن»ی پێڵاوفرۆش. ڤانکا لەسەرنامەکەی رۆیی! «...باوە گەورەی ئازیزم، زوو وەرە زوو! تکات لێدەکەم لێرە دەربازم بکە. بەزەییت بەمنداڵێکی هەتیوی بێ

داک و بابدا بێتەوە. لێرە لێم دەدەن. هەمیشە برسیم، هێندە دڵم تەنگە هەر مەپرسە، کاروپیشەم بۆتە گریان».

«پیرێ دیسان وەستام قاڵبێکی پینەدۆزی کێشا بەسەرما، بورامەوە، باش بوو پاشان بەهۆش هاتمەوە، ژیانم گەلێک سەخت و تاڵە، سەگ بە حاڵی من نەبێ. سڵاو لە ئەلیونا بکە. سڵاو لە یەکەڵەچاو و عەرەبانچییەکە بکە. نەیەڵی کەس دەست لە میلۆدی یەکەم بدات. من چاوەڕوانتم. نەوەی خۆت ئیڤان ژوکف. باوە گەورەی ئازیزم هەر دەبێ بێی..»

ڤانکا کاغەزەکەی چوارقەد کردو خستییە ئەو زەرفەوە کە شەوی پێشوو بە کۆپیکێک کڕی بووی. کەمێ لەفکران ڕاچوو. پەڕەموچەکەی لەشوشە مەرەکەبەکە هەڵکێشاو ئەدرەسەکەی نووسی: «گوند، بە خزمەتی باوەگەورەم» سەری خوراند، دووبارە تێفکری و نووسی:

«کونستانتین ماکاریچ بگات.»

خۆشحاڵ بوو بەوەی کە کەس نەهاتبوو بەسەراو کاغەز نووسینەکەی لێ تێک نەچووبوو. کڵاوەکەی لەسەرکرد. پاڵتۆکەی لەبەر نەکرد. بەتۆی کراسێک غاری دایە دەرێ. مریشک فرۆشەکە کە دوێنێ لێی پرسی بوو، پێی گوتبوو کە دەبێ نامە بخرێتە پۆستەوەو «ئیدی لەوێندەرەوە نامە بە عەرەبانەی سێ ئەسپی دەگاتە ئەو سەری دنیا. پۆستەچییانی مەست، عەرەبانەو گالیسکان داژۆن و زەنگۆڵەی ملی ئەسپەکانیان دەنگ دەداتەوە.»

ڤانکا رووی کردە یەکەمین سەندوقی پۆستە، نامە بەنرخەکەی تێخست. پاش یەک کاتژمێر، دڵخۆش و شاد خەوی لێکەوت. لە خەویا سۆپایەکی بینی کە باوەگەورەی لە پاڵیدا دانیشتبوو لاقە رووتەکانی لێ هەڵبڕیبوون و گەرمی دەکردنەوە.. کاغەزەکەی بۆ ئاشچییەکان دەخوێندەوە. ڤایون-ش بە دەوری سۆپاکەدا دەگەڕاو کلکە لەقێی دەکرد.

# گرانەتێ

کلیموف ی ئەفسەری لاو لە فارگۆنێکی دوکەڵاوی قیتارێکی پۆستەبەردا دانیشتبوو. قیتارەکە لە پترزبۆرگەوە بۆ موسکۆ دەچوو.

پیرەمێردێک بەرانبەری دانیشتبوو، سەرو سیمای لە دەریاوان دەچوو.

ردێنی هێندە لە بنڕا تراشی بوو، دەموچاوی ئاوسابوو. بە روالّەت لەمل ئەستورو پارە دارەکانی خەڵکی سوید یان فنلەندە دەچوو بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەر سەبیلی دەکێشاو لەسەر یەک بابەتی تایبەتی دەیڕێسا.

– ئەها! تۆ ئەفسەری؟ برایەکی منیش ئەفسەرە، بەڵام ئەو لەهێزی دەریاییە، دەریاوانە. دەریاوانەو لە (کرونشتات)کاردەکات، بۆچی دەچیت بۆ مۆسکۆ؟

– بەماموری دەچم.

– ژنت هەیە؟

– نەء، لەگەڵ خوشکەکەم و میمکم دا دەژیم.

– براکەی منیش ئەفسەرە، بەڵام ئەو ژن و منداڵی هەیە. ئەها!

کابرای فنلاندی هەندێ جار لەخۆڕا سەرسام دەبوو، وەختێ وشەی ئەهای بەکار دێنا، بەخۆ پەسندی و لاسارییەوە پێدەکەنی و بەردەوام مژی لە سەبیلەکەی دەدا، کلیموف بێ تاقەت بوو، بەهیچ جۆرێ حەزی نەدەکرد قسانی لەگەڵ بکات، پڕ بەدڵ رقی لێی بوو. چەندی حەز دەکرد ئەو سەبیلە نەحلەتی یەی لەدەست راپسکێنێ و توڕی بداتە ژێر کورسی یەکە! چەندی حەز دەکرد ئەم کابرا فنلاندییە توڕ بدرێتە فارگۆنێکی دییەوەو لەم چەنەبازییەی رزگار بێ.. لەبەر خۆوە تێفکرێ: «ئەم فنلاندییانە یان تۆ بلّێ ئەم یونانیانە چەند خەڵکانێکی میملّ سیفەت و ترسناکن! چەند تەمەڵ و موفتەخۆرو ئیسک قورسن! دایمە بارن بەسەر خەڵکییەوە. ئاخر فایدەیان چیە» کە بیری لەفنلاندی و یونانیان کردەوە دڵی تێک هەڵهات. هەوڵی دا لەگەڵ فەرەنساوی و ئیتاڵییەکاندا بەراوردیان بکات، بەڵام ئەم بیرەش



هەستێکی ناخۆشی لەلای بێدار کردەوە، یەکسەر ئەو ئۆرگ لێدەر، ژنانی رووت، چەقەنە لێدەرو ئەو وێنە رەنگاو رەنگانەی کە لەسەر پارچە نەخشێنرابوون، بیرکەوتەوە، کە لەماڵی میمکی بە بەرزییەوەو لە سەروی رەفەکان هەڵواسرابوون.. هەرچەندە هەموو جێگەی دانیشتنەکە هی خۆی بوو، بەڵام وەکو ئەوەبوو جێگاکەی تەنگ بێ و نەتوانێ دەست و لاقان راکێشێت. دەمی ووشک و تاڵ بوو. سەری قورس بوو، بیری ئاڵۆزی ئاوارەو سەرگەردان بوو. بیری پەشێوی لەسەر چ شتێکی دیاریکراو نەدەگیرسایەوە. دنیا لەبەرچاوی تاریک دەبو، تارمایی کورسی و خەڵکانی سەیر سەیری دەهاتە بەرچاو. ژاوەژاوو غەڵبە غەڵب و دەنگە دەنگی تێکەڵ و پێکەڵ لەمێشکی دا دەزرنگایەوە.

دەنگی پێچکەو تایەی عەرەبانان، دەنگی پێکادانی دەرگا، دەنگی زەنگی دوور، دەنگی شاورو پۆلیسی رێگاوبان، دەنگی پێی هاتوو چۆکەرانی زۆرو زەوەند گوێیان دەزرنگاندەوە. کات بەخێرایی دەبوری. وای دەهاتە بەرچاو کە قیتارەکە هەر ساناساتێ لە وێستگایەک دا دەوەستێ و پیاوێک سەردەکەوێ و دەپرسێت:–

پۆستەکە حازرە؟ و یەکێک وەڵام دەداتەوە:– حازرە! وای دەهاتە بەرچاو کە پیاوی بەرپرسی پلەی گەرمای فارگۆنەکان زوو زوو وەژوور دەکەوێ و تەماشای «گەرماپێو»ەکە دەکات. هەر وەها وای هەست دەکرد قیتارەکانی دی هەرگیز ناوەستن و یەک یەک قیتارەکەی ئەم بەجێ دێڵن. قیتارەکەی ئەمیش شەقە شەق رێڵەکان دەپێچێتەوە، دەنگ، شووتی قیتار، پیاوە فنلاندی یەکە، دووکەڵی سەبیل، هەر هەموو ئەمانە لەبەرچاوی بوو بوون بەتارمایی جۆراوجۆر و بەدووم و وەکو مۆتەکە چوکیان بەسەر سینگی دا دادابوو. بەدەم ئازارو ژانە سەرەوە سەری هەڵبڕی و روانی یە ئەو گڵۆپەی کە کۆمەڵێک سێبەرو تاریکی ترسناک گەمارۆیان دابوو. تینوی بوو، بەڵام زمانی ووشک بوو، بەهیچ جۆرێ لە دەمیا نەدەگەڕا، تەنانەت تاقەتی ئەوەشی نەبوو وەڵامی پرسیارەکانی کابرای فنلاندی بداتەوە، هەوڵی دا رابکشێ و بخەوێ، بەڵام نەیتوانی. کابرای فنلاندی چەندین جار خەوی لێکەوت بێدار بوەوە. سەبیلەکەی پێکردەوە، بەهەمان (ئەها!) لەگەڵ ئەودا دەستی بەقسان کردەوەو دیسان خەوتەوە. کلیموف، هێشتا نەیتوانی بوو شوێنێک بدۆزێتەوەو لاقەکانی درێژ بکات. بەردەوام تارمایی ترسناک دەهاتنە بەرچاوی و شێوەیان دەگۆڕا. کە گەیینە (سپیرۆف) لە فارگۆنەکەوە دەرکەوت تا تۆزێ ئاوبخواتەوە، کۆمەڵێکی بینی کە لە دەوری مێزێک کۆبووبوونەوەو بە پەلە نانیان

دەخوارد. لەفکران را چوو: «چۆن نانیان پێ دەخورێ!» هەوڵی دا بۆنی گۆشتی سورەوەکراوی بەسەردا نەیات، روی لەو دێهاتیانە وەرگێڕا کە خێرا خێرا نانیان دەخوارد، ژنێکی جوان لەگەڵ ئەفسەرێکی کڵاو سوردا قسانی دەکرد، بەدەم قسەکردن و زەردەخەنەوە ددانە سپی و جوانەکانی بەدیار دەکەوتن.

زەردەخەنەکەی، ددانەکانی و خودی ژنەکەشی هەمان هەستی قێزەوەری گۆشتە سورەوەکراوەکەی لەلای کلیموف بێدار کردەوە.

تێ نەدەگەیی چۆن ئەو ئەفسەرە کڵاو سورە دەتوانێ لەپاڵ ئەو ژنەدا دانیشێ و بڕوانێتە دەموچاوی ناسک و پڕ خەندەی. هەرکە تۆزێ ئاوی خواردەوە گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی. کابرای فنلاندی دانیشت و سەبیلەکەی پێکرد. دەنگێکی ناخۆش لە سەبیلەکەیەوە دەهات؛ دەنگێک رێک وەکو فلچە فلچی قۆندەرەیەکی لاستیکی کون کون کە بەنێو قوڕو چلپاوا پێوەی بڕۆیت. بەسەر سامییەوە پرسی: «ئەها، ئێرە چ وێستگایەکە؟». کلیموف وەڵامی دایەوە: «نازانم» راکشاو دەمی خۆی گرت تا تام و بۆنی تاڵی دوکەڵی بەزارو گەرودا نەچێت.

– کەنگێ دەگەینە تور؟

– نازانم، ببورە، من، من ناتوانم قسان بکەم، حاڵم باش نیە. سەرمام بووە.

کابرای فنلاندی سەبیلەکەی بەچوارچێوەی پەنجەرەکە تەکاندو دیسان کەوتەوە چەنەبازی دەربارەی براکەی. کلیموف چیدی گوێی نەدایێ. بەدەم ئازارەوە کەوتە بیری جێگای نەرم و شل و پاک و خاوێن و بوتڵی ئاوی تەزی و (کوتی)ی خوشکی کە چاک دەیزانی چۆن بە تەنگییەوە دێ و خزمەتی دەکات و دەروو ژووری پێدەکات. تەنانەت وەختێ کە (پاڤل)ی خولامی بیرکەوتەوە کە چۆن پێڵاوە قورس و تەنگەکانی لەپێ دادەکەنێ و ئاوی بۆ ئامادە دەکات و لەسەر مێزەکە دای دەنێ، لەدنیای خەیاڵ دا بوو، وای دەهاتە بەرچاو ئەم هیچی لەسەر نیە تەنیا ئەوە نەبێ بچێتە ناو جێگاکەوەو هەڵبەتە ئاوەکەشی بۆ خۆی بخواتەوە، ئەوسا بێگومان ئەم مۆتەکە ترسناکانەی لەکۆڵ دەبێتەوەو خەوێکی خۆشی لێدەکەوێت. دەنگێکی دوورو نامەفهومی بەرگوێ کەوت:– پۆستە حازرە؟ دەنگێکی بەرزو گڕ لە پەنجەرەکەی تەنیشتیانەوە وەڵامی دایەوە:– حازرە!. دووەم یان سێیەم وێستگای پاش سپیرۆف بوو. کات بەخێرایی دەبوری، لەتۆ وایە بەچوار ناڵە دەڕوات. بەڵام دەنگی زەنگ و شووت و برێک کردنی هەر نەدەبڕایەوە. کلیموف بەنائومێدییەوە دەموچاوی لەگۆشەیەکی پشتییەکەی توند کرد. سەری خستە نێو هەردوو دەستی ودیسان کەوتە



خەیاڵی خوشکەکەی و پاڤلی خولامی، بەڵام هەم خوشکەکەی و هەم خولامەکەی لەگەڵ تارمایی دیکەدا تێکەڵ بوون. لەبەرچاوی سوڕان و وون بوون. هەناسەی کە لە پشتیەکەی دەداو دەگەڕایەوە. هێندە گەرم بوو هەر ئەوە نەبوو دەموچاوی بسوتێنێ. لاقەکانی دەیەشان. دەتگوت بایەکی سارد لەپەنجەرەکەوە دێ و لەپشتی دەدا. هەرچەند زۆر کەسیرەو نەخۆش بوو، بەڵام نەدەیویست و نەدەیتوانی ئەو حاڵەی بگۆڕێ.

ئازای گیانی سست و خاو بوەوەو ئاگای لەخۆ نەما. کاتێ لەپڕ سەری هەڵبڕی و تەمەشای کرد، بینی فارگۆنەکە بەتەواوی روناک بوەتەوە.خەڵکی خەریک بوون پاڵتۆکانیان لەبەر هەڵدەکێشاو کەوتبوونە جموجۆڵ. قیتارەکە وێستا. حەماڵەکان بەخۆیان و بەرکۆشی سپییەوەو بەنمرەی بەر بەرۆکیانەوە، بەدەوری رێبوارەکاندا دەهاتن و جانتاکانیان لەدەست دەقۆستنەوە.

کلیموف، خۆ بەخۆ پاڵتۆ قورسەکەی دا بەشانیاو لەقیتارەکە دابەزی، باوەڕی نەدەکرد کە ئەمە خۆیەتی و خەریکە رێ دەکات، وای دەهاتە بەرچاو کە پیاوێکی دیکەیە، پیاوێکی بێگانەیە، هەروەها وای هەست دەکرد کە گەرمی نێو قیتارەکە، تینوێتی، تارمایی و شەبەنگی نەگریسی جۆراوجۆر کە بەدرێژایی شەو خەویان لێ حەرام کردبوو، هێشتا دەست بەرداری نەبوون! بێ ئختیار لە جانتاکەی نەوی و عەرەبانەیەکی بەکری گرت.

عەرەبانچییەکە داوای رۆبلێک و ٢٥ کوپیکی کرد تا بیگەیەنێتە گەڕەکی (پاورسکا)، بەڵام ئەو چ مامەڵەیەکی لەگەڵ نەکرد.

کوێرانە خۆی بەنێو عەرەبانەکەدا کردو لێی دانیشت.. هێشتا توانای ئەوەی مابوو هەست بەکەمی و زۆری پارەکە بکات و بزانێ چ کڵاوێکی لەسەرنراوە، بەڵام پارەی مەبەست نەبوو؛ خوا خوای بوو بگاتەوە ماڵێ. کە گەییەوە ماڵێ، میمکی و خوشکەکەی (کیژێکی هەژدە ساڵان بوو). بەپیرییەوە هاتن. خوشکەکەی دەفتەرو قەڵەمێکی بەدەستەوە بوو. سڵاوی لێکرد و چاک و خۆش و دەستوموچی لەگەڵ کرد. کلیموف بیری کەوتەوە کە خوشکەکەی خۆی بۆ تاقیکردنەوەی بوونە مامۆستای ئامادەیی، ئامادە دەکات. کلیموف گوێی بە ئەحواڵپرسی و پرسیارەکانی نەدان. لەگەرما هانکە هانکی پێ کەوتبوو. بەنێو ژورەکاندا کەوتە رێ، گەییە ژورەکەی خۆی و خۆی بەسەر جێگاکەیدا دا. کابرای فنلاندی، ئەفسەرە کڵاو سورەکە، ژنە ددان سپییەکەو بۆنی گۆشتە سورەوە کراوەکەو ئەو سێبەرانەی گەمارۆی

گلۆپەکەیان دابوو، مێشکیان پڕ کردبوو.

ئاگای لەخۆ بڕابوو، غەڵبە غەڵب و دەنگە دەنگی ترسناکی دەوروبەرەکەی بۆ جیا دەکرایەوە. وەختێ بەهۆش هاتەوە، خۆی لە نێو جێگاکەیدا بینی. جلەکانیان داکەندبوو. سەرنجی لەسەر بوتڵێکی ئاوو پاڤڵی خوڵام گیرسایەوە، بەڵام ئەمانەش چ ئاسودەییەکیان پێ نەدەبەخشی، دەست و لاقی دەتگوت هاڕدراون.

زمانی بەمەڵاشویەوە نووسابوو، هێشتا دەنگی مژلێدانی سەبیلەکەی کابرای فنلاندی لەمێشکی دا دەزرنگایەوە. دکتۆرێکی ردێن رەشی مل ئەستور لەپشت سەری پاڤڵەوە بەدیارییەوە وەستابوو و وورتە وورتی دەکرد: «ئافەرین کوڕی خۆم، ئافەرین، چاک بوو». دکتۆرەکە پێی دەگوت «کوڕی خۆم»، هەر دەیگوت و دەیگوتەوە: «بەڵێ، بەڵێ! چاک بووە، نائومێد مەبن!»

دکتۆرەکە خێراو خۆمانە قسانی دەکرد. دەموچاوی گۆشتن و دەنگە دۆستانەکەی کە بەکلیموفی دەگوت کوڕی خۆم، کلیموفی دەهری کرد. لەپڕ ناڵاندی «بۆ پێم دەڵێی کوڕی خۆم؟ یانی چی ئەوەندە خۆمانە دەدوێی؟ هەی دواتان بڕێتەوە» خۆی لەدەنگی خۆی ترسا. دەنگی هێندە ووشک و لاوازبوو کە بەخۆیشی نەیناسییەوە. دکتۆرەکە نەسەخڵەت بوو، و نە رەنجاش، لەسەری رۆیی: «ئافەرین، بەڵێ!بەڵێ! نابێ توڕەببی.»

لەماڵیشەوە، کات بەهەمان خێرایی نێو قیتارەکە دەڕۆیی و دەتگوت چوار ناڵە دەکات لەشکری رۆژ بەرە بەرە پاشەکشەی دەکرد و لەشکری شەو بەکاوەخۆ دەهاتە پێشێ. پێ دەچوو دکتۆرەکە لە جێی خۆی نەجوڵێ و هەر ساناساتێ دەمرێژێ بەڵێ، بەڵێی بەگوێچکەیدا دەکرد. زنجیرەیەک تارمایی و شەبەنگی لە بن نەهاتوو، لە ژوورەکەدا ریزیان بەستبوو: پاڤڵ، کابرای فنلاندی، مولازم یارشوفچ، نەقیب ماکزیموف،ئەفسەرە کڵاو سورەکە، ژنە ددان سپی یەکەو دکتۆر، هەر هەموو ئەمانە سەرگەرمی قسان بوون، ئەمریان دەکرد، دەستیان هەڵدەتەکاند، سەبیلیان دەکێشاو شتیان دەجوو، کلیموف رۆژێک لەبەر رۆشنایی رۆژ، کەشیشی ناوچەکەی بینی. بابی روحانی جەنابی کەشیش، کتێبی پیرۆزی بەدەستەوە بوو. لەنزیکی جێگاکەی کلیموف وەستابوو و لەبەر خۆوە ورتە ورتی دەکرد.

سیمای حاڵەتێکی وەهای دەنواند کە کلیموف هەرگیز ئەو حاڵەتەی نەدی بوو، کلیموف ئەوەی بیرکەوتەوە کە بابی ڕوحانی هەمیشە بە ئەفسەرانی کاتولیک مەزەبانی دەگوت پۆڵاندی: ویستی بیهێنێتە پێکەنین، گوتی: «بابە! دەزانی



یارسوفچی پۆڵاندی سەری خۆی هەڵگرتووەو روی کردۆتە لێرەوار!» بەڵام بابی روحانی کە پیاوێکی روخۆش و دەم بەپێکەنین بوو، پێ نەکەنی، بگرە سیمای گۆڕاو خەمێکی سەیری لێ نیشت. خاچەکەی لە کلیموف بردە پێشەوە.

شەوان دوو سێبەر، یەک لەدووی یەک، بەئەسپایی دەخزینە ژورەوە، ئەم دوو سێبەرە خوشکەکەی و میمکەکەی بوون، سێبەری خوشکەکەی چۆکی دادەداو دوعای دەکردو دەپاڕایەوە، سەری دادەنەواندو سێبەرە بۆرو چەماوەکەی دەکەوتە سەر دیواری ژوورەکە. بەهەرحاڵ هەردوو سێبەرەکە هەر دەپاڕانەوە. بە درێژایی ئەم ماوەیە بۆنی گۆشتی سورەوە کراوو سەبیلی کابرای فنلاندی لەکەپوی نەبڕا، بەڵام لەپڕ بۆنێکی ئاشکرای بخوردی پیرۆز بەدەم و کەپوی داچوو. خەریک بوو بڕشێتەوە، هاواری کرد: « بخوردە! لایبەن لێرە!» کەس وەڵامی نەدایەوە. تەنیا دەنگی ئاوازی کەشیشانی دەژنەوت کە بەئەسپایی سرودێکیان دەگوتەوە، لەپڕ وای هەستکرد یەکێک بەغاردان بەقالدرمەکاندا سەر دەکەوێ.

کلیموف، کە هاتەوە سەرخۆی، سەیری کرد ژورەکەی چۆڵ و هۆڵە، هەتاوی بەیانی لەپشت پەردەی پەنجەرەکەوە داوییە لەناو ژورەکە، تیشکێکی باریک و تیژ چەشنی شمشێر لەناو بوتڵێک ئاودا دەلەرزێ. گوێی بەدەنگی پێچکەی عەرەبانان زرینگایەوە. بەمەدا زانی کە بەفری کوچەو کۆڵانەکان، تواوەتەوە. بەدیقەت روانییە تیشکی هەتاو، کەلوپەل و شتومەکی نێو ژورەکەو دەرگاکە. یەکەمین ئارەزووی ئەمە بوو کە لەقاقای پێکەنین بدات، قوڵپی قاقایەکی بەرز سینگ و سکی خستنە سەمایەکی شیرین و بەلەزەت، ئازای لەشی پڕبوو لە خۆشی و شادییەکی بێ سنور. ئەم خۆشی و شادی یە عەینی ئەو خۆشی و شادییە بوو کە مرۆڤ یەکەمجار دەکەوێتە سەرپێ و دنیا لەبەردەم خۆیدا دەبینێ. کلیموف، پڕ بەدڵ ئارەزووی دیداری خەڵکی و جموجوڵ و قسەکردنی کرد. بەدەنی سست و بێ جوڵە بوو، بەڵام دەیتوانی دەستەکانی بجوڵێنێ، بەڵام خۆی بەمەی نەدەزانی. چونکە بیری لەلای شتی دیکە بوو. هەناسەدان و پێکەنینەکەی خۆی لەگیان خۆش بوو. بەدیتنی بوتڵە ئاوەکە، بن میچەکە، تیشکی هەتاوو پەردەی پەنجەرەکە شادبوو.

دنیا تەنانەت لەو گۆشە تەنگەی ژورەکەشیا جوان و دڵخۆشکەر دەهاتە بەرچاوی. وەختێ دکتۆرەکە هات، کلیموف بیری لەوە دەکردەوە کە دەرمانەکانی چەند بەکەڵک بوون، خۆی چەند دڵسۆزو میهرەبان بووەو هەموو دەوروبەرەکەی دڵسۆزانە بەخەمییەوە بوون. دکتۆرەکە گوتی: «چاکە!چاکە! ئافەرین، خوا زۆر شوکر

کە چاک بوویەوە!» ، کلیموف بەدەم گوێ شل کردنەوە بەکوڵ پێکەنی. کابرای فنلاندی بیرکەوتەوە.

ژنە ددان چەرموەکەی وەبیرهاتەوە. قیتارەکەی بیرکەوتەوەو حەزی دەکرد جگەرە بکێشێت، گوتی: « دکتۆر پێیان بڵێ چاو خواردنم بۆ بێنن» . دکتۆر قاییل نەبوو، پاڤڵ ئەمرەکەی بەجێ نەهێناو نەچوو نانی بۆ بێنێ، کلیموف ئەمەی زۆر لەبەرگران بوو، وەکو منداڵی وڕکن کەوتە هات و هاوار،

دکتۆرەکە بەدەم پێکەنینەوە کەوتە لاسایی کردنەوەی: «بەبە!دایکە، مەمە دەخۆم» . کلیموف دەستی بەپێکەنین کردەوە، کە دکتۆرەکە رۆیی، خەوێکی چاکی لێکەوت و پاشان بەهەمان هەستی پڕ شادییەوە رابوو. میمکی لەپاڵی دا دانیشتبوو. زۆر خۆشحاڵ بوو، پرسی: « میمکە گیان ئەوە چیم بوو؟»

– گرانەتێ

– بەراست! بەڵام ئێستا چاک بوومەتەوە، بەتەواوی چاک بوومەتەوە، ئەدی (کوتی) لەکوێیە؟

– لەماڵ نیە، پێم وایە تاقیکردنەوەی داوەو پاشان چووە بۆ لای یەکێک.

پیرێژن کە ئەو قسەیەی کرد، دوو لۆ نوشتایەوە، دەستی بۆ گۆرەوییەکان برد، لێوی کەوتنە تەتەڵە. روی وەرگێڕاو لەپڕ دایکورکاند. خەم و کەسەری دڵی، ئامۆژگارییەکانی دکتۆری بیربردەوەو بەدەم گریانەوە گوتی: « ئۆو، کوتی،کوتی، فریشتەکەمان رۆیی!..» گۆرەوییەکانی داکەندو لەهەمان شوێن دا نوشتایەوە. کڵاوەکەی بەربووەوە. کلیموف، چاوی بڕییە قژە بۆزەکەی ئەو، هیچی بۆ مەعلوم نەبوو، دڵی کەوتە وەسوەسەو پرسی: «میمکە گیان کوتی لە کوێیە؟!»

پیرێژن کە هەموو شتێک و تەنانەت کلیموف–شی لەبەر خەمی خۆی بیرچوو بوو گوتی: « کوتی، لەتۆوە گرانەتای گرت و مرد... پیرێ بە خاکمان سپارد..»

ئەم هەواڵە ناخۆش و کوتوپڕە کلیموفی هێنایەوە سەرخۆ. هەرچەندە هەواڵێکی دڵتەزێن و ناخۆش بوو، بەڵام هەر نەیتوانی ئەو شادییەی باڵی بەسەر کلیموفی تازە چاکەوەبوو! کێشابوو، بڕەوینێتەوە. تێرگریا. پاشان پێکەنی و ئەوجا کەوتە گلەیی ئەوەی کە بۆ شتێکی نادەنێ بیخوا.

پاش هەفتەیەک، جلێکی دەڵبی لەبەرکراو بەیارمەتی پاڤل وردە وردە کەوتە رێ کردن. خۆی گەیاندە بەر پەنجەرەکەو روانییە ئاسمانی ساف و بێگەردی بەهار. لەدورەوە گوێی لە تەقە تەقی شڕە قیتارێک بوو. خەم دڵی گرت، فرمێسک لەچاوی



قەتیس ما. تەوێڵی بەتوندی نا بەپەنجەرەکەوەو لەبن لێوانەوە گوتی «چەند دڵم تەنگە، خوایە چەند غەمبارم!» خۆشی و شادی کشانەوەو خەم و بێ تاقەتی هەواری هەڵداو لە کانگای دڵەوە هەستی بە لەدەست دانی خوشکەکەی کرد.

*** میمک/ خوشکی دایک پور/خوشکی باب.**

# رەبەنی ڕەشپۆش

## ١

«ئاندری ڤسیلیوڤچ» کاورین، مامۆستای زانستگە بوو، زیاد لە پێویست خۆی ماندوو و ئەعسابی هیلاک کردبوو، بەڵام هیچ هەوڵێکی نەدا کە بەباشی خۆی تیمار بکات. بەرێکەوت پاش ئەوەی قاپێک شەرابی خواردەوەو لەگەڵ جەنابی دکتۆری دۆستی دا هەندێ دەردە دڵی کردو دۆستەکەشی، جەنابی دکتۆر ئامۆژگاری کرد کە بەهاروهاوین لە زۆزان بگوزەرێنێ. ڕێک لەو کاتانەدا کاغەزێکی دورو درێژی لە «تانیا پسوتسکی»یەوە پێ گەیی کە داوەتی کردبوو بچێ بۆ گوندەکەی ئەوان و ماوەیەک لە «بوریسوکا» لەگەڵ ئەو و بابی دا وەمێنێ. کاورین لێبڕا بچێ، بەڵام بەر لەوەی بچێ بۆ ئەوێندەر «مانگی نیسان بوو» سەرێکی «کاورینکا»ی زێدی خۆی داو سێ هەفتەی لە وێندەر گوزەراندن. کە دنیا خۆش بوو، ئەوجا رووی کردە گوندەکەی ماڵی «پسوتسکی» باخەوانی نێوداری روس. «پسوتسکی» گەورەی کردبوو،و بەنیسبەت کاورین-ەوە لە جێی باب بوو. مەودای نێوان «کاورینکا»و «بوریسوکا» کە ماڵی پسوتسکی لەوێندەر بوو نزیکەی هەفتا میل بوو، سواری عەڕەبانەو بەهارو ڕێگا، مژدەی خۆشییەکی راستەقینەیان بەکاورین دەدا.

دیوەخانی پسوتسکی لە بوریسوکادا گەورەبوو. هەیوانێک لەبەردەم ئاپارتمانەکەدا کە بەشێرە گەچینە رازا بووەوە، بەڵام ئەم پەیکەرە گەچینانە هەندێکیان روشابوون و پارچەیان لێ بەربوو بوەوە. خۆڵامێک بەجل و بەرگی مەیتەرەوە لەبەر دەرگا وێستابوو. باغێکی کۆنی تاریک، لەسەر شێوەی باخی ئینگلیزان و بەدرێژیی فەرسەخێک، لەبەر ماڵەوە تا قەراخ چومێک داکشابوو و، لەوێندەرەوە دەچۆیەوە سەر نشێوێکی پڕ گوڵ و گوڵزار. ئەم نشێوییە بەریز دارکاژی لێ روابوو کە رەگەکانیان بەدەرەوە بوون و هەر لەچنگی تێک ئالاو دەچوون. چۆڵە



چۆمێک بەقەراخ ئەم نشێوی یەدا دادەکشاو لەدورەوە دەبریسقایەوە. باڵندەی دەنووک درێژی زۆنگاوان بە جوکە جوکی غەمگین بەسەر چۆمەکەدا دەفڕین. تێکڕای ئەم دیمەنانە رێبواریان گاز دەکرد کە بێ دانیشێت و چامەیەک بهۆنێتەوە، بەڵام باخ و بێستانانی میوە کە تێکڕای بەدێراوی جوان رێکخرابوو و نزیکەی ٨٠٠ هەزار مەتر دووجای گرتبووەوە، هەستێکی تەواو جیاواز تری دەوروژاند. هەمیشە روناک و رەونەقدار بوون و هەستی شادی و خۆشییان لەدڵی مرۆڤدا بێدار دەکردەوە. گوڵ و گیای جۆراو جۆرو هەمەرەنگ، لەسپی سادەوە بیگرە تا رەشی رەش، ئەو هەموو شکۆفە ناسک ونازدارانە، ئیدی بەهەشتێک بوو کە کاورین لە هەموو ژیانی دا ئەو تەرحە جوانی یەی نەدیتبوو.

بەهار، لە هەوەڵی بوو. گیاو گوڵی کەم وێنە لەژێر شووشەی گوڵخانەکاندا خۆیان مەڵاس دابوو، بەڵام هەر بەستێن و دێراوێکت گرتبایە هێندەی گوڵ و شکۆفە لێ روابوو هیچ بارەگایەکی پاشایەتی لە رازاوەیی و بۆن خۆشیدا بەتۆزی پێیدا نەدەگەیی. ئەم کۆمەڵەیە بەیانیانی زوو لە هەموو کاتێک جوانتر بوون. یانی ئەو دەمانەی کە ئاورنگ وەکو ئەڵماس و مرواری بەسەر پەڕەی گوڵ و پەلکی گیادا دەدرەوشایەوە.

کاورین، کە منداڵ بوو، جوانی ئەم باخە کارێکی ئەفسانەیی لێدەکرد. کەچی «پسوتسکی» هەر بۆ تانە بەم جوانی یەی دەگوت «زڕوزبل»، بەڵام لە راستیدا هونەرو سەنعەت چ پەڕجویەکی دروستکرد بوو! چ کارێکی گەورەی لە کتێبانەوە راگوێزا بوو و چۆن بەسەر سروشتدا زاڵ ببوو، دەستەمۆی کردبوو! مەیدانی پڕ لە درەختی میوە، دارهەرمێ یەکی باڵابەرزی قوچەکی، دار بەڕووی بازنەیی، زەیزەفۆن، دارسێو، خانوو، تامی چلچرا. مێژووی ساڵی **١٨٦٢** کە بە داری ئاڵوباڵو نووسرابوو، واتا ئەو ساڵەی دەنواند کە پسوتسکی بۆ یەکەمجار دەستی دابووە بێستانکاری زانستانە. هەر هەموو ئەمانە جوان و شیرن و دڵڕفێن بوو. درەختانی رازاوەو لق و پۆپ پەرچکراو، بەقەدی ساف و راستەوە وەکو قەدی درەختی خورما رێک و راست چوو بوون بەئاسماندا، بەڵام کە بە وردی زەینەت دەدایێ و سەیرت دەکرد درەختی مێوە یان توو دەردەچوون، بەڵام ئەوەی گیانی دەخستەبەر ئەم باغەو نەوای شادی ئامێزی پێ دەبەخشی، هاتووچۆی بەردەوام و هەوڵ وکۆششی بێ ووچانی باغەوانەکانی پسوتسکی بوو. لەبەیانی زوەوە تا درەنگە شەوان لەم درەختەوە بۆ ئەم درەخت، لەم شەتڵەوە بۆ ئەو نەمام، لەم دێراوی پڕگوڵەوە بۆ ئەو

گولّزار، زەلام دەگەڕان و وەکو مێرولە بەمەکینەی دەستی و بێلّ و ئاو پرژێنەوە ئەم بەرو ئەو بەریان دەکرد.

کاورین، سەعات نۆی شەو گەییە گوندی «بوریسوکا». وەختێ گەییە ئەوێندەر، سەیری کرد تانیاو بابی بێ تاقەتن. هەوای سافی شەوو ئەستێرانی بەجریوە، ترسی زوقوم کەوتنی سپێدەی دەخستە دلّەوە، «ئیڤان کارلیڤچ)ی سەر باخەوانیش چوو بووە شاری و کەسێکی دەستپاک و خەمخۆرو جێ متمانەیان شک نەدەبرد کە باخەکەی پێ بسپێرن. قسەو باسی سەر نان خواردنی ئێوارەیان هەرباسی زوقوم و زوقوم کەوتن بوو، ئاقیبەت لێبڕان کەتانیا ئەو شەوە نەخەوێ و سەعات یەکی شەو سەرێکی باخەکە بدات و دلّنیا بێ لەوەی کە هەموو شتێک وەکو خۆیەتی یان نا. «یگور سمیوونوڤیچ»ش سەعات سێ یان زووتر لەخەو رابێ و بێ بۆ باخەکە.

کاورین، بەدرێژایی شەوەکە لەگەلّ تانیادا دانیشت و سەعات یەکیش لە گەلّیا هات بۆ باخەکە. بۆ سۆیەکی توند دەهات. لە رەزەکانەوە کە ناویان نابوو «تیجارەتخانە» و سالّی هەزاران رۆبلّ دەرامەتیان هەبوو، دووکەلّێکی چڕو خەست سەر زەوییەکەی گرتبوو، ئەم دوکەلّە دەبوایە گیاوگەلّاو گولّەکان بە جۆرێک داپۆشێت کە نەیەلّێ زوقوم بیانبەستێت. درەختەکان وەکو بەردی شەترەنج بەریز وێستابوون، وەکو ریزە سەربازان رێک و پێک بوون. ئەم بەریز وەستان و هاوبالّاییەی درەختەکان، باغەکەیان تا رادەیەک ناخۆش دەنواند. کاورین و تانیا سەری سەراپای باخەکەیان دا. چوونە سەر ئەو ئاگرەی کە لەپەین و کاوپوش بەر ببوو. بەرێکەوت تووشی یەکێک لەو کرێکارانە دەبوون کە وەکو سێبەر بەنێو چەڕە دوکەلّەکەدا لەهاتوچۆدا بوون، تەنیا درەختانی ئالّوبالّوو قۆخ و چەند دار سێوێک غەرقی شکۆفە بوون، ئیدی تەواوی باخەکە غەرقی دووکەلّ بوو. کە گەیینە دێراوە تازەکان ئەوجا کاورین توانی هەناسەیەکی رەحەت بدات. شانەکانی هەلّتەکاندو گوتی: «بیرمە، بەمندالّی بە دووکەلّ دەپژمیم، بەلّام تائێستا نەمزانیوە کە چۆن دووکەلّ گیاو گەلّایان لەبەستن دەپارێزێ».

تانیا وەلّامی دایەوە: کە دنیا هەور نەبێ، دووکەلّ جێگەی هەوران دەگرێتەوە.

– هەور بۆچی باشە؟

– ئەگەر دنیا هەورو هەلّابێ، زوقوم ناکەوێ و درەختەکان نایبەستێ.

– بە راستتە؟

کاورین، ئەمەی گوت و پێکەنی. دەستی تانیای گرت. دەموو چاوی پان و پۆڕو



رچیوی تانیا، برۆ چڕو پەیوەست ورەشەکانی، یەخەی سفت و رەقی چاکەتەکەی کە نەیدە هێشت بە ئاسانی ملی بجولّێنێ، جلەکانی کە لەشەونم دا هەلّکشا بوون و بە ژن و بالّای رێکوپێکی سەرنجیان راکێشا. لەدلّی خۆیدا گوتی: «ماشەلّلا چەند گەورە بووە». ئەوجا بە تانیای گوت: «٥ سالّ لەمەو پێش کەمن لێرە بووم، تۆ منالّ منالّ بوویت، لاواز بوویت، لاقەکانت درێژو هێشتا خڕو پڕ نەبوو بوی، شۆرتێکی کورتت لە پێ بوو... بزانە بەم ٥ سالّە چەند گۆڕاوی»!

تانیا ئاهێکی هەلّکێشا: بەلّێ پێج سالّ! لەم پێنج سالّەدا زۆر شت رووی داوە. بەخۆشیەوە روانییە دەموچاوی کاورین و گوتی: ئاندرێ راستم پێ بلّێ، ئایا هەست دەکەی کە ئیدی لە ئێمە دابڕاویت و چ پەیوەندییەکت پێمانەوە نەماوە؟ بەلّام بۆ ئەم پرسیارە دەکەم؟ تۆ پیاوێکی کاروباری تایبەتی خۆت هەیە.. تۆ... ئەگەر تۆزێ نامۆیی بکەیت و ئێمە بەبێگانە بزانی کارێکی ئاساییە، بەلّام ئەگەر وابێ یان وانە بێ ئاندریوشا، تکات لێدەکەم کە تۆ ئێمە بەبێگانە نەزانیت و وەکو خزم و کەسوکاری خۆتمان حسێب بکەی، ئێمە هەقی خۆمانە ئەم داوایەت لێ بکەین».

– هەرواشە تانیا!.

– بە شەرەفت؟

– بەشەرەفم.

– پێت سەیرە کە ئەم هەموو وێنەیەی تۆمان هەیە، بەلّام بێگومان بەخۆت دەزانی کە بابم چەندی خۆش دەوێی. هەر بەپەرستن دەتپەرستێ. تۆ پیاوێکی زانایت، پیاوێکی ئاسایی نیت. تۆ پایەیەکی پڕشنگدارت بۆ خۆت بەدەست هێناوەو بابە پێی وایە سەرکەوتنی تۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەخۆی پەروەردەی کردوویت. من نامەوێ ئەو خەیالّەی لێتێک بدەم و دلّی بشکێنم، چ قەیدی یە با وا بیربکاتەوە!

بەیانی دا، رەنگی ئاسمان روون بووەوە. تەنکە هەوران رەوینەوە. بولبولان کەوتنە خوێندن. دەنگی کلّاوکوڕە لە کێلّگەو مەزارەکانەوە بەرز بووەوە.

تانیا گوتی: ئیدی کاتی خەوە. ساردیشە. دەستی کاورینی گرت و گوتی: ئاندریوشا، زۆر مەمنونتم کە لەگەلّم هاتی. بێزار بووین ئەوەندە لەگەلّ ئاشنایانی تاقەت بەردا هەلّسوکەوت بکەین. ژمارەشمان کەمە. هەموو ژیانمان هاتۆتە سەرباخ و باخ و باخ و هیچی دی. هەموو قسەو باسێکمان هاتۆتە سەر کۆتەرەو چلّان، سێوی موتوربەو سێوی شیرین، چوزەرەدان و چرۆکردن، قەلّەم کردن و موتوربەکردن. هەموو ژیانمان بووە بە باخەکە. تەنانەت کە دەخەویشین هەر خەون بەسێوو هەرمێوە

دەبینین. هەڵبەتە هەموو ئەمانە پڕ سوودو باشن، بەڵام هەندێ جار بەدەستی خۆم نیەو حەز دەکەم گۆڕانێک لە ژیانمدا بکەم. لەیادمە جاران کە تۆ دەهاتی یە دیدەنیمان و پشووی هاوینت لەکن ئێمە دەگوزەراند، وەکو ئەوەبوو ماڵەکەمان خۆشترو روناکتر ببێ. وەکو ئەوە بوو یەکێک روپۆشی سەر شتەکانی ماڵەکەمان لابەرێ. من ئەو کاتانە منداڵ بووم، بەڵام تێ دەگەیشتم...»

تانیا هەژدەر هەژدەرو بەگەرمی قسەی دەکرد. کاورین لەپڕ ئەمەی هات بە خەیاڵ دا کە لەوەیە ئەم پشووی هاوینە دڵی بچێتە سەر ئەم زەعیفە وردیلەو ناسکە زۆر بلێیە. لەوانەیە بەتەواوی ئاشق و شەیدای بێ. بۆ وەزع و حاڵی ئەوان چ شتێک لەم کارە ئاسایی ترو لە گوین تر بوو؟ ئەم بیرەی پێ خۆش بوو. ئەم بیرە مژۆلی کردو هەرکە دانەوی یەوەو روانییە دەموچاوی پڕ میهرو رەنجاوی تانیا، لەبن لێوانەوە ئەم دێڕەی پوشکینی گوتەوە:

«ئونی ژین، من ئەوە ناشارمەوە کە بۆ تانیا دێوانەم».

کاتێ گەییینەوە ماڵێ، یگورسیمیونوڤیچ لەخەو رابیوو. کاورین، خەوی نەدەهات. لەگەڵ پیرەمێردا سەرگەرمی قسان بوو و، لەگەڵی دا گەڕایەوە بۆ نێو باخەکە، یگورسیمیونوڤیچ، پیاوێکی باڵابەرزی چوارشانەی قەڵەو بوو. هەرچەندە دووچاری تەنگەنەفەسی ببوو، بەڵام ئەوجاش هێندە گورجو گۆڵ بوو، زەحمەت بوو لەرێگەوباندا پێیدا بگەی. سیمای پەلەکردنی بەردەوامی دەنواند، وادەهاتە بەرچاو کە هەمیشە وابیر دەکاتەوە کە ئەگەر تۆزێ ماتەڵ بێ و درەنگ بگاتە سەرکارەکەی ئیدی هەموو شتێکی وێران دەبێ و ئاداری بەسەر پاداریپەوە نامێنێ.

– بزانم دەزانی نهێنی ئەمە چیە؟ هەڵوەستەیەکی کرد تا هەناسەیەک تازە بکاتەوەو ئەوجا لەسەری رۆیی:

– وەکو دەبینی زەوییەکە بەستویەتی، بەڵام ئەگەر گەرماپێوەکە بخەیتە سەردار عاساکەت، یانی مەترو نیوێک لە سەروی ئەرزەکەوە، سەیر دەکەی تەواو گەرمە. ئەمە بۆ وایە؟

کاورین بە پێکەنینەوە گوتی: راستت دەوێ نایزانم.

– نەء!... تۆ ناتوانی هەموو شتێک هەربزانی. گەورەترین کەللەش ناتوانێ هەموو شتێک هەربزانێ... ئایا هێشتا هەر سەرگەرمی فەلسەفەیت؟

– بەڵێ، بەزۆری خەریکی موتالاکردنی فەلسەفەو دەروناسیم.

– بێ تاقەتت ناکات؟



– بەپێچەوانەوە، بێ فەلسەفە هەڵناکەم.

یگورسیمیوڤیچ، سمێڵە قیتەکانی رێک خست و گوتی:

–، ماشەڵلا، ماشەڵلا! زۆرم دڵ بەکاروبارەکانت خۆشە، بەڕاستی پێم خۆشە.

لەپڕ گوێی هەڵخست. ترسێک نیشتە سەرسیمای. هەر پێیەکی کرد بە دووان و بەغار بەشەقامی نێو باغەکەدا بۆی دەرچوو. لەپڕ لەنێو چڕی درەختەکان و چەڕە دوکەڵدا وون بوو.

دەنگێکی نائومێدانە لە گوێی کاورین دا زرینگایەوە:– کێ ئەم ئەسپەی بەدرختەکەوە بەستۆتەوە، چ ناکەس بەچەیەک، چ دەست بڕێک زاتی ئەوەی کردووە، ئەم ئەسپە تۆپیوە بەم دار سێوەوە ببەستێتەوە. هاوار بەماڵم، وێران بوو! وێران بوو! باخەکەم وێران بوو. هاوار بەماڵم، چبکەم خوایە!

کە گەڕایەوە لای کاورین، زۆر پەریشان و پەست دیاربوو. دەستەکانی دەدا بەیەک داو دەیگوت: پیاو نازانێ لەگەڵ ئەم خەڵکە نەحلەتیەدا چ بڵێ؟ چییان لەگەڵ دەکەی؟ ئەستپکا، دووێ شەو عەرەبانەیە پەینی هێناوە بۆ ئێرەو ئەسپەکەی بە دارەکەوە بەستووەتەوە. کەر پیاوە، هێندە رەشمەی ئەسپەکەی توند بەستوە کە لەسێ شوێنەوە توێکڵی دارەکە بریندار بووە. پیاو نازانێ چ لەگەڵ ئەم خەڵکەدا بکات؟ کە قسەی لەگەڵ دەکەی چاوی حیز دەکات و خۆیت لێدەکات بە کەرەی شەربەت، پێویستە هەڵیواسی.

کە تەواو هێدی بووەوە، کاورین–ی لە ئامێز گرت و رومەتی ماچکردو گوتی: ماشەڵلا، مشەڵلا، بەڕاستی بەهاتنت خۆشحاڵم، هێند خۆشحاڵم ناتوانم بەزمان بۆتی دەربڕم، زۆر زۆر مەمنونتم»! ئەو جا بەهەمان خێرایی جارانەوە کەوتەوە رێ. لەگەڵ کۆنە شاگردەکەیدا هەموو باخەکە گەڕان، نارنجستانەکەو هەموو شوێنەکانی دی، سەرێکی دوو کورە هەنگەکەشیان دا کەخۆی گوتەنی «پەڕجوی ئەم سەدەیە» بوو.

بەدەم پیاسەکردنەوە رۆژیان لێ هەڵات و تیشکی رۆژ باخەکەی روناک کردەوە. دنیا گەرم بوو. کاورین کەوتە بیرکردنەوە لە ئایندەی پرشنگداری خۆی. بیری لەوەکردەوە کە تازە سەرەتای مانگی پێنجەو هێشتا هاوینێکی دورودرێژو خۆش بەدەستەوەیە. لەپڕ هەستێکی خۆشیی وەکو ئەو هەستانەی کە بەمنداڵی لەم باخەدا تووشی دەبوون، ئازای گیانی داگرت. ئەویش کابرای پیرەمێری لە ئامێز گرت و بەئەسپایی ماچیکرد. بیرەوەری رابردوو باڵی بەسەر هەردووکیاندا کێشا. دوو

بەدوو گەڕانەوە بۆ ماڵێ و چاو قەیماغ و پسکیتیان خوارد. ئەم وردەشتانەش بیرەوەری رۆژانی منداڵیان وەبیری کاورین هێنایەوە. خۆشی و شادی ئیستا تێکەڵ بەبیرەوەری رابردوو بوو و هەستێکی شادمانی قوڵیان لەدڵی دا جۆش دا.

چاوەڕوانی کرد تا تانیا بێدار بوەوەو قاوەی لەگەڵ ئەویشدا خوارد. ئەنجام چوو بۆ نێو باخەکەو ماوەیەک لەوێندەر پیاسەی کرد. ئەنجام چوو بۆ ژورەکەی خۆی و کەوتە کارکردن. بەوردی کتێبی دەخوێندەوەو یادداشتی تۆمار دەکرد. جار جارێ چاوی لەسەر کتێبەکەی هەڵدەبڕی و لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانییە مێزەکەی کە هێشتا ئاونگیان بەسەرەوە بوو. هەستی کرد هەموو دەمارەکانی لەشی لەخۆشی و شادیدا دەلەرزن و سەما **دەکەن**.

## ٢

کاورین، لە گوندیش دا هەمان ژیانی پڕ مەشغەڵەتی شاری درێژە پێدا. مێشک و ئەعسابی ماندووتر کرد. لەجاران پتر دەیخوێندەوە. دەینووسی و خۆی فێری زمانی ئیتالیش دەکرد. کاتێ کە بۆ پیاسەش دەچووە دەرێ هۆش و گۆشی هەر لای کارەکەی و گەڕانەوە بوو. هێندە کەم دەخەوت کە خانە خۆییەکانی پێیان سەیربوو چۆن هەڵدەکات. ئەگەر بەرێکەوت، رۆژێک نیو سەعاتێک خەوتبایە ئەوا بەدرێژایی شەوەکە خەوی دەزڕا، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو بێ خەوی یەشەدا هەر چالاک و پڕ کارو بەکەیف و بەدەماغ بوو.

زۆری قسە دەکرد، زۆری دەخواردەوە.. جگەرەی زۆر دەکێشا. بەزۆری و رۆژانە کچۆڵانی گوندەکانی ئەو دەوروبەرە دەهاتن بۆ بوریسوکاو لەگەڵ تانیادا دادەنیشتن و گۆرانیان دەگوت. جار جاریش کورێکی گەنج، کە دراوسێیان بوو، دەهات. کەمانچە ژەنێکی کارامەو لێهاتوو بوو. کاوریف گوێی لەسازو ئاوازی وان دەگرت. بەڵام ماندوو دەبوو. بێ ئیختیار چاوەکانی دەهاتنەوەیەک و ملی بەسەرشانی دا شۆڕ دەبوەوە.

کاورین، عەسرانێک پاش چاخواردنەوە لەبەر هەیوانە کە دانیشتوبوو کتبێکی دەخوێندەوە، تانیا لە ژوری میوان و لەگەڵ یەکێک لە دۆستەکانی و دوو گۆرانی بێژدا کە یەکێکیان دەنگی بەرزو ئەوی دیکەیان دەنگی نزم بوو، بەیارمەتی کەمانچە ژەنەکە پرۆڤەی گۆرانی یەکیان دەکرد. کاورین گوێی بۆ وشەکان رادەدێرا.



هەرچەند وشەکان روسی بوون، بەڵام لە ماناکانیان تێ نەدەگەیی، ئەنجام کتێبەکەی لەلایەکەوە داناو بەوردی گوێی هەڵخست. ئەمجارەیان تێگەیی. گۆرانی یەکە بریتی بوو لەوەی کە «کیژێک بەخەیاڵ، لەنیوە شەودا دەنگێکی نهێنی ئامێز لەنێو باخەکە دەژنەوێ. ئەم دەنگە هێندە ناسک و دڵگیرە کە کچە خۆی ناچار دەکات کە شکۆو پیرۆزی و گونجانی ئەو دەنگانە کە بۆ ئێمەی خەلقەندەی فانی نایەتە دەرک کردنی، دیار بکات. کچە پاش ئەوەی ڕازی دەنگەکان هەڵدێنێ و دیارییان دەکات، دەست بەجێ دەمرێ و روحی دەفڕێ بۆ ئاسمان». پێڵوی چاوانی کاورین قورس بوون. ، هەستایە سەرپێ. بەبێ تاقەتی بە ژوری میواندا تێ پەڕی و خۆی کرد بە بەردالانەکەداو لەوێندەر کەوتە هاتوچۆ. کە کۆڕی مۆسیقا تەواو بوو، دەستی تانیای گرت و لەگەڵ خویدا بردییە بەر هەیوانەکەو پێی گوت: لە بەیانی زوەوە فیکرو خەیاڵم مژولی ئەفسانەیەکی سەیرە. ناتوانم خۆم لە شەڕی ئەو ئەفسانەیە رزگار بکەم. نازانم لەکوێ خوێندومەتەوە. یان لەکێ و لەکوێم بیستووە؟ بەڵام چیرۆکێکی دڵگیرو سەرنج راکێشە. هەرچەند زۆریش هاو ئاهەنگ نیە. دەبێ لەهەوەڵەوە ئەوەت پێ بڵێم کە زۆریش سادە و روون نییە. هەزار ساڵ لەمەوبەر رەبەنێکی ڕەشپۆش لەبیابانی سوریا یان عەرەبستان سەرگەردان بوو... چەندین قۆناغ لەو لای ئەو بیابانانەوە، ماسیگران رەبەنێکی رەشپۆشی دی دەبینن کە بەئەسپایی بەسەر دەریاوە سەما دەکات. رەبەنی دووەم تارمایی رەبەنی یەکەم بوو. ئێستا تۆ هەموو یاسایەکی دەروونناسی لەمێشکی خۆت دەربکەو، چونکە لەم ئەفسانە کۆنەدا بەهیچ جۆرێ رەچاونەکراوە.. گوێ بگرە. لە تاپۆی یەکەمەوە، تاپۆیەکی دی کەوتەوە. لە دووەمەوە سێیەم کەوتەوە... هتد. چونکە وێنەو سێبەرە، واتا تارمایی رەبەنە ئەسڵی یەکە، زیندوو نەمر هەر جارەی لە شوێنێک دا دەردەکەوت. جارێ ئەم تارماییە لە ئەفریقیا، جارێ لە ئەسپانیاو، پاشان لە هندستاندا و جارێکیش لە قوتبی باکوردا بینرا. ئاقیبەت لەسنوری زەمین دەرچوو. بەڵام ئەم دەرچوونە هەرگیز نەیکردە کارێک کە ئەم تاپۆیە چیدی دەرنەکەوێ. لەوەیە ئەم تاپۆیە ئێستا لە هەسارەی مەریخ، یان لەوەیە لە کۆ هەسارەکانی باشوردا کە لە شێوەی خاچ دایە، ببینرێ. ئێستا خاڵی بنەڕەتی و سەرەکی ئەم ئەفسانەیە لەم پێشبینی یەدایە کە «رێک پاش هەزار ساڵ دوای ئەو مێژووەی کە رەبەنەکە لەبیاباندا وێڵ بوو، تاپۆکە دێتەوە سەر زەوی و خۆی نیشانی تیرەی بەشەر دەدا». و هەنوکە پێ دەچێ کە ئەم هەزار ساڵە تەواوبوو بێ... بەپێی ئەم ئەفسانەیە بێ دەبێ ئەمڕۆ یان سبەی

چاوەڕوانی ڕەبەنی ڕەشپۆش بین».

تانیا، ئەم ئەفسانەیەی بەدڵ نەبوو، گوتی: ئەفسانەیەکی سەیرە.

کاورین پێکەنی و گوتی: لەمە سەیرتر ئەوەیە کە من بیرم نیە چۆن ئەم ئەفسانەیەم لەمێشکدا چەسپیوە. ئایا لەشوێنێک دا خوێندومەتەوە؟ ئایا لە کەسێکم بیستووە؟ یان دەشێت هاتبێتە خەونم؟ بیرم نیەو نازانم، بەڵام ئەم ئەفسانەیە تێکەڵ بە هەستم بوەو لەبەیانی یەوە تا ئێوارە بیر لەهیچ ناکەمەوە، ئەمە نەبێ».

تانیا، گەڕایەوە بۆلای میوانەکانی، کاورین، لەماڵ وەدەرکەوت بێ تاقەت و غەرقی بیرو خەیاڵان بەکەنار تەلانی گوڵەکاندا کەوتە پیاسەکردن. هەتاو بەتەواوی ئاوا ببوو. بۆنێکی یەکجار خۆش لەگوڵە تازە ئاودراوەکانەوە دەهات. لە ماڵەوە، مۆسیقا سەر لەنوێ جۆش و خرۆشی بەدەنگی گۆرانی بێژەکان دەدا. کاورین، بەدەم بیرکردنەوەو گەڕان بۆ سەرچاوەی ئەفسانەکە، بەرە بەرە هەموو باخەکەی بڕی و پاشان بێ وەی بەخۆی بزانێت و مەبەستی بێت بەکەناری چۆمەکەدا نشێو بووەوە.

بەنێو ڕەگ و ریشاڵی وەدەرکەوتووی دەرەختەکاندا دەگەڕاو کاتێکی بەخۆ زانی گەییە ڕەخ ئاوەکە. مەلی زۆنگاوەکان سڵەمینەوەو دوو سۆنە نارەحەت بوون. لق وپۆپی چڕو تاریکی دار کاژەکان لەبەر تیشکی ئاسۆدا هێشتا بریقەیان دەدایەوە. بەڵام ئاوی چۆمەکە تاری ببوو. کاورین، لەچۆمەکە پەڕی یەوە. مەزرایەکی گەورەی مرۆری تازە رواو لەبەردەمی دا بوو. شوێنەواری ژیان لەو دەوروبەرەدا بەدی نەدەکرا. پێدەچوو ئەم ڕێیە بچێتەوەسەر سەر زەمینێکی رازئامێزی ئەوتۆ کە هەرگیز پێی ئادەمیزادی پێ نەکەوتبێ. بچێتەوە سەر خۆرنشینێک کە تازە خۆر چوبێتە زەردەو هێشتا دوا تیشکەکانی بەنازو شکۆوە لەوێندەر بدرەوشێتەوەو ببریسکێنەوە.

کاورین، ملی ئەو ڕێگایەی گرت و لەفیکران ڕاچوو: چ سەرزەمینێکی فراوانە! چەند کپ و ئارام و ئازادە! دەڵێی هەموو جیهان لە کون و قوژبنی ئەم سەرزەمینە فراوانەدا پەنهان بووەو لەحەشارگەی خۆیەوە دەڕوانێتە من و چاوەڕوانی منە تابچم و سەرلەنوێ بیدۆزمەوە!

شنەیەکی خۆش مەزرا مرۆرەکەی خستە کەروێشکە. شنەی فێنک و خۆشی ئێوارێ، سەری کۆتی کاورینی فێنککردەوە. تۆزێک تێپەڕی و شنەباکە هەمدیس هەڵیکردەوە. ئەمجارەیان توندتر بوو. مرۆرو گیایەکان سەریان هاتەوەیەک و لەپشت ئەوانەوە خشەی چپە ئاسایی پەلکی دارکاژەکان هاتەگوێ. کاورین



بەسەرسامی وێستا. لەلای ئاسۆوە لولەیەکی تاریکی گەردەلول ئاسایان شەپۆل ئاسا بەدیارکەوت. ئەم لولە تاریکە ئاسمان و زەوی لێک دەدا. قەوارەی ئەم لولەیە دیار نەبوو، بەڵام هەر لەیەکەم تەماشاکردنەوە دیاربوو کە لەجێی خۆی نەوەستاوە. بەڵکو زۆرخێرا بەرەو کاورین دێت. ئەم تاریکییە تا نزیکتر دەبووەوە بچوکتر دەبوەوە. کاورین بەپەلە خۆی لاداو ڕێی بۆ ئەم تاریکییە کردەوە. ڕەبەنێکی سەراپا ڕەشپۆش، قژ ماش و برنج، ئەبرۆ ڕەش، دەستەکانی لە شێوەی خاچ دا خستبوونە سەرسینگی، لەوێوە تێپەڕی. پێیە خاوسەکانی لەسەر زەوی بوون. بیست شەقاوێک لە کاورین دوورکەوتەوەو ئەوجا گەڕایەوەو تەمەشای ئەوی کرد. سەری لەقاندو بزەیەکی پڕ مهرو بێباکانەی بەروویدادا. دەموچاوی لاوازو بێ ڕەنگ بوو. کاتێ کە لەکاورین ڕەتبوو هەمدیس گەورەتر بووەوە. لە چۆمەکە پەڕی یەوە. بەبێدەنگی خۆی هەڵدایە سەر ڕەخی چۆمەکەو بەنێو دارکاژەکاندا ڕەتبوو و، دووکەڵ ئاسا لەچاو وون بوو.

کاورین، بەشڵەژاوی یەوە گوتی: بینیت، خۆ بەچاوی خۆت بینیت کە ئەفسانەکە ڕاستەو درۆی تێدا نیە. بێ ئەوەی هەوڵ بدات سەر لە نهێنی ئەم تاپۆ سەیرە دەربکات، خۆشحاڵ و ڕازی بوو لەوەی کە نەک هەر تەنیا لە نزیکەوە بە تەواوی جلە ڕەشەکانی بینی، بەڵکو سیماو دەموچاوی ڕەبەنەکەی بەتەواوی بینی. شڵەژاو لەهەمان کاتدا خۆشحاڵ گەڕایەوە بۆ ماڵێ. میوانەکان، هێدی هێدی لەباخەکەدا پیاسەیان دەکرد. کۆڕی مۆسیقا، لەماڵەوە هێشتا هەر بەردەوام بوو. کەواتە هەر خۆی ڕەبەنە ڕەشپۆشەکەی دیتوە، پڕ بەدڵ حەزی دەکرد چیرۆکی بینینی ڕەبەنە ڕەشپۆشە کە بگێڕێتەوە. بەڵام ترسا کە لەدڵی خۆیاندا گاڵتەی پێ بکەن و بڵێن چاوی ڕێشکەو پێشکەی کردووە. بۆیە لێبڕا ئەم نهێنییە لای خۆی بپارێزێت و بۆ کەسی نەدرکێنێ. قاقا پێکەنی. هەڵیکردە گۆرانی. کەوتە سەماو سوڕدان. خۆی لەجاران بەکەیف ترو شادتر بینی. میوانەکان و تانیا شادی و ئیلهامێکی تایبەتیان لە سیمایدا بەدیکرد.

## ٣

کەشێو تەواوبوو و، میوانەکان ڕۆیشتن، کاورین هاتە ژورەکەی خۆی و لەسەر قەنەفەیەک پاڵکەوت. دەیویست بیر لە ڕەبەنەکە بکاتەوە، بەڵام دوای تۆزێک تانیا

وەژورکەوت و گوتی: ئاندریوشا، تاقەتت هەیە گوتارەکانی بابم بخوێنیەوە. گوتارەکانی بەرزن. شتی چاک دەنووسێت.

یگورسیمیونوڤیچ، دوا بەدوای تانیا وەژورکەوت و بەدەم بزەیەکی دەستکردەوە گوتی: بەڕاستی بەرزن. گوێ بەقسەی تانیا مەدە. ئەگەر دەشتەوێ بیان خوێنییەوە، ئەوا شەوێ بیانخوێنەوە، دەرمانی خەونە.

تانیا بەو پەڕی متمانەوە گوتی: ئاندریوشا، گوتارەکان بخوێنەوەو بابم ناچار بکە کە پتر بنووسێت. بابم دەتوانێت نامەیەکی ئەکادیمی تێرِوتەسەل لەمەڕ باغداری بنووسێت.

یگورسیمیونوڤیچ پێکەنی. سوربووەوە. وەکو هەر نووسەرێکی بێ فیزو شەرمن شپرزەبوو و نەیدەزانی چ بلێ، ئەنجام تەسلیم بوو.

بەدەستی لەرزۆک چەند کاغەزێکی جیاکردەوەو گوتی: ئەگەر دەتەوێ گوتارەکانم بخوێنی یەوە، هەوەڵجار ئەم گوتارانەی «گاشە و سەرگوتارە روسیانە بخوێنەوە. پێویستە بزانی کە من وەڵامی چم داوەتەوە. بەڵام ئەم گوتارانە بۆ تۆ خۆش نین... یەکەم بێ سەروبەرن و دووەم تازە کاتی خەوە.

تانیا، لە ژوورەکە وەدەرکەوت. یگورسیمیونوڤیچ، لەقەراخ قەنەفەکەو لە پاش بێدەنگییەکی زۆر گوتی: ئاخ برای ئازیز. من گوتاران دەنوسم. لە پێشانگەی کشتوکاڵی دا بەشداری دەکەم و هەندێ جاران خەڵات ومیداڵ وەردەگرم. هەموو خەڵکی دەڵێن پسوتسکی سێوی وای هەن هەریەکەی بەئەندازەی سەری ئادەمیزادێک... پسوتسکی، سەروەت و سامانێکی وەهای لە باخەکانی وەدەست هێناوەکە.. خۆڵاسە بەدەردی- کوشوبی- شاعیر گوتەنی: هەم پارەدارەو هەم خاوەن پایەو شکۆ.

بەڵام حەز دەکەم لەتۆ بپرسم کە بەچی دەچێت؟ باخەکانم بێ چەندو چون جوان و عالن. باخی نموونەین... باخ نیە بەڵکو موزەخانەیەکی بێ هاوتایە. دەزگایەکە کە جگە لەجوانی بایەخێکی سیاسی زۆریشی هەیە. هەنگاوێکی تازەیە بەرەو سەنعەتی کشتوکاڵی هاوچەرخی روسیا... بەڵام بە چ دەچێت و ئاکامەکەی چ دەبێ؟.. ئامانجی سەرەکی ئەم کارە چیە؟!

- وەڵامی ئەم پرسیارە ئاسانە.

- مەبەستم ئەو وەڵامە نیە. دەمەوێ بزانم دوای مردنی من چی بەسەر ئەم باخە دێت؟ پێم وایە یەک مانگ پاش مردنی من، باخەکە تیا دەچێت. هەڵبەتە لەبەر



ئەوە نا کە باخەکە گەورەیەو کرێکارو باخەوانی زۆری هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کەمن ئاشقی ئەم کارەم. حاڵی عەرزم هەیت؟ من ئەم کارەم خۆش دەوێ. لەوەیە لە خۆم پتر خۆشبوێ. من رۆژ تا ئێواری کار دەکەم. هەموو کارەکان بەدەستی خۆم جێبەجێ دەکەم. قەڵەم لێدان، موتوربەکردن، ناشتن. هەرهەموو ئەم کارانە بەدەستی خۆم دەکەم. ئەگەر یەکێک یارمەتیم بدات بەغیلی پێدەبەم و هێندە تورە دەبم کە هەندێ جار لەسنوری ئەدەب دەردەچم هەموو نهێنی یەک لە ئەشقی کاردا خۆی حەشارداوە. لەچاوی تیژی وەستایەک دا، لەدەستی کارامەی وەستایەک دا خۆی حەشارداوە. کە دەچمە دیدەنی دۆستێک و نیو سەعاتێک دادەنیشم هەست دەکەم دڵم لە جێیەکی دیە. هەمیشە ترسی ئەوەم لەدڵە نەک باخەکە شتێکی بەسەر بێ. ئەوجا وەرە بیری لێبکەوە کە سبەینێ من مردم کێ جێم دەگرێتەوە؟ کێ ئەم کارانە جێبەجێ دەکات؟ باخەوانەکان؟ یان کرێکاران؟ راست و دۆغری خەمی گەورەی من ئەمەیە کە سبەی باخەکانم بکەونە دەستی بێگانان، دەنا چ ترسێکم لە کەروێشک و کرم برەو سەهۆڵبەندان نیە. ترسی گەورەم ئەوەیە کە باخەکانم بکەونە دەستی بێگانان...

کاورین گوتی: خوا نەیبرِێ تانیا هەیە... بەپێکەنینەوە لەسەری رۆیی:مەعلوم لە کەروێشکان خەتەرتر نیە... ئەویش حەز لەکار دەکات و چاکیش سەری لێی دەردەچێت.

- بەڵێ تانیاش شارەزایەو سەری لە کارەکانی دەردەچێت. خۆزگە دوای من باخەکە بکەوتبایە دەستی ئەو! جالەوە باشتر دەبێ! بەڵام... خوا بەو رۆژە نەکات، ئەگەر هاتوو شویکرد.

یگورسیمیونوڤیچ، بەچاوانی ترس لێ نیشتووەوە روانیە کاورین و بە ئاسپایی گوتی: نەگبەتیەکە لەوەدایە کە تانیا شوو بکات و پاشان منداڵی ببێ و ئیدی فریای باخەکە نەکەوێ. ئەمە خۆی لەخۆیدا کارێکی زۆر خراپە، خۆ لەمەش خراپتر ئەوەیە شوو بە پیاوێک بکات کە چاوی لە ماڵەکەی بێ و تەنیا لەبەر سەروەت و سامانەکەی بیخوازێ و ئیدی بە ساڵێک باخەکە لەدەست دەچێت. ئاخر هەر لەبەر دووشتی وایە کە دەڵێن: ژن قامچی خوایە! ژن نەحلەتی خوایە!

یگورسیمیونوڤیچ، ئاهێکی هەڵکێشاو پاش کەمێک بێدەنگی گوتی:

- رەنگە تۆ ئەمە بە خۆپەرستی بزانیت، بەڵام من حەزناکەم تانیا شووبکات. ئەو هەیتوە جیقنە دەبینی کە هاتووچۆی ئێرە دەکات و هەمیشە خەریکی

کەمانچەلێدانە؟ من دڵنیام کە تانیا هەرگیز شوی پێناکات، بەڵام دیسان هەر خۆشیم بەچارەیدا نایەت. ئیدی برای ئازیز منیش بۆ خۆم بەشەرێکم و لەفیکری خۆم حاڵی دەبم.

یگورسیمیونوڤیچ هەستا، بەنیگەرانی یەوە کەوتە هاتووچۆ بە ژوورەکەدا دیاربوو شتێکی پێ بوو، بەڵام نەیدەتوانی بیدرکێنێ.

دەستەکانی تەپاندنە گیرفانی یەوەو گوتی: من بابایەکم حەز بەپێچ و پەنا ناکەم و هەر چیەکم لە دڵدا بێ بەراشکاوی دەیلێیم، بەکورت و کرمانجی تۆ تاقە پیاوێکی ئەگەر تانیا بخوازی لێت ناترسم. تۆ پیاوێکی هوشیارو بە ویژدانی و، هەرگیز رازی نابی رەنجی ژیانی من بەفیرۆ بچێ. ئەمە جگە لەوەی من تۆم وەکو کوڕی خۆم خۆش دەوێ و شانازیت پێوە دەکەم. بۆیە ئەگەر خوا بکات، تۆو تانیا بۆ یەک ببن، زۆر خۆشحاڵ دەبم.

کاورین، بزەیەکی بۆ کرد، یگورسیمیونوڤیچ دەرگاکەی کردەوەو دەیویست بڕوا... بەڵام لەپڕ لەنێو دەرگاکەدا هەڵوەستەیەکی کردو گوتی: ئەگەر کوڕێکتان ببێ، ئەوا وەکو پسپۆرێکی کاروباری کشتوکاڵ پەروەردەی دەکەم.. لە سەری رۆیی:

-... بەڵام هەموو ئەمانە خەیاڵی خاوە! شەو باش!

کاورین، پاش رۆیشتنی ئەو، بە ئیسراحەت لێی راکشاو کەوتە خوێندنەوەی گوتارەکانی خانەخوێ یەکەی. یەکەم گوتار بە ناونیشانی «کشتوکاڵی سەدەکانی ناوەڕاست» بوو. دووەم گوتار بەناونیشانی «کورتە وەڵامێکی رێزدار ز. دەربارەی رەمەعەل هێنانی خاکی باخێکی تازە». گوتاری سێیەم بەناونیشانی «چەند سەرنجێک لەمەڕ موتوربەکردن» و گوتارەکانی دیکەش ناونیشانی لەو بابەتانەیان هەبوو. بەڵام چەشنە شپرزەییەکی گیانی باڵی بەسەر هەموو گوتارەکان دا کێشابوو، تەنانەت ئەو گوتارەش کە بەناونیشانی «دار سێوی وڵاتی روسیا» بوو، هەر لەو شپرزە گیانییە بەدەرنەبوو. یگورسیمیونوڤچ ووتارەکانی بەم ڕستە لاتینی یە دەست پێدەکرد «گوێ لەقسەی موخالیفانیش بگرە» و بەم رستەیە کۆتایی پێ دێنا «کەسێ کەسە ئەلفێکی بەسە». لەنێوان ئەم رستانەدا کە بەزمانی لاتینی دەینووسین، یەک دنیا قسەی رەق و ناشیرین بەدی دەکرا کە راستەوخۆ دژی «جەهالەت و نەزانی پسپۆڕانی کشتوکاڵی کە لەپشت کورسی ئەکادیمیاوە دەیانڕوانییە سروشت» نووسرابوون. بەتایبەتی دژی ئاغای «گاشە» بوو کە «شۆڕەتی خۆی لەسەر بناغەی کفرکردن و بەرەڵڵایی رۆنابوو» کاورین، ئەنجام تووشی هەندی بابەتی بێ سەروبەرو



دەربڕینی پڕ داخ و کەسەری بێڕەحمانەی نووسەری گوتارەکان بوو، نووسەر داخی لەوە دەخوارد کە جەڵدەلێدانی ئەو دێهاتیانەی میوە دەدزن یان دەرخت دەشکێننەوە بەپێی یاسا قەدەغەکراوە. لەفکران ڕا چوو «کارەکەی کارێکی چاکە. کارێکی ماقوڵ و رێکوپێکە. بەڵام پیاو لەم دەقانەدا جگە لە دڵڕەقی و شەڕفرۆشتن چ شتێکی دی بەدی ناکات. پێم وایە لە هەموو شوێنێک هەروایە. لە هەموو کاروپێشەیەک دا خاوەن نەزەران خەڵکانێکی تووڕەو لە رادەبەدەر دڵ ناسکن و دەبن بە قوربانی هەست و دڵ ناسکی خۆیان، پێم وایە دەبێ هەر واش بێ».

بیری لە تانیا کردەوە. ئەو تانیایەی کە لەرادەبەدەر دڵبەندی گوتارەکانی بابی بوو، ئەوجا بیری لە یگورسیمیونوڤیچ کردەوە. تانیا کیژێکی وردیلە، رەنگ کاڵ، چاپوک و گورج و گۆڵ، ئێسکەکانی سینگی بەدەرەوە بوون. چاوەرەشە درشتەکانی وەکو ئەوەی تاقیبی شتێک بکەن، بەردەوام دەگێڕا. هەموو ئەمانە سەرنجی کاورین یان راکێشا. ئەوجا یگورسیمیونوڤیچ-ی بە لاقە کورتەکانی یەوە هێنایە بەرچاوی خۆی. دیسان گەڕایەوە سەرتانیا. تانیا زۆر حەزی لە گفتوگۆو موناقەشە دەکردو هەمیشەو بەشێوەیەکی زۆر تایبەتی قسەکانی دەکرد «تووڕە، پێم وایە لە رادەبەدەر تووڕە بێ».

دیسان کەوتەوە خوێندنەوە، بەڵام هیچ تێ نەگەیی و کتێبەکانی تووڕدا. هەستێکی خۆش دایگرت، هەستی سەماکرن و گوێگرتن لە مۆسیقا. هەستێک کە هەزاران بیری لەمێشکی دا وروژان. ئەوەی بەبیردا هات کە ئەگەر ئەم رەبەنە سەیرو نائاسایییە تەنیا ئەم دیتبێتی و کەسی دی نەی دی بێ ئەوا ئەم نەخۆشەو نەخۆشێکی وەهایە کە تاپۆو شەبەنگانی دێنە بەرچاو. ئەم بیرە کەمێک ترساندی.

لەسەر قەنەفەکە دانیشت و سەری خستەنێو هەردوو دەستی. هەوڵی دا زاڵ بێ بەسەر ئەو نەخۆشییەدا کە باڵی بەسەریدا کێشابوو. پاش تۆزێک هاتووچۆ بەژوورەکەدا، گەڕایەوە سەرکارەکەی خۆی، بەڵام بابەتی کتێبەکە تینوێتی و ئارەزووی نەدەشکاند. ئەو عەوداڵی شتێکی نادیارو سەرسوڕهێنەرو مەزن بوو. دەمەو بەیان خۆی گۆڕی و بە نەبەدڵی یەوە چووە نێو جێگاکەی. هەستی دەکرد پێویستی بە ئیسراحەتە. ئاخری کە گوێی لە دەنگی یگورسیمیونوڤیچ بوو کە دەچوو بۆ نێو باخەکە، لەزەنگی داو پێش خزمەتەکەی گازکرد کە شەرابی بۆ بێنێ، چەند پێکێکی هەڵداو کەمێک مەنگ بوو و خەوی لێ**کەوت**.

## ٤

یگورسیمیونوڤیچ و تانیا بەزۆری شەڕیان بوو و قسەی ناشیرینیان بەیەکدی دەگوت. ئەو رۆژەش بەیانییەکەی شەڕیان ببوو و تانیا دەستی بەگریان کردبوو و چووبووە ژوورەکەی خۆی و نەبۆ فراڤین و نەبۆ چای خواردن نەهاتبووە خوارێ.

یگورسیمیونوڤیچ هەوەڵجار بەرەزامەندییەوە کەوتبووە هاتووچۆ بە ژوورەکەدا. وەکو بیەوێ بۆ هەموو کەسێکی بسەلمێنێ کە عەدالەت و زەبت و رەبت بەلای ئەوەوە بەرزترین بناغەو دەستووری ژیانە، بەڵام نەیتوانی لەسەر ئەم وەزع و حاڵە بڕواو بەردەوام بێ هەرزوو دڵی تەنگ بوو و لە ئەسپی غرور دابەزی. لەکەلی شەیتان هاتە خوارێ. سەرگەردان و وێڵ بە باخەکەدا دەسوڕایەوەو هەر پەکو پۆی بوو: ئاخ خوایە!. نیوەڕۆ هیچی پێنەخورا، بەئەسپایی لە دەرگای داخراوی ژوورەکەی تانیای داو بەشەرمەزاری یەوە گازی کرد: تانیا! تانیا!.

لەپشت دەرگاکەوە دەنگێکی کزو گریاناوی هاتە گوێ: وازم لێ بێنە.. تکایە وازم لێ بێنە.

زویربوونی باب و کیژ لەهەموو ماڵەکەدا رەنگی دابووەوەو تەنانەت کاری کردبووە باخەوان و کرێکارانی باخەکەش. کاورین، وەکو جاران سەرگەرمی کارەکانی خۆی بوو، بەڵام ئەنجام ئەویش ماندوو و نارەحەت بوو. لێبڕا بکەوێتە بەینیانەوەو ئەم هەوری زیزبوونە بەر لە شێو بڕەوێنێتەوە. لە دەرگای ژوورەکەی تانیای دا. روخسەتی لێ وەرگرت و وەژوورکەوت، بەشۆخیەوە گوتی:

– وەرە، وەرە. شەرم ناکەیت!.. بەسەرسامی روانییە دەموچاوی فرمێسکاوی و تۆراوی تانیاو گوتی: یانی شەڕەکەتان ئەوەندە جدییە؟ جوانە، جوانە.

تانیا گوتی: ئەگەر دەتزانی چی پێکردوم! ئەمەی گوت و فرمێسک وەکو بارانی بوهار لەچاوە درشتەکانییەوەدا بارین. دەستەکانی دان بەیەکداو لەسەری رۆیی: هەر کوشتمی، باوەڕ بکە چ قسەیەکی غەڵەتم نەکردووە... تەنیا ئەوەندەم گوتووە کە پێویست ناکات ئەم هەموو کرێکارە رابگرین... ئەگەر... بکرێ بەرۆژانە کرێکاران بگرین باشترە.. تۆ نازانی ئەو کرێکارانە یەک هەفتەیە چ کارێکیان نەکردووە. من، من تەنیا ئەوەندەم گوت، کەچی لێم راپەڕی و... هەزارو یەک جنێوی سەربەکوڵکەی دامێ.. جا جنێوی ناشیرین.. لەپێناوی هیچیش».

کاورین، قژی تانیای رێک خستەوەو گوتی: گوێی مەدەیێ، بەشی خۆت شەڕت



کردوەو فرمێسکیشت رشتووە. بەسەئیدی، خۆ هەتا هەتایە هەر ناتۆرێی.. بڕوا بکە بابت زۆری خۆش دەوێی.

تانیا بەدەم هەنسک هەڵدانەوە لەسەری رۆیی: ژیانی لێ تاڵ کردوم قسەی خۆشی جوێنە. عەرزەتمە قسەیەکی خۆشی لێ بژنەوم. بەجۆرێ سەیرم دەکات وەکو ئەوەی لەم ماڵەدا بێگانەبم. کەیفی خۆیەتی با وابکات. هەڵبەتە بیانوویەکی هەیە. من سبەی ئەم ماڵە بەجێ دێڵم و دەڕۆم کارێک بۆ خۆم دەدۆزمەوە، دەبم بە تەلەگرافچی. قەیدی نیە با بەدڵی خۆی بکات.

– وەرەگیانە وەرە، مەگری تانیا. گریان بەچی دەچێ؟ ئێوە هەردووکتان توڕەو دڵ ناسکن و خەتای هەردووکتانە، وەرە با ئاشتتان بکەمەوە.

کاورین، نەرم و لەسەرخۆ قسەی دەکردو تانیا کوڵی گریانی نەدەنیشتەوە. شانەکانی کووڕ دەکردەوەو دەستی دەدان بە یەکدا، لەتۆ وایە نەگبەتی یەکی گەورە بەرۆکی گرتووە. کاورین لەوە دڵگیربوو کە ئەم هەموو بشێوێنی و خەم و خەفەتە لەسەر شتێکی هیچ بوو. چ روداوێکی هیچ و بێ بایەخ ئەم بەستەزمانەی بەدرێژایی رۆژێک یان خۆی گوتەنی بەدرێژایی هەموو تەمەنی وا کڵۆڵ و داماو کردبوو! لەو دەمەدا کە دڵخۆشی تانیای دەدایەوە ئەوەی بەبیردا هات کە لەم دنیایەدا جگە لەم باب و کیژە چ کەسێک نیە کە ئەوی وەکو خزم و کەسی نزیک خۆش بوێ. ئەگەر ئەمان نەبوایەن ئەو هەر لەمنداڵیەوە بێ باب و دایک، وێڵ و سەرگەردان دەبوو و، لەهەموو ژیانی دا عەزرەتی سۆزێکی دڵسۆزانە دەبوو و، هەرگیز تامی خۆشەویستی نەدەچەشت. ئەو خۆشەویستیەی کە تەنیا لە کەسوکاری دڵسۆز چاوەڕوان دەکرێ.

کاورین هەستی کرد کە ئەعسابی ماندووی وەکو موگناتیس بەرەو ئەم کیژە چاو بە فرمێسکە دەکشێ، هەروەها هەسیکرد هەرگیز ناتوانێ ژنێکی قوت و قەڵەوی گۆنا ئاڵی خۆش بوێ. بەڵام ئەم تانیا رەنگ کاڵ و لاوازو کەمجورمە تەواو دڵی بردووە. کەدەیروانی یە شان و مل و قژی تانیا، لەناخ دا گەشکەی دەکرد. دەستەکانی تانیای گوشی و فرمێسکەکانی بۆ سری... ئاخری تانیا ژیر بووەوە. بەڵام هێشتا گلەیی لەبابی و لەژیانی نارەحەتی خۆی دەکردو لە کاروین دەپارایەوە کە لەم وەزع و حاڵە رزگاری بکات. ئەوجا تانیا بەرەبەرە گەشایەوەو بزە کەوتە سەرلێوانی و کەوتە گلەیی لەبەختی خۆی کەخوا بۆ چی بەمجۆرە دروستی کردوەو بۆ هێندە دڵی ناسکە. پاشان لە قاقای پێکەنینی داو گوتی من شێتم و بەغار لە ژورەکە وەدەرکەوت. کاورین، دوای تۆزێک چوو بۆ باخەکە. سەیری کردیگورسیمیونوڤیچ و تانیا وەکو

ئەوەی هیچ رووی نەدابێ، شان بەشانی یەکدی بە شەقامی نێو باخەکەدا پیاسە دەکەن و نانیان دەخوارد. هەردووکیان زۆریان برسی بوو.

## ٥

کاورین، زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کەتوانی بووی یگورسیمیونوڤیچ و تانیا ئاشت بکاتەوە، بەدەم ئەو خۆشیەوە چوو بۆ باخەکە. لەسەر تەختێک دانیشت و چووە ژێری. لەپڕ گوێی لە دەنگی تەقە تەقی عەرەبانەیەک و پێکەنینی ژنێک بوو، دیاربوو دیسان میوانە. دەنگی کەمانچە بەرزبووەوە. دەنگی نامەفهومی ژنێک گەیشتە گوێ. ئەم دەنگانە رەبەنە رەشپۆشەکەیان وەبیر کاورین خستەوە. لەکوێ، لە چ وڵاتێک، لەسەر کام هەستارە ئەم بونەوەرەی، هاتۆتە بەرچاو.

بەزەحمەت ئەم ئەفسانەیەی وەبیر خۆی هێنابووەوە خەریک بوو ئەو تاپۆڕەشەی کە لە مەزارەکەدا دیتبوی لە خەیاڵی خۆیدا بەرجەستە بکات. لەپڕ لەپشت دارکاژەکانی بەرانبەرییەوە پیاوێکی دەستە باڵا، بەبێ خشپەو بێ ئەوەی بچوکترین سرتەی لێوە بێ وەدەرکەوت. قژی بۆز بوو بوو. کڵاوی لەسەر نەبوو. دەموچاوی هێندە بێ رەنگ بوو، هەر لەدەموچاوی مردوان دەچوو. یەک دنیا خاڵی رەشی ناشیرین بەروویەوە بوو. کابرای غەریب یان کابرای سواڵکەر بە ئەدەب و نەزاکەتەوە سەری دانەواندو بەبێدەنگی هاتە پێشەوەو لەسەر تەختەکەی کاورین دانیشت. کاورین، رەبەنە رەشپۆشەکەی ناسییەوە. تاوێکی باش لێکدی رامان، کاورین بەسەرسامی و رەبەنەکە بەخۆشەویستی یەوە، وەکو جاری یەکەم، بەڵام چەشنە رەندی و بێ موباڵاتییەک بەسیمایەوە دیاربوو. کاورین گوتی:

– تۆ بوونەوەرێکی خەیاڵیت، بۆچی هاتوییە ئێرەو بۆچی لە شوێنێکدا دانیشتووی، ئەم کارەی تۆ لەو کۆنە ئەفسانەیە ناچێت».

رەبەنەکە بەهێمنی وەڵامی دایەوە: فەرق ناکات.

رووی کردەکاورین:– ئەفسانە، بونەوەری خەیاڵی، من، هەر هەموو ئەمانە زادەی خەیاڵی ورووژاوی تۆن. من شەبەنگم.

کاورین گوتی: یانی دەتەوێ بڵێی کە چ بوونێکت لەدەرێی خەیاڵدا نیە؟

– چۆنت ئارەزوو لێیە وای بیر لێ بکەوە. من لە خەیاڵی تۆدا هەم. چونکە خەیاڵی تۆ بەشێکە لە تەبیعەت، کەواتە من دەبێ لە تەبیعەتیش دا هەبم. ئەمەی



گوت و سوکە بزەیەک کەوتە سەر لێوی.

کاورین گوتی: هوشیارو بەدەماغ دیاری. پێم وایە لەدنیای واقیع دا پتر لە هەزار ساڵ تەمەنت رانیوە. من نەم دەزانی خەیاڵم توانای ئەفراندنی دیاردەیەکی وای هەیە. بۆ واسەیرم دەکەی؟ خۆشت دەوێم؟

– بەڵێ، چونکە تۆ لەو خەڵکە کەمانەی کە بەڕاستی دەکرێ نێوی هەڵبژاردەی خوات لێ بنرێ. تۆ خزمەتی حەقیقەتی نەمر دەکەی، بیرو بیرکردنەوەی تۆ، مەبەست و ئارەزووی تۆ، بەهرەو زانیاری تۆ، هەموو ژیانی تۆ مۆری خوایی لێدراوە. بە ئاشکرا مۆری خوایی پێوە دیارە. هەموو شتێکی تۆ لە قەبێلی ئەقڵ و جوانی کراوە، واتا بۆ جیهانی ئەبەدی و پایەدار تەرخانکراوە.

– باسی «حەقیقەتی نەمر»ت کرد، ئایا تیرەی بەشەرە، بەشەری فانی دەگاتە حەقیقەتی نەمر؟

رەبەنەکە گوتی: ژیانی نەمر هەیە.

– تۆ پێت وایە بەشەر بونەوەرێکی نەمرە؟

– هەڵبەتە، ئایندەیەکی جوان و بەشکۆ چاوەڕوانی ئێوەیە. چاوەنۆڕی تیرەی بەشەرە. تا جیهان، پیاوانی وەکو تۆی زۆر هەبێ، زووتر دەگاتە ئەم ئایندەیە. بەبێ تۆ و نموونەی وەکو تۆ کە بەهوشیاری و وریاییەوە دەژین، کە سەربەرزو ئازادن، کە خاوەنی سەرەتای بەرزو جوانن، بەشەرییەت چ مەعنایەکی نیەو بە پێی دەستووری تەبیعی دەبێ دەستەو ئەژنۆ دانیشن و چاوڕەوانی کۆتایی مێژووی خۆ بکەن، بەڵام تۆو نموونەی وەک تۆ، بە درێژایی هەزاران ساڵ تیرەی بەشەر دەگەیەننە حەقیقەتی نەمر. خزمەتکردن و ئەرکی بەرزو پیرۆزی ئێوە ئەمەیە. هەرچی بەرەکەت و فەڕێک کەخوا وەعدی بە بەندەکانی داوە لەبوونی تۆدا بەرجەستەبووە.

کاورین پرسی: ئامانجی تەمەنی جاویدان چیە؟

– ئامانجی تەمەنی نەمر وەکو هەموو ژیان خۆشییە. خۆشی راستەقینەش لەزانست دایە، ژیانی نەمر سەرچاوەی لەبن نەهاتووی زانست بۆ تیرەی بەشەر دەڕەخسێنێ. هەر لەبەر ئەمەشە گوتویەتی: «ماڵی بابی من پڕە لەقەسرو کۆشکان...»

کاورین، بەخۆشیەوە دەستەکانی دان بەیەک داو گوتی: دەزانی زۆرم کەیف بە قسەکانت دێت؟!

– سوپاس.

– بەڵام با ئەوەشت پێ بڵێم کە تۆ بڕۆیت ئیدی لەبوونت دەکەومە گومانەوەو گومان دەمکوژێ. تۆ تاپۆو شەبەنگی، زیندە خەون و خەیاڵی، دیتنی تۆ نیشانەی ئەوەیە کە من نەخۆشم و لە حاڵێکی ئاساییدا نیم.

– جا چ قەیدییە بانەخۆش بی؟! نابێ ئەمە ساردت بکاتەوە. تۆ نەخۆشیت چونکە زیاد لە پێویست کار دەکەیت. چونکە سەلامەتی خۆت کردۆتە قوربانی ئامانجێک و ڕۆژەک دێ کە نەک هەر سەلامەتیت بەڵکو ژیان و ژینت لەم پێناوەدا فیدا بکەیت. لەوەی پتر چت دەوێ؟ ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە هەموو تەبیعەتێکی هەڵبژاردەو عال بەتاسەیەوەن.

– بەڵام ئەگەر نەخۆش بم چ متمانەیەکم بەخۆ دەبێ؟

– بەچ مەعلوم هەموو ئەو بلیمەتانەی کە بوونە مایەی متمانەی هەموو جیهان، سوودیان لەخەون و خەیاڵ نەبینیوە. ئیستا بەتۆ دەڵێن کە بیلمەتی زۆر لەشێتییەوە نزیکە. بلیمەتی و شێتی زۆر لێکدی دوور نین. باوەڕ بکە خەڵکانی ساغ، خەڵکانێکی ئاساین، ران و پەزن، ترسان لە نەخۆشی ئەعساب، لەپیربوون و پەککەوتن تەنیا ئەو کەسانە ئازار دەدات کە ئامانجی ژیانیان لەحاڵی حازردایە نەک لە ئایندەداو ئەمانەش هەمان ران و پەزن، خەڵکانی ئاساین.

– بەڵام گوتەی «ئەقڵی ساغلەم لەبەدەنی ساغلەم دایە» ئامانجی ڕۆمیانی کۆن بووە.

– مەرج نیە هەر چییەک ئەوان گوتبێتیان دروست بێ. خورپەو هەڵچون، تاسەو ئەڵها، بەرزەفڕی، حاڵ و جەزبە، هەموو ئەم خەسێتانەی کە شاعیران، پەیامبەران و شەهیدانی ڕێگەی ئامانجی بەرز، لە خەڵکانی ئاسایی جیا دەکاتەوە، لەگەڵ ژیانی ئاژەڵی دا ناگونجێ، واتا لەگەڵ سەلامەتی بەدەن و ساغی بەدەن دا ناگونجێ. جارێکی دیکەش پێت دەڵێمەوە ئەگەر دەتەوێ ساغ و ئاسایی بیت ئەوا ببە بەیەکێک لەرەشە خەڵکەکە، ببە بەیەکێک لە پەزەکە.

کاورین گوتی: سەیرە، هەرچی یەک بەخەیاڵی مندا هاتووەو چەندین جار بیرم لێکردۆتەوە تۆ گوتت. وەکو ئەوەی تۆ هەمیشە ئاگات لە من بووبێ و گوێت لەبیرو خەیاڵە نهێنی یەکانم بووبێ، بەڵام بەسە باسی من مەکە، تۆ مەبەستت لە هەقیقەتی نەمر چیە؟

چۆنی لێک دەدەیتەوە؟

ڕەبەنە کە وەڵامی نەدایەوە. کاورین تەمەشایەکی کرد، بەڵام نەیتوانی دەموچاوی



بەجوانی ببینێ. سیمای دیار نەمابوو. سەرو دەستی دیار نەمان، ڕەبەنە ڕەشپۆشە کە بەتەواوی دیاری نەماو لەچاو وون بوو.

کاورین، بەپێکەنینەوە گوتی: حەیفێ لەچاو وون بوو.

بە کەیفخۆشی و چالاکییەوە بۆ ماڵ گەڕایەوە. قسەی ڕەبەنە ڕەشپۆشەکە ڕوح و گیانی لەرادە بەدەر شادکردبوو، بوونە هەڵبژاردە، خزمەتکردنی هەقیقەتی نەمر. دانانی لەریزی ئەوانەی کەهەزاران ساڵ ژیانی مرۆڤ پێش دەخەن، دانانی لەریزی ئەوانەی کە مرۆڤ لە گرفتاری و گوناحی هەزاران ساڵ ڕزگار دەکەن، ئەوانەی هەموو شتێکی خۆ لەرێی ئامانجێک دا دادەنێن، گەنجییان، تواناو سەلامەتیان دەبەخشن و لەپێناوی شادی کۆمەڵدا دەمرن، چ ئامانجێکی پیرۆزە. چ پلەو پایەیەکی مەزن و بەرزە. وەختێ بە ژیانی ڕابردووی خۆیدا چۆبەوە، ژیانی بێ ڕتوش و بێ غەل و غەش و پڕکارو کۆششی خۆی هێنایەوە بەرچاو، وەختێ ئەوەی فێری ببوو و، خەڵکانی دیکەی فێرکرد بوو بەیاد هێنایەوە، گەییە ئەم ئەنجامەی کە قسەکانی کابرای ڕەبەن موبالەغەیان تێدانیە.

تانیا کە بەدووی دا دەگەڕا، لەپارکەکەوە وەدەرکەوت و بەرەو لای ئەم هات. جلێکی تازەی لەبەرکرد بوو. ئەو جلە نەبوو کە کاورین ئاخرجار لەبەریدا دیتبوی. هاواری کرد: ئەوە لێرەی؟ خۆ هەمووومان بەدوی تۆدا دەگەڕاین... وی ئەوە چیە؟ بەسەرسامی ئەو پرسیارەی کردو چاوی بڕییە سیمای پرشنگداری و چاوانی فرمێسک تێ زاوی و گوتی: ئاندریوشا، چیت بەسەر هاتووە زۆر گۆڕاوی؟!

کاورین دەستی خستە سەرشانی تانیاو گوتی: من زۆر شادم، لە شادیش زیاتر، بەختیارم. تانیا، تانیای ئازیز، تۆ بێ ئەندازە ئازیزو خۆشەویستی. تانیا زۆر خۆشحاڵم.

بەگەرمی هەردوو دەستی تانیای ماچکردو لەسەری ڕۆیی:

– ئێستاکێ، لەوپەڕی هەوای خۆدا بووم. لەلوتکەی شادی دا بووم. لەژیانمدا ئەوەندە شاد نەبووم، بەڵام ناتوانم هەموویت بۆ بگێڕمەوە. چونکە بەشتێم دەزانی. باوەڕ بە قسەکانم ناکەیت. بابێینە سەر باسی تۆ. تانیا من تۆم خۆش دەوێ و دەمێکە خۆشم دەویی، نزیک بوونەوەو دیتنی تۆ بووە بەشێک لە ئەرکەکانی ژیانم نازانم کە بگەڕێمەوە چۆن بەبێ تۆ هەڵبکەم.

تانیا بەپێکەنینەوە گوتی: بەو خەستییەش نا. دوای دوو ڕۆژ لەبیرت دەچمەوە. ئێمە خەڵکانی بچوکین و تۆ پیاوێکی گەورەی. کاورین گوتی: بێ سوعبەت،

بەتەمام لەگەڵ خۆمت بەرم تانیا، باشە؟ لەگەڵم دێی؟ تۆ دەبی بەهی من!

تانیا هاواری کرد: چی؟ ویستی پێ بکەنێ، بەڵام پێکەنین چووە قاتی و نەکەوتە سەر لێوانی. لە جێی پێکەنین رووەتی سور هەڵگەڕا، هەناسەی سوار بوو و، بەپەلە بەرەو باخەکە رۆیی. دەستەکانی هەڵگلۆفتن و بەنەباوەڕی یەوە گوتی: باوەڕ ناکەم. هەرگیز لەم باوەڕەدا نەبووم... هەرگیز...

بەڵام کاورین بەپەلە بەدووی دا چوو بەهەمان سیمای نورانی و پرشنگدارو حاڵ لێهاتنەوە لەسەری رۆیی: من عەوداڵی ئەشقێکم هەموو بوونم فەتح بکات. تەنیا تۆ، تەنیا تانیا ئەم ئەشقە بەمن دەبەخشێ. من زۆر بەختیارم، کە بەختیارم!

تانیا، تەسلیم بوو... کووڕ بووەوە، تێک چوو، لەتۆ وایە بە ئەندازەی دە ساڵ پیرتر بوو، بەڵام لەبەرچاوی کاورین یەکجار جوان بوو. بەدەنگی بەرز گوتی: چەند جوانە!

## ٦

یگورسیمیونوڤیچ، کەزانی کاورین نەک هەر ئاشقی تانیا بووە، بەڵکو لێبڕاوە بشی خوازێ، تەواو شپرزە بوو. چووە سوچێکەوەو هەوڵی دا شپرزەیی خۆی وەشێرێ. دەستەکانی دەلەرزین، گەردنی وەکو ئەوەی بای کرد بێ شین هەڵگەڕابوو. دەستوری دا کە ئەسپەکان بێنن و عەرەبانەکەیان لێ ببەستن. سوار بوو و رۆیی. تانیا کە بینی چۆن ئەسپەکان بەر قامچیان دەداو کلاوەکەی تا سەر گوێی داگرتووە، ئیدی لە وەزع و حاڵی تێگەیی. خۆی بەژوورەکەی خۆیدا کرد. دەرگاکەی لەسەر خۆی داخست و بەدرێژایی ئەو رۆژەگریا. لە نارنجستانەکەدا، هەموو قۆخ و هەڵوژەکان بەتەواوی پێ گەیی بوون. دەبوایە زۆر بەوریایی لێ بکرێتەوەو لە سەندوقان بخرێن و بنێردرێن بۆ موسکۆ. چونکە دنیا زۆر گەرم بوو. دەبوا هەموو درەختەکان ئاو بدەن. ئەم کارە وەختی زۆری دەویست. ئەمە جگە لەوەی درەختەکان کرمیان هەڵێنا بوو. هەرچەند کاورین زۆری قێز لە کرمەکان دەکردەوە، بەڵام چارنەبوو، کرێکارەکان و تەنانەت یگورسیمیونوڤیچ و تانیاش بەبەرچاوی ئەوەوە بەدەست کرمەکانیان دەفلیقاندەوە.

خەڵکی لێکدا لێکدا دەیانکردە سەریان و میوەیان بۆ وەرزی پایز رادەسپارد. ئیدی وەڵامدانەوەو رازیکردنی ئەو خەڵکەش ببوو بە سەرباری کارەکانی دی.



گەرمەی کارکرن بوو. کەس نەیدەپەرژا سەری خۆی بخورێنێ. لەم گەرمەی کارکردنەدا، کاری مەزراکانیش دەستی پێکرد. نیوەی کرێکارانی باخەکە، باخەکەیان بەجێ هێشت.

یگورسیمیونوڤیچ کە تاوە سووت ببوو، قسەی لەگەڵ بەکردن نەدەهات. هەمیشە توڕە بوو. پێیەکی لە مەزرا بوو، پێیەکی لە باخەکە بوو، بەردەوام خوتەو بۆڵەی بوو: گیانم دەرچوو. بە هیلاک چووم کاروا بڕوات رۆژێ دێت خۆم بکوژم.

سەرباری ئەم هەموو کارە، بەزم و رەزمی جیازی کڕینی تانیاش لەولاوە بوەستێ کە بنەماڵەی پسوتسکی زۆر بەخەمییەوە بوون. لە لایەک جل بڕین بوو، لەلایەک خەیاتانی توڕەو تڕۆ. ئیدی کەس بەکەس نەبوو. میوانیش لەولاوە بوەستێ. خەڵکی ماڵەکە مەجبور بوون پێشوازی میوانان بکەن. شیرینی و شەربەتیان بۆ دابنەن و جێ و رێ بۆ مانەوەی شەویان دابین بکەن.

بەڵام وێڕای ئەو هەموو قەرەباڵغی و سەرقاڵییە، کارەکان بە خۆشی و شادی رادەپەڕێنران و کەس ئاگای لەماندوو بوون نەبوو. تانیا، هەستی دەکرد کە ئەشق و بەختەوەری لەپڕ لەدڵی دا شکۆفەی کردووە. هەرچەند لە چواردە ساڵییەوە دەیزانی کەیان بۆ کاورین دەبێ یان بۆ گڵ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر نیگەران و دوو دڵ بوو. هەندێ جار بەجۆرێ مەستی شادی و خۆشی دەبوو کە پێی وابوو دەبێ لە کەیفان بفڕێ و خۆی بگەیەنێتە ئامێزی هەوران و نوێژان دابەستێ. بەڵام کەبیری لەوە دەکردەوە دەبێ مانگی هەشت بە بووکی بڕوات و بابی و ئەم ماڵە بەجێ بێڵێ، ئەم ماڵەی کە هەموو تەمەنی خۆی تێدا گوزەراندووە، ترسێکی نامەفهومی لێ دەنیشت. خوا دەزانێ چەندین جار ئەم بیرەی بەسەردا دەهات کە ئەم لە پیاوێکی مەزنی وەکو کاورین بچوکترەو شایستەی ئەو نیە. کەئەم خەیاڵەی بەسەردا دەهات بە پەلە خۆی بەژوورەکەی خۆیدا دەکرد، دەرگاکەی لەسەرخۆی دادەخست و چەندین سەعات بەکوڵ دەگریا. لەنێو میوانەکاندا تەنیا کاورین-ی لەبەرچاو قۆزو جوان بوو. هەستی دەکرد هەموو ژنەکان بەغیلی پێ دەبەن. لەم ساتانەدا دڵی پڕ دەبوو لە غرورو شادی و وەکو ئەوە بوو هەموو جیهانی بۆ خۆی داگیر کردبێ. خۆ ئەگەر کاورین، زاتی کرد باو لەگەڵ ژنێکدا پێکەنیبا، ئەوا تانیا لە حەژمەتاندا دەلەرزی و بەپەلە دەچوە ژوورەکەی خۆی و دیسان دەستی بەگریان دەکرد! ئەم هەستانە باڵیان بەسەریا کێشابوو. وەکو مەکینە کاری دەکردو یارمەتی بابی دەدا، بەڵام لەهەمان کاتدا ئاگای نە لەکرم، نەلە کارەکەران، نە لە کرێکاران و نە تێ پەڕ بوونی وەخت

نەبوو.

باری دەروونی یگورسیمیونوڤیچ-ش وەکو تانیا بوو. ئەویش لەبەیانی یەوە تا شەو کاری دەکرد. لە باخەکەدا ئەم بەرو ئەو بەری بوو. تورە دەبو جنێوی دەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەون و خەیاڵێکی ئەفسوناوی باڵی بەسەریاکێشابوو، هەستت دەکرد قاڵبێکی توندو تۆڵەو دوو کەسی گوتۆتە خۆ. یەکێکیان یگورسیمیونوڤیچ-ی واقیعی بوو کە لەگەڵ باخەوانێکا قسەی دەکرد، کە گوێی لە قسەکانی ئیڤان کارلوڤیچ دەگرت لەمەڕ بێ زەبت و ڕەبتی باخەکە، دین دەبوو و قژی خۆی دەڕنی یەوە. ئەوی دیکە یگورسیمیونوڤیچ-ی ناواقیعی بوو. پیرەمێرێکی نیمچە مەست بوو. قسەی زۆر گرینگی دەبڕی. خۆی لەقسان هەڵدەقورتاند. یەخەی باخەوانەکەی دەگرت، ڕای دەتەکاندو دەیگوت:

– تۆ هەرچییەک دەڵێی، بیڵێ، بەڵام بەبێژنگ بەری هەتاو ناگیرێ. دایکی یەکێک بوو لەژنە هەرە نەجیب و زیرەکەکان. دەموچاوی هێندە پاک و نورانی بوو لەتۆوایە فریشتەیە. نیگارکێشی دەکرد. شیعری دەگوت پێنج زمانی دەزانی و گۆرانی دەگوت... بەستەزمانە، خوا عافوی بکات، تووشی سیل بوو و مرد.

ئەم یگورسیمیونوڤیچ-ە ناواقیعیە ئاهێکی هەڵدەکێشاو لەسەری دەڕۆیی... کە لەماڵی مندا بوو، ڕۆژ بەرۆژ هەڵی دەداو گەورە دەبوو. هەمان دەموچاوی نورانی فریشتە ئاسای دایکی هەبوو. تەماشا کردنەکەی، هەڵسوکەوت و ڕەفتاری، قسەنەرم و خۆشەکانی هەمووی لەدایکی دەچوو. جا زیرەکییەکەی بۆ ناڵێی! بەبەلاش پلەی مامۆستایی وەرنەگرتووە، بەڵام هێشتا لە کوێیەتی ئیڤان کارلوڤیچ، تۆ دە ساڵی دی بیبینە بزانە دەبێ بەچی! لەگەڵ ئێستایدا هەر بەراورد ناکرێ! کە دەگەییە ئێرە، هەڵوەستەیەکی دەکردو دەبوەوە بەیگورسیمیونوڤیچی واقیعی. قژی خۆی دەڕنییەوە، دەی نەڕاند: کەرانباوگاوانەی باوەحیزینە! بەستویەتی، وێران بوو. وێران بووە! باخەکە وێران بوو، باخەکەم فەوتا.

کاورین، بەهەمان شەوقی ئەشقی هەوڵەوەکاری دەکردو هەراو هەنگامەو بەزم و ڕەزمەکەی دەوروبەری کاریان تێنە دەکردو ساردیان نە دەکردەوە. ئەشق تاقە هاندەرو پشتیوانی بوو. پاش هەر ژوانێک لەگەڵ تانیادا بەخۆشی و شادی دەگەڕایەوە ژورەکەی و دەستی بە کار دەکردەوە. بەهەمان ئەشقەوە کە تانیای ماچکرد بوو و، سوێندی ئەشقی بۆ خواردبوو، کتێب و دەستنوسەکانی لە ئامێز دەگرتن و مژولیان دەبوو. قسەکانی ڕەبەنە ڕەشپۆشەکە دەربارەی: هەقیقەتی نەمر، ئایندەی پرشنگدارو



شکۆداری مرۆڤایەتی، دەربارەی ئەو کە بەندەی هەڵبژاردەیە- ناسکی و جوانییەکی تایبەتی و نائاسایی بەکارەکانی دەبەخشی هەفتەی جارێک یان دووجار ڕەبەنە ڕەشپۆشەکەی لە پارکەکەدا یان لەماڵەوە دەبینی و چەندین سەعات قسەی لەگەڵ دەکرد. بەڵام ئەم دیاردەیە نیگەرانی نەدەکرد، بەڵکو بەپێچەوانەوە شادو خوشحاڵی دەکرد، چونکە ئێستاکێ تەواو قەناعەتی کردبوو کە ئەم جۆرە تارماییانە تەنیا دێنە دیدەنی خەڵکانی هەڵبژاردەو هەڵکەوتوی ئەوتۆ کە خۆیان بەفیدای ئامانج و ئاواتەکانیان دەکەن.

جەژن و ئاهەنگی مارە بڕین بە سادەیی و ئاسانی تەواوبوو، بەڵام جەژنی زەماوەندەکە بەدڵی سازکرا. یەکێک بوو لەو جەژن و ئاهەنگە بێ مەعنایانەی کەدوو ڕۆژو دوو شەوان درێژەی کێشا. سێ هەزار ڕۆبل تەنیا مەسرەفی خواردن و خواردنەوە بوو، بەڵام لەبەر قەرەباڵغی و غەڵبەغەڵب و بەزم و ڕەزمی مۆسیقاو هەروا هەنگامەی چێشت لێنان و هاتووچۆی نۆکەران و ژنانی عەبابەسەرو هەراو هۆریاو سەغڵەتی و تەنگی جێگا، چ کەسێک ئاگای لە شەڕابی گرانبەهای عەسران نەبوو کە لەموسکۆوە هێنر**ابوو**.

## ۷

شەوێکی درێژی زستان، کاورین لەسەر تەختێک ڕاکشابوو، چیرۆکێکی بەزمانی فەرەنسی دەخوێندەوە، تانیای بەلەنگاز کە بەژیانی شارستانی ڕانەهاتبوو، هەموو شەوێک تووشی ژانەسەر دەبوو. ژمێژبوو نووستبوو و بەدەم خەوەوە وڕێنەی دەکرد.

سەعاتە چاڵمەکە سێ جاران لێ دا. کاورین، مۆمەکەی تەمراندو ویستی بنوێ. ماوەیەک چاوی نوقاندو هەر بەتەمای خەو بوو، بەڵام گەرمی ژورەکەو وڕێنەی تانیا، نەیان دەهێشت خەوی لێ بکەوێ. سەعاتی ژورەکەو وڕێنەی تانیا، نەیان دەهێشت خەوی لێ بکەوێ. سەعات چوارونیو مۆمەکەی هەڵایساندەوە. ڕەبەنە ڕەشپۆشەکە لە تەنیشتی یەوەو لەقەراخ تەختەکە دانیشتبوو. ڕەبەنەکە سڵاوی لێکردو پاش دەمێک بێدەنگی پرسی: ئێستا بیرت لەچی دەکردەوە؟

کاورین گوتی: بیرم لە شۆرەت دەکردەوە ئێستا خەریکی خوێندنەوەی چیرۆکێکی فەرەنسی بووم. قارەمانی چیرۆکەکە پیاوێکی گەنجەو گەلێک کاری گەوجانە

دەکات و ئاقیبەت بەداخ و سوێی شۆرەتەوە دەمرێ. ئەم کەڵکەڵەو ئارەزوە بەلای منەوە چ مەعنایەکی نیە.

– چونکە تۆ پیاوێکی ئاقڵی و شۆرەت بە گاڵتەی منداڵان نازانی تاکو سەرنجت رابکێشێ و بکەویە خولیایەوە. تۆ گوێ بە شۆرەت نادەی.

– وایە

– شۆرەت بەلای تۆوە شتێکی خۆش نیە. ئاخر پیاو چ خۆشی و لەزەتێک لەوە دەبینێ کە بزانێ دوای مردنی ناوی لەسەر گۆڕەکەی هەڵدەکەندرێ؟ لەکاتێک دا مەعلومە کە رۆژگار درەنگ یان زوو ئەو ناوەو هەموو نووسینەکانی دی دەسڕێتەوە. بەڵێ، خۆشبەختانە ناوی خۆت ئاسا زۆر زۆرەو هزرو بیری بەشەریش کورتە ناتوانێ یادی هەموو ناوەکان بکاتەوە.

کاورین گوتی: هەڵبەتە وایە. ئەمە جگە لەوەی کە سودی یادکردنەوە چیە؟ بەڵام با بێینە سەر باسێکی دی. بۆ نموونە باسی خۆشی. خۆشی چیە؟

کە سەعات پێنج لێی دا، کاورین لەسەر تەختەکەی خۆی دانیشتبوو، پێی بە مافورەکەی ژێر پێیدا دەخشاند. سەری بردبووە بناگوێی رەبەنە رەشپۆشەکەو دەیگوت: لەزەمانی کۆندا پیاوێک هەبووە کەخۆشی و شادی هەراسانی کردووە. خۆشی و شادی ئەو کابرایە لەرادە بەدەر بووە. جا بۆ ئەوەی غەزەبی خواوەندان لە خۆی دوور بخاتەوە، ئەنگوستیلەیەکی جوانی دەبێ کە زۆری لە دڵ شیرین دەبێت، دەیکات بەقوربانی بۆ خواوەندان. ئەم چیرۆکەت بیستووە؟ منیش ئێستاکێ وەکو «پولی کرات»* م لێ بەسەر هاتوەو لە کەیف و خۆشیاندا لەپێستی خۆم ناهێورم. لەبەیانی زوەوە تا شەوێ خۆشی دەجەرِبێنم. خۆشی باڵی بەسەر هەموو هەست و ئارەزوییەکی دیکەم دا کێشاوە. مەعنای خەم و رەنج و ماندوویەتی نازانم. راست و دۆغری گومانم لێ نیشتووە.

رەبەنەکە بەسەرسامی پرسی: بۆ؟ چی تۆ پێت وایە خۆشی و لەزەت هەستێکی میتافیزیکییە؟ پێت وایە ئەم هەستە رەنگدانەوەیەکی ئاسایی شتەکان نیە؟ تا

---

* پولی کرات: میری «ساموس» بوو. لەساڵی ٥٢٢ پ.ز چل دانە ساڵ بەو پەڕی شادی و خۆشییەوە ژیا. ئەم ژیانی پڕ لە شادییە بەجۆرێ خستبوویە دوو دڵی و گومانەوە کە ناجار بۆ بەلاوەگیرِی ئەنگوستیلەکەی کە زۆر ناشیرین بوو، فڕێ دایە دەریاوە، بەڵام ئەم قوربانییە قەبوڵ نەبوو. ماسییەک کە قووتی دا بوو، هاتبووە کەناری دەریاو ئەنگوستیلەکەی گەڕاند بووەوە بۆ خاوەنەکەی و ئەنجام ئەم پیاوە بەدەستی یەکێک لە سەردارانی داریوش لەسێدارە درا.



مرۆڤ لەباری فیکری و ئەخلاقی یەوە پتر پێش بکەوێ ئازادتر دەبێ و پتر لەژیان رازی دەبێ سوکرات، دیوجین، مارک ئورول هەموویان شادییان دەناسی و لەغەم بێ ئاگابوون و گوتەی یەکێک لە یاوەرانی مەسیحە: تا دەتوانی شادبە، شادی و خۆشی بکە. کاورین بە شۆخییەوە پێکەنی و گوتی: ئەو ساکە لەپڕ خواوەندان رقیان هەڵدەستێ و زەوقی من ئەمە پەسند ناکات کە خواوەندان بێن بەدزی خۆشی و شادی و مرۆڤ ناچار بکەن لەخەما بلەرزێ و لەبرسان بمرێ.

تانیا، خەبەری بووەوە، بەترس و سەرسامییەوە روانی یە شوەکەی. شوەکەی قسەی دەکرد. رووی دەکردە کورسییەکە. لە خۆڕا پێدەکەنی. چاوەکانی دەبریسکانەوەو پێکەنینەکەی دەنگێکی سەیری هەبوو. تانیا، دەستی شوەکەی گرت کە بەرەولای رەبەنەکە درێژی کرد بوو، گوتی: ئاندریوشا، لەگەڵ کێ قسە دەکەیت، ئاندریوشا ئەوە کێیە؟ کاورین وەڵامی دایەوە: چی کێیە؟ رەبەنەکەیە. ئەوەتا لەوێ دانیشتووە. ئاماژەی بۆ لای رەبەنە رەشپۆشەکە کرد.

– کەس لەوێ نیە، ئاندریوشا تۆ نەخۆشیت.

تانیا باوەشی بەمێردەکەیدا کردو هێند بەتوندی گوشی بەخۆیەوە لە تۆ وایە دەیەوێ لە تاپۆکە-ی بپارێزێ. دەستی خستەسەر چاوی مێردەکەی. ئازای گیانی هاتبووە لەرزین و هۆن هۆن دەگریا: **تۆ** نەخۆشیت ببورە ئازیزەکەم! ماوەیەکە هەستم دەکرد مێشکت بەرەو تێکچوون دەچێت... تۆ نەخۆشیت... تووشی نەخۆشی دەرونی بویت... ئاندریوشا.

کاورین-یش کەوتە لەرزین. جارێکی دی روانییە کورسییەکە، ئێستا کورسییەکە بەتاڵ بوو، هەستی کرد باسک و لاقی بێ تاقەت و سستن. دەستی کرد بەخۆگۆڕین. هێشتا هەر دەلەرزی. بەزمانی تێک ئاڵاوەوە دەیگوت: تانیا... چی نیە نە هەست. دەکەم کەمێک وەزعم ناتەواوە. ئیدی کاتی ئەوە هاتووە مشورێکی خۆم بخۆم و بزانم چ نەخۆشییەکە.

تانیا کە هەوڵی دەدا جڵەوی گریانەکەی بگرێ، گوتی: من ماوەیەکە هەستم بەمە کردووەو بابیشم هەستی پێکردووە. تۆ بەشێوەیەکی سەیر قسە لەگەڵ خۆت دەکەیت. لەخۆڕا پێدەکەنی و شەوانیش ناخەوی. خوایە، خوای گەورە فریامان بکەوە.

بەدەم کوڵی گریانەوە لەسەری رۆیی: بەڵام مەترسە، ئاندریوشا توخوا مەترسە. تانیاش خۆی گۆڕی... کاورین بەتەماشاکردنەکەی تانیادا بۆی دەرکەوت کە

حاڵی زۆر خراپەو گفتوگۆکردنی لەگەڵ ڕەبەنە ڕەشپۆشەکەدا نیشانەی ئەوەیە کە شێت بووە.

هەردووکیان خۆبەخۆ خۆیان گۆڕی و چوونە بەر داڵانەکە. یەکەمجار تانیاو پاشان کاورین چوو. یگورسیمیوڤیچ بەخۆ ڕۆبەکەیەوە لەوێندەر وێستابوو. یگورسیمیوڤیچ لەگەڵ ئەواندا دەژیاو لە گریانی تانیا بە خەبەر هاتبوو تانیا دەیگوت: مەترسە ئاندریوشا. ئەمەی دەگوت و خۆیشی وەکو نۆبەتای لێ هاتبێ لەترساندا هەڵدەلەرزی. لەسەری ڕۆیی: مەترسە بابە... ئەم ئاریشەیەش تەواو دەبێ.

کاورین وەها پەشۆکا بوو نەیدەتوانی قسان بکات، بەڵام هەوڵی دەداشتەکە بەهەند هەڵنەگرێ. ڕووی کردە خەزوری و ویستی بڵێ: پیرۆزباییم لێ بکەن. پێم وایە ئەقڵەکەم لەدەست داوە. بەڵام لێوەکانی بەئاستەم جوڵان و بزەیەکی تاڵیان کەوتە سەر.

سەعات نۆ جلەکانیان گۆڕی. پاڵتۆکەیان لەبەر کرد. چەرچەفێکیان پێدا داو بەعەرەبانە بۆ لای دکتۆریان بردو دەستیان بە زنجیرەیەک مالیجەکرد.

## ٨

هاوین بوو، دیسان کاورین لە سەردەستوری دکتۆر بۆ گوند گەڕایەوە. وەزعی تەواو باش ببوو ئیدی ڕەبەنە ڕەشپۆشەکەی نەدەبینی. تەنیا ئەوەندەی مابوو بەتەواوی ڕەنگ و ڕوو هەڵێنێ و لەباری بەدەنی یەوە ببوژێتەوە. لەماڵی خەزوری دەژیا. شیری زۆر دەخواردو ڕۆژی تەنیا دوو سەعات کاری دەکرد، دەمی بۆ مەشروب نەدەبردو جگەرەی تەرک کردبوو.

شەوی نۆزدەی مانگی حەوت، شەوێک بەر لەجەژنی «الیاه» کۆڕی نوێژو زیکرو دوعای ئێوارە لەماڵەوە سازدرا. هەرکە کەشیش بخوردەکانی هەڵایساندو داڵانەکە بۆن و بەرامەی کلێسای گرتەخۆ، کاورین تاقەتی چووەوە ڕۆیی بۆ نێو باخەکە بێ ئەوەی ئاوڕ لەو هەموو شکۆفە ناسک و جوانانەی دەوروبەری بداتەوە دەستی کرد بەپیاسە. تۆزێک لەسەر تەختێک دانیشت و ئەوجا هەستاو بەرەو باخە کۆنەکە نشێوبووەوە. بەکەنارە نشێوەکەدا هات و لە قەراخ چۆمەکە بەئارامی وێستاو نیگای پڕ پرسیاری بڕی یە چۆمەکە. دارکاژە زەلامەکان بەرەگ وریشاڵی تێک ئاڵاوەوە،



ئەو دارکاژانەی کە پار ئەویان بەو هەموو چالاکی و شادی و بە زەوقی یەوە دیتبووە وەکو منداڵی ساوا بەرویا دەگرژانەوە، ئێستا هەموو بێ جوڵەو بێ خشپە ڕاوەستا بوون و زەق زەق سەیریان دەکرد. پێدەچوو نەیناسنەوە.. بەڕاستیش لەچاو پاردا زۆر گۆڕابوو. بەو قژە کورتەیەوە، بەهەنگاوی خاوو سستی یەوە. بەدەموچاوی گۆڕاوی یەوە بەو بێ تاقەتی و بێ ڕەنگییەوە لەکەم شوێندا دەناسرایەوە.

لە چۆمەکە پەڕی یەوە، ئەو مەزرایەی پار کرابوو بە چاودار، ئێستا ببوو بە خەرمانجاڕی جۆ. بەریز خەرمانی جۆ قوتکرا بووەوە. هەتاو ئاوا ببوو. ئاسۆی سورباو پێدەچوو تۆف و بۆرانی پێ بێ. هەموو شتێک ئارام بوو. کاورین چاوی بڕییە ئەو شوێنەی کە پارەکە ڕەبەنە ڕەشپۆشەکەی تێدا بینی بوو. تا زەردەی خۆر بە تەواوی لە ئاسماندا وون نەبوو، چاوی لەو شوێنە نەگواستەوە. پەست و هیلاک و ماندوو بۆ ماڵ گەڕایەوە. یگورسیمیوڤیچ و تانیا لەسەر قاڵدرمەی بەر هەیوانەکە دانیشتبوون چایان دەخواردەوە. پێکەوە قسەیان دەکرد. بەڵام کە کاورین-یان بینی قسەکەیان بڕی. کاورین بە سیمایاندا زانی کەباسی ئەویان دەکرد. تانیا، بەشوەکەی گوت: وەرە شیرەکەت بخۆ، ئێستا وەختێتی.

کاورین لەسەر دوا پلەی قاڵدرمەکە دانیشت و گوتی: نا، هێشتا وەختی نیە، تۆ بخۆ من شیر ناخۆم.

تانیاو بابی تەمەشای یەکتریان کردو ئەوجا وەکو یەکێک خەتایەکی کردبێ گوتی: دەزانی شیر بۆ تۆ زۆر باشە!

کاورین پێکەنی و: بەڵێ، هەر زۆریش باشە! بامژدەشت بدەمێ کە لە ڕۆژی هەینی یەوە تائێستا یەک کیلۆ زیادم کردووە.

ئەوجا سەری خستە نێو دەستی و بەکەسەرەوە گوتی: ئاخر بۆ؟...

بۆ بردمە لای دکتۆر؟ ئیستراحەت کرن، بێکاری، حەمامی گەرم، پارێز، چاودێری کردنی هەر هەنگاوێکم، ئەم کارانە ئاقیبەت شێتم ئەکەن. ئیدی بێ تاقەت بووم. من شێت و ئاشقی گەورەیی بووم، هەر بەهۆی ئەم «گەورەیی»یەوە بوو کە چالاک، بەکەیف و دەماخ، شادو خۆشحاڵ بووم... من بابایەک بووم دیارو بەرچاوی، لە خەڵکانی ئاسایی نەدەچووم.. ئێستا بووم بەبونەوەرێکی وشک و ساردوسر، وەکو هەر بەنی ئادەمێکی ئاسایی ئەم دنیایە، ئێستا بووم بەکابرایەکی بێ تام و بازاڕی و من لەگەڵ ئەم جۆرە ژیانەدا هەڵناکەم.. ئاه چ زوڵمێکتان لێکردم کە بردمتانە لای دکتۆر! ڕاستە من دووچاری مۆتەکە ببووم، تاپۆو شەبەنگم

دەبینی، بەڵام ئەمە چ زیانێکی بەکەس دەگەیاند؟ ئیوە بڵێین چ زەرەرێکی بە کەس دەگەیاند؟!

یگورسیمیوڤیچ، ئاهێکی هەڵکێشا: مەگەر هەرخوا لە مەبەستت تێ بگات؟ تەنانەت گوێ گرتنیش لە تۆ کارێکی گەوجانەیە.

– پێویست ناکات گوێ بگری!

کاورین، زۆری پێ ناخۆش بوو کە یگورسیمیوڤیچ لەوێندەر بوو، زۆر بەساردی و وشکی و بێ ئەدەبیەوە وەڵامی خەزوری دەدایەوەو بەرقەوە سەیری دەکرد. یگورسیمیوڤیچ، نەیدەتوانی دان بەهەڵەی خۆیدا بنێ. وڕوکاس لێکدا لێکدا دەکۆکی. تانیا، بێ ئەوەی هۆی ئەم گۆڕانە کوتوپڕەی بابی و کاورین بزانێ، پاڵی دا بەبابی یەوەو بەترسەوە روانی یە چاوەکانی لای مەعلوم بوو کە پەیوەندی ئەوان و شوەکەی رۆژ بە رۆژ بەرەو خراتر دەچوو. بابی تەواو پیربببوو. شوەکەشی دڵی ناسک و دەم دەمی و توڕە ببوو، کوڕم دەویست لەگەڵیا هەڵبکات. تانیا مات و خەمگین نەپێدەکەنی، نەگۆرانی دەگوت، نە خواردن و خەویشی مابوو. هەمیشە لێو بەبارو بێ تاقەت و دڵگیراوبوو هێندە خەم و خەفەتی دەخوارد کەپاش نیوەراون وەکو جەنازە بێ هەست و خوست لێی دەکەوت. کە کۆڕی دوعاخوانی لەماڵەوە بەرپا دەکرا، دەیبینی کە بابی دەگری، ئێستا کە لەبەر هەیوانەکەدا دانیشتبوو هەوڵی دا ئەم خەیاڵانە لەخۆی بتارێنێ.

کاورین گوتی: بکە بوداو محەمەد و شەکسپیر خەڵکانی بەختەوەر بوونە. نەخزم و کەسوکارە دڵسۆزەکانیان و نە دکتۆرەکانیان هەوڵی چارەسەرکردنی ئیلهام و سروش و خورپەیانیان نەداوە. پزیشکان و کەسوکاری دڵسۆز هەوڵی ئەوە دەدەن کە تیرەی بەشەر بەرەو گەوجی و بێهۆشی بەرن. رۆژێ دێ کە گەوجی شوێنی بلیمەتی بگرێتەوەو مرۆڤایەتی لەنێو بچێ. ئەگەر ئێوە یەک تۆز ئەقڵتان هەبوایە، تاقە تۆزقاڵێک مێشکتان هەبوایە، من زۆر زۆر مەمنون دەبووم.

لێرەدا بەخەم و ئارازەوە قسەکانی تەواوکرد. هەستی بەئازارێکی زۆرکرد، بۆ ئەوەی خۆی لە هەرزەوێژی بپارێزێ، هەستاو چووە ژوورەوە شەوێکی کپ و خامۆش بوو، هالاوی دەم با نەیدەبرد. لە پەنجەرەکەوە بۆنی توتن دەهات. تریفەی مانگ دابوی لەناو ژورەکەو زەوییەکەو پیانۆکەی روناک کرد بوەوە. کاورین، خۆشیەکانی پار هاوینی بیرکەوتەوە. کە ئەوساش وەکو هەنوکە دنیا پڕ ببوو لەبۆنی گیاوو تریفەی مانگ لە پەنجەرەکانەوە رژابووە ژورێ... بۆ ئەوەی ئەو وەزع و حاڵەی پار



لەخۆیدا بێدار بکاتەوە، چووە ژورەکەی خۆی، جگەرەیەکی یەکجار تیژو کەسکونی پێکردو بەخزمەتکارەکەی گوت کە شەرابی بۆ بێنێ، بەڵام جگەرەکە لە دەمیدا تاڵ و ناخۆش بوو. شەرابەکەشی ئەو نەشئەو خەیاڵەی پاری نەدایێ. ئاخر شت تەر کردن مەعنای چیە؟! بە جگەرەیەک و دووفڕ شەراب سەری کەوتەسوڕان و ناچاربوو حەب بخوات پێش ئەوەی بچێتە ناو جێگاکەیەوە، تانیا پێی گوت: ئاندریوشا، بابم تۆی خۆش دەوێ و زۆری خاترت دەوێ، بەڵام لەسەر شتی هیچ و پوچ تێکی دەدەیت و دەتۆرێی. بابم ئەمەی پێ ناخۆشە، تۆ دیقەتی دەموچاوی بدە رۆژبەرۆژو سەعات بە سەعات پیرتر دەبێ. ئاندریوشا تکات لێدەکەم، بیکە بەخاتری مەسیح، تو گۆڕی بابت، لەبەر خاتری من، لەگەڵ بابمدا ئاشت بەرەوە.

– ناتوانم.

– بۆ؟ ئاخر تێم بگەیەنە بۆ؟

تانیا، هەموو گیانی کەوتە لەرزین.

– چونکە حەزم لەچارەی نیەو تەواو.

کاورین، ئەمەی بەبێ موبالاتییەوە گوت و شانەکانی هەڵتەکاند و لەسەری رۆیی: چاکتر وایە قسەی لێ نەکەین و هەرچی یەک بێ بابی تۆیە.

– ئاخر من تێ ناگەم ئەمە بۆ..

تانیا، دەستەکانی بۆ نێوچەوانی برد. نێوچەوانی گوشی و چاوی بڕیە خاڵێک و گوتی: لەم ماڵەدا شتێکی سامناک، شتێکی نامەعقول رووی داوە. ئاندریوشا تۆ گۆڕاوی و ئاندریوشاکەی جاران نیت. تۆ کە کابرایەکی زیرەک و هەڵبژاردەی، زوو لەسەر شتی بێ بایەخ دەڕەنجێی و دڵت دەشکێ هەندێ جار لەسەر شتی ئەوەندە هیچ و پوچ توڕە دەبی کە ئەگەر لە کاتێکی دیدا بێ بەخۆیشت باوەڕ ناکەیت. نا توڕە مەبە.. توڕە مەبە.

دەستەکانی کاورین–ی ماچکردو لە سەری رۆیی: تۆ پیاوێکی هوشیارو باش و شەریفی. غەدر لەبابم ناکەیت.. بابم ئەوەندە باشە کە...

– نەخێر باش نیە، رواڵەت بازییە، بەڵام خۆی باش دەنوێنێ. ئەم پیرانەی کە لە نمایشنامەی سەتیردا بەشداری دەکەن، ئەم خەڵکانەی کە وەکو بابتن، ئەم خەڵکانەی تێرن و دەزانن چۆن چارەیان دەگۆڕن و زوو دەمولچیان دەدەن بەیەک دا، کەسانێکی تایبەتین کە ماوەیەکی زۆر پێیانەوە مژول بووم. لە ئەفسانەدا، لەنمایشی سەتیرداو تەنانەت لەژیانی واقیعیش دا سەرنجیان راکێشام، بەڵام ئێستا لێیان بێزارم.

ئەوانە خەڵکانێکی تا بڵێی خۆ پەرستن.. هەمـوو رواڵەت بازو نەوسن و ورگ پەروەرن.

تانیا، لەسەر تەختەکە دانیشت و پشتی دا بە پشتی یەکەوەو گوتی:

– ئەم قسانە بنیادم دەکوژێ.. بەدەنگی دا دیاربوو کە زۆر ماندووەو بەتۆبزی قسان دەکات. گوتی: لە زستانی پارەوە تاکو ئێستا دەقەیەک ئیسراحەتم نەبووە. چی بکەم خودایە...

– بەڵێ، هەڵبەتە بەندە خەتابارم و بابی بەرێزت لە منداڵی ساوا بێ گوناحترە!

دەموچاوی لەبەرچاوی تانیا ناشیرین و بێ تام بوو. تانیا هەستی کرد کە دەموچاوی تێکچووە. لەو ساوە کەڤژی تاشی بوو دەموچاوی گۆڕابوو. تانیا پڕ بەدڵ حەزی دەکرد جنێوبارانی بکات، بەڵام باش بوو جڵەوی خۆی گرت و بەدەم خەم و پەژارەو ترسەوە ژووری نوستنەکەی بەجێ هێشت.

## ٩

کاورین. کورسییەکی مامۆستایی بەدەست هێنا. دەبوو لە ٢ دیسەمبرا یەکەم موحازەرە بڵێـتەوە. هەر بۆ ئەم مەبەستە راگەیاندنێک بە رارەوەکانی زانستگەدا هەڵواسرابوو، بەڵام لە رۆژی دووی مانگ دا کاورین، بروسکەیەکی بۆ بەرپرسانی زانستگە ناردو داوای لێبوردنی کرد کە لەبەر نەخۆشی ناتوانێ موحازەرەکان بڵێتەوە.

خوێنی هەڵدەهێنا. کەتفی دەکرد. تفەکەی هەر خوێن بوو. لە ماوەی مانگێک دا دووجاران خوێنی هەڵێنا. هەستی دەکرد بەرەبەرە لاوازو بێ تاقەت دەبێ و زۆر جاریش دەبورایەوە لەو نەخۆشیە نەدەترسا، چونکە دەیزانی دایکی مەرحومیشی هەمان نەخۆشی بووەو زیاد لە ١٠ ساڵ بەم نەخۆشییەوە ژیاوە. پزیشکانیش دەیانگوت وەزعی خەتەر نیە. تەنیا ئامۆژگاری ئەوەیان دەکرد کە هەڵنەچێ و تورە نەبێ و کەم قسان بکات و تادەتوانێ هێمن و لەسەرخۆ بێ.

مانگی یەک-یش لەبەر هەمان نەخۆشی موحازەرەکەی دواخست و مانگی دوو، ئیدی درەنگ بوو بۆ موحازەرەکە. بۆیە موحازەرەکەی خرایە ساڵی ئایندە.

ئێستا لەگەڵ تانیادا نەدەژیا. لەگەڵ ژنێکی دیکە زۆر لەخۆی گەورەتر دەژیا. ئەم ژنە وەکو منداڵ سەرپەرشتی دەکردو ئاگاداری دەکرد. کاورین تەواو هێمن و ئارام



ببوو، تەواو هاتبووەوە سەر رێگە. وەختی ئەم ژنە «ڤارڤارانیکو لایوڤنا» پێشنیازی کرد کە بیبات بۆ قرم، کاورین قایل بوو، هەرچەندە خۆی دەیزانی کە گۆڕینی ئاوو هەواش دادی نادات و چاک نابێتەوە.

درەنگە شەوێک گەیشتنە سباستپول و لەوێ لایاندا ئیسراحەتێ بکەن و سبەی بەرەو یالتا بڕۆن ڤارڤارانیکولا یوڤنا چای خواردوو چوو بخەوێ، بەڵام کاورین نەخەوت، سەعاتێک بەر لەوەی لەماڵ بێنە دەرێ و بچن بۆ وێستگەی قیتار، نامەیەکی لە تانیاوە پێ گەیی بوو، و ئەم نامەیەی نەخوێندبووەوە. ئەم کاغەزە تەواوناڕەحەت و نیگەرانی کردبوو. زۆر چاکی دەزانی کە خواستنی تانیا کارێکی هەڵە بووەو ئەو چاتر کە لێکدی جیابوونەوە، بەڵام بیرکەوتنەوەی ئەم ژنە، ئەم ژنەی کە لەم ئاخرو ئۆخریەدابوو بوو بە مۆمیایەکی زیندوی پڕ جموجوڵ، ئەم ژنەی کە تەنیا چاوە درشت و زیتەڵەکانی بەزیندوێتی مابوون، یادکردنەوەی ئەم ژنە داخ و بەزەیی لە دڵی دا دەوروژاندو رقی لەخۆی دەبووەوە، ئەدرەسی سەر زەرفەکە دوا دوو ساڵی ژیانی لەگەڵ تانیادا، بیرهێنایەوە. ئەو دوو ساڵەی کە هەمیشە بەبێ ویژدانی و ستەم تاوانباریان دەکردو ئەویش تۆڵەی تەنیایی خۆی و بێزاری و وەڕەزی خۆی لە ژیان، لە کەسانێک دەکردەوە کە چ گوناحێکیان لەم رووەوە نەبوو. زۆر بەبێ ئینسافی تۆڵەی لێ دەسەندن.. بیری کەوتەوە کە چۆن جارێک دەستنوسەکەی پارچە پارچە کردبوو و هەموو ئەو گوتارانەی کە دوای نەخۆشییەکەی نوسی بوونی دڕی بوونی. بیری کەوتەوە کە ورتکە کاغەزەکانی لە پەنجەرەکەوە توڕدابوونە دەرێ و پارچە کاغەزەکان بەدەم باکەوە کەوتبوونە سەماو لەسەر درەخت و گوڵەکان گیر سابوونەوە، لەهەرلاپەڕەیەکدا راوبۆچوونی بێ سەرو بەرو سەیرو سەمەرەی تۆمار کردبوو، لە هەموو نووسینەکانی دا رەنجی بێهودەو شەیدایی لە پێناوی «گەورەیی» دا بەدی کرد، هەر هەموو ئەم شتانە گەیاندیانە ئەو قەناعەتەی کە ئەوەی ئەو نووسیویەتی گەرچی خەتاو هەڵەکانی خۆی بووەو نووسینەکانی رەنگدانەوەی شەخسیەتە نەخۆشەکەی بوە، بەڵام کاتێ کە دوا نووسینی خۆی دڕی و لەپەنجەرەکەوە توڕی دا، هەستی بە ناڕەحەتی و نیگەرانی کرد، لەداخاچووە گیان ژنەکەی و بێ ویژدانانە کەوتە دواندنی. خوایە چۆن ژیانی ئەم ژنەی شێواندبوو!

بیری کەوتەوە کە چۆن جارێک بۆ ئەوەی دڵی تانیا بە ناهەق بشکێنێ، پێی گوتبوو کە بابی تانیا لە زەماوەندی ئەواندا دەورێکی نا ئاسایی گێڕاوەو تەنانەت بابی لەو پاڕاوەتەوە کە کیژەکەی بخوازێ. یگورسیمپونوفچ کە بە رێکەوت ئەم قسەیەی

بیستبووەوەو خۆی بە ژورا کردبوو. هێند سەرسام بوو بوو کە نەیتوانی بوو تاقە قسەیەک بکات. تەنیا ئەوەندەی پێ کرابوو کە بەتوندی پێی بەعاردی دا دابوو و هاوارێکی ئەوتۆی کردبوو لە تۆ وایە زمانیان لەبنەوە بڕی بوو. تانیا حەپەساوو داماو روانی بویە بابی و بەدەنگێکی دڵتەزێن گریا بوو و بێ جوڵە لەسەر عاردی کەوتبوو.

دەست خەتی سەر زەرفەکە هەموو ئەم بیرەوەریانەی لە هزرو بیری دا بێدار کردبوەوە. چووە باڵکۆنەکە دنیا گەرم و بێدەنگ بوو. بۆنی شۆراوک لەدەریاوە دەهات. تریفەی مانگ و تیشکی گڵوپەکانی کەناری دەریاکە لە ئاوەکەدا عەکس بوو بووەوە. ئاوەکە رەنگێکی سەیری هەبوو. لەهەندێ شوێن شینێکی تێری ئاماڵ سەوز بوو. لە هەندێ شوێنی دی لە زاخی سەوز دەچوو. لە هەندێ شوێنی دی لە تۆ وایە تریفەی مانگەشەوە. ئەم رەنگانە سام و تام و شکۆیەکی بێ وێنەیان دەنواند.

دیاربوو لە نهۆمی خوارەوەی ئوتوتێلەکەو لە بن باڵکۆنەکەدا، پەنجەرەکانیان کردۆتەوە، چونکە بە ئاشکرا دەنگی ژنان و حیلکەی پێکەنینیان دەهات. دیاربوو لە خوارەوە کۆڕی میوانداری گەرم بوو. کاروین، ئاقیبەت بەسەر خۆیدا زاڵ بوو، کاغەزەکەی کردەوە گەڕایەوە ژورەکەی خۆی و دەستی بەخوێندنەوەی کرد: «بابم ئێستاکێ مرد، هەڵبەتە مردنەکەی لەچاوی تۆ دەزانم، چونکە تۆ کوشتت. باخەکەمان بەرەو وێران بوون دەچێ. کەوتۆتە دەستی بێگانان. ئەوەی بابم لێی دەترسا، ئاخری روویدا دیارە ئەمەشیان هەر لەچاوی تۆ دەزانم. پڕ بەدڵ رقم لێتە. ئاواتەخوازی مەرگتم! ئاخ کە گەلەک کەسەردارم! کە دەردی دڵم گرانە دەک خێر لەخۆ نەبینی و بەر نەفرەتی خوا بکەوی! من تۆم وەکو پیاوێکی هەڵبژاردەو بلیمەت پەسندکرد، کەچی شێت و دێوانە دەرچوویت...».

کاروین نەیتوانی لەوەی پتر بخوێنێتەوە. کاغەزەکەی دڕی و پارچەکانی تورڕدا. پەشێوی و نیگەرانی باڵی بەسەریدا کێشا. ترسی لێ نیشتبوو. ڤار ڤارانیکولا یوڤنا، لە پشت پەردەکەوە نوستبوو. کاورین گوێی لە دەنگی هەناسەدانی دەبوو. لە نهۆمی خوارەوە دەنگی قاقای ژنان دەهات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاروین هەستی کرد کە غەیرەز خۆی چ زی رۆحێ لەو ناوە نییە. ناوەڕۆکی نامەکەی تانیا تەواو برینداری کردو بەترسەوە چاوی بڕییە دەرگا کە. دەتگوت لەوە دەترسێت کە نە با ئەو هێزە نادیارەی کە دوو ساڵی تەمەنی بەفیرۆداو خۆشەویسترین کەسانیشی وێران کرد، بگەڕێتەوە.



بەتەجرەبە بۆی دەرکەوتبوو کە کاتێک ئەعساب دەوروژێ، باشترین رێگەی هێورکردەنەی، کارکردنە. کاروین، لەکاتی وەهادا لەپشتی مێزەکەی دادەنیشت و بیری لە شتێکی تایبەت دەکردەوە. دەفتەرچەیەکی لە جانتا سورەکەی دەرهێنا کە سەرە قەڵەمی پرۆژەی کتێبێکی بچوکی تێداتۆمار کردبوو، و بەتەمابوو لە ماوەی مانەوەی لە قرم ئەگەر دەستی گەیی و پەرژا تەواوی بکات. لە پشت مێزەکە دانیشت و کەوتە بیرکردنەوە لەم پرۆژەیەو هەستی کرد بچوکترین وئاسایی ترین بەرژەوەندی ژیان، یەکجار زۆر لەسەر بەشەر دەکەوێ. پاش چل ساڵ ژیان و لاف و گەزافی زانست و زانایی، تازە بە تازە کورسییەکی مامۆستایی بەدەست هێنابوو، ئەوجاش مامۆستایەکی ئاسایی. تەفسیرکردنی فیکری ئاسایی ئەوجاش خۆزگە تەفسیری فیکری خۆیبوایە، نەک تەفسیری فیکری خەڵکانی دی. بریا تەفسیرێک با بەزمانێکی سووک، نەک بەزمانێکی قورس و تاقەتبەر، یانی بەکورتی وەدەست هێنانی پلەیەکی هاکەزایی.. ئەوجاش ئەمە چەند لەسەری کەوتبێ! ١٥ ساڵی رەبەق دەرسی خوێند بوو. لەژن هێنانا تێکەوتبوو. ماڵی خۆی و نزیکترین کەسوکاری خۆی وێران کردبوو لە بری هەموو پاداشتێک تۆمەتی شێتی و بێ ویژدانی و... درابووە پاڵ. ئاخ، ئێستا کێ بەتەواوی هەستی دەکرد کە پیاوێکی مام ناوەندی و رۆژ رەشەو بەو پەڕی قەناعەتەوە دانی بەم حەقیقەتەدا نا، چونکە دەیزانی دەبێ هەموو کەسێک وەکو چۆن هەیە ئاوا خۆی بدینێ و قاییلیش بێ.

پرۆژەی کتێبەکە، هێوری کردەوە، بەڵام پارچەی کاغەزە دڕاوەکەی تانیا کە لەو ناوە کەوتبوو، بیرو حەواسیان پەرت دەکرد. هەستایە سەر پێ، پارچە کاغەزەکانی کۆ کردەوە. لە پەنجەرەکەوە فڕێی دانە دەرێ، بەڵام شنەبایەک لە دەریاوە هەڵیکردو پارچە کاغەزەکانی گەڕانەوە بەر پەنجەرەکەو دیسان نیگەرانییەکی ترسامێز باڵی بەسەریدا کێشاو وای هەست کرد کە جگە لەخۆی چ کەسێک لە ئوتێلەکەدا نی‌یە.. چووە بالکۆنەکە. دەریا وەکو گیانلەبەرێکی زیندوو، بە هەزاران چاو، چاوی رۆشن، چاوی شینی تێر، چاوی پیرۆزەیی و چاوی ئاگرین تەماشای ئەوی دەکرد. ئیشارەتی بۆی دەکرد. دنیا گەرم و تاقەتبەر بوو، هەستی کرد ئێستا مەلە خۆشە! لەپڕ لەژێر پەنجەرەکەوە دەنگی کەمانچەیەک بەرز بووەوەو دوو ژن هەڵیانکردە گۆرانی. ئەم ئاوازو گۆرانی‌یەی دەناسییەوە. گۆرانی‌یەکە باسی کیژێکی گەنجی دەکرد:

«کیژێ کە نەخۆشی خەیاڵی بوو، کیژێ کە شەوێکی درەنگ لە باخێکدا، دەنگانی نهێنی ئامێزی ژنەوت و ئەم دەنگانە هێندە سازگارو گونجاوو کاریگەرو

سوفیانە بوو کە ئێمەی بەشەری فانی هەرگیز لێی تێناگەین.» کاروین، هەستی ڕاگرت، دڵی دایێ و ئەو خورپە پڕ ڕازو لەنکاوەی کە ماوەیەک بوو لەبیری چوو بوو، دووبارە ئازای گیانی هێنایەوە لەرزین.

لوولەیەکی بەرزو ڕەشی وەکو گەردەلول، یان وەکو شەپۆلی دەریای سەرهەڵگرتوو لەکەنارەکەی ئەو بەرەوە هەستا. بەخێراییەکی لە ڕادە بەدەر دەریاکەی بەیەکاداو بەرەو ئوتێلەکە هات. بچوک و بچوکتر بووەوە. کاروین. وەلاکەوت تا ڕێگای بدات. ڕەبەنەکە، بە قژی بۆز. بەسەری کۆت. بەبرۆی چڕی ڕەشی ڕەشەوە، بە پێی پەتی و بە بازوانی تێک ئالاوی عەینی خاچەوە، بەتەنیشتی دا ڕەت بوو و لەناوەندی ژوورەکەدا وەستا.

نیگایەکی پڕ نەوازشی کاروین-ی کردو بەدەنگێکی خەمبار گوتی:

- بۆ باوەڕت بەقسەکانی من نەکرد؟ ئەوسا من پێم گوتیت تۆ بلیمەت و هەڵکەوتویت، ئەگەر باوەڕت پێم کردبا ئەم دوو ساڵەی تەمەنت بەمجۆرە خەمناک و بێ بەر نەدەڕۆیی.

کاروین، دیسان هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە هەڵبژاردەی خوایەو بلیمەتە. هەموو قسەکانی کابرای ڕەبەنی وەبیر خۆی هێنایەوەو پڕ بەدڵ حەزی دەکرد بتوانێ وەڵامی بداتەوە، بەڵام خوێن وەکو بەلوعە لە گەرویەوە هاتە خوارێ و بەسەر سینگ و بەرۆکیدا ڕژاو بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ چ دەکات دەستی بۆ سینگی بردو هەردوو دەستی لە خوێنا سووربوون، ویستی ڤارڤارانیکولا پوڤنا گاز بکات. ڤارا ڤارانیکولا پوڤنا لەپشت پەردەکەوە خەوتبوو. ویستی ئەو گاز بکات. پڕ بەزاری هاواری کرد:

- تانیا!

کەوتە سەر زەوی دەستەکانی هەڵبڕین و دیسان هاواری کرد؟

- تانیا!

تا هێزی تێدا بوو، هاواری بۆ تانیا کرد. هاواری بۆ گوڵەکان برد هاواری کردە، باخە کۆنەکە. هاواری کاژە ڕەگو ریشاڵ تێک ئالاوەکانی کرد. لێیان پاڕایەوە. هاواری مەزاری چاوداری کرد. هاواری بۆ زانست و زانایی خۆی برد. هاواری کردە ئازایەتی خۆی. خۆشی و شادی لەدەست چوی، ژیانی جوان و دڵگیری. هاواری کردە هەر هەموو ئەوانە.

ئەستێلێکی گەورەی خوێنی لەبەردەم خۆیدا بینی. لەبەر بێ تاقەتی و بێ



توانایی نەیتوانی تاقە قسەیەک بکات، بەڵام خۆشییەکی لە وەسف نەهاتوو، خۆشیەکی بێ سنور، ئازای گیانی داگیرکرد. لەژێر بالکۆنەکەوە ئاوازەکە هەر بەردەوام دەهاتە گوێ و ڕەبەنە ڕەشپۆشەکە بەگوێی دا دەچپاند کە بلیمەت بووەو چونکە بەدەنی فانی و لاوازی هاوسەنگی خۆی لەدەست داوە، دەمرێ و هەر وەها گوتی کە ئەم بەدەنە لەوەی پتر ناتوانێ ئەم چەشنە بلیمەتی‌یە لە ئامێز بگرێ.

کاتێ ڤار ڤارانیکولا پوڤنا، لە خەوا ڕابوو، و لەپشت پەردەکەوە وەدەرکەوت، کاروین مردبوو، بەڵام بزەیەکی لە سڕینەوە نەهاتووی پڕ لە لەزەت و خۆشی نیشتبووە سەر سیمای...

# هاملێتی مۆسکۆیی

بەندە هاملێتی مۆسکۆییم. بەڵێ. دەچمە هەرشوێنێ، ماڵان، موغازەو پیشانگایان، هوتێلان، بڵاوەخانەی چاپەمەنیان و هەرشوێنێکی دی، ئەم قسەیە دەڵێم و دەڵێمەوە: «ئەمە چ حاڵێکە خودایە. بەڕاستی مایەی نارەحەتی و بێزارییە. مرۆڤ تاقەتی لە هەموو شتێک دەچێت؟». خەڵکیش ئەم وەڵامە دەدەنەوە:

«ئەشەدو وایە. مایەی نارەحەتی و بێزارییە!».

ئیدی ئەمە بووە بەپیشەی شەو و ڕۆژم. کە شەوان دەگەڕێمەوە ماڵێ تاریک و نوتەک و هەر بەو تاریکییە لەسەر جێگاکەم رادەکشێم، لەخۆ دەپرسم: «ئەرێ من بۆ هێندە بێتاقەت و بێزارم؟» هەست بەژاوەژاوێکی تایبەتی دەکەم و ئەوەم بیردەکەوێتەوە کە هەفتەی پێشوو لە یەکێک لە ماڵەکاندا پرسیم: «نازانم، چ هەشێک بەسەری خۆدا بکەم. تا لەم بێزارییە رزگار بم؟ پیاوێکی نەناس، کە پێنەدەچوو خەڵکی مۆسکۆ بێ، لەپڕ رووی کردمێ و بەدڵتەنگییەوە گوتی: «جا لەوە ئاسانتر هەیە. پارچە وایەرێکی تەلەفۆن پەیدا بکەو هەر کە گەیشتییە یەکەم عامودی تەلەفۆن لە مل خۆتی بکەو خۆت لەسێدارە بدە، ئەمە تاقە رێگاو تاقە چارەتە!» بەڵێ، بەدرێژایی شەو بیردەکەمەوە.

وام دێت بەخەیاڵدا کە خەریکە هۆی ئەم نارەحەتی و بێزاریەم بدۆزمەوە، بۆ، بۆ؟ لام وایە هۆکەی ئەمە بێ....ئەگەر لە هەوەڵییەوە دەست پێبکەم هیچ شتێک نازانم. چەند ساڵێکی مەکتەبم خوێندووە، بەڵام بێفایدەیە! لەوەیە هۆی بێزارییەکەم ئەمە بێ کە ئەو زانیاریانەی هەمن بێفایدەن و بەکەڵکم نایەن! ئاخر خۆ من نامەوێ هەموو ساتێک ئەمەریکایەک کەشف بکەم. بۆ وێنە هەر کاتێ پێم دەڵێن کە مۆسکۆ پێویستی بە زێرابێکی چاک هەیە یان کە دەڵێن تۆوی کێوی نارۆێ و بەر ناگرێ، بەسەرسامی دەپرسم: «بەراست؟!».

لەوەتەی هاتومەتە دنیاوە، هەر لەمۆسکۆدا ژیاوم، بەڵام خوا عالیمە من ریشەو



ئەسڵی مۆسکۆ نازانم. بوونی، فایدەی، پێویستییەکانی چییەو چی نیە، نایزانم و سەری لێدەرناکەم. لە ئەنجومەنی شارا دەربارەی بەڕێوەبردنی شار لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەندا قسان دەکەم، بەڵام نازانم رووبەری مۆسکۆ چەندە. ئاماری خەڵکەکەی چەندە. ژمارەی مردوان و لەدایکبووانی چەندن. دەرامەت و سەرفیاتی شار چییەو چۆنە. بازرگانیمان لەگەڵ کێ هەیە؟ مۆسکۆ دەوڵەمەندترە یان لەندەن؟ ئەگەر مۆسکۆ دەوڵەمەندترە هۆیەکەی چییە؟ مەگەر هەر خوا بیزانێ! کاتێ لە ئەنجومەندا باسی بابەتێک دەکرێت، من خۆم سەغڵەت دەکەم و بەر لە هەموو کەسێک هاوار دەکەم:

«پێویستە ئەم بابەتە بە کۆمیتەیەکی تایبەتی بسپێردرێ! ئا، بەکۆمیتەیەکی تایبەتی!».

ناوە ناوە بەگوێی بازرگانەکاندا دەچپێنم کە ئێستا وەختێتی روسیا پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ چین و ئێراندا ببەستێ. کەچی ناشزانم چین و ئێران کەوتونە کێوە؟ ئایا ئەم دوو وڵاتە جگە لە ئاوریشمی خاوی کرمخواردووی شێدار، شتی دیکەشیان هەیە؟ لەبەیانییەوە تا ئێوارێ لە چاخانەی «تیستف»دا چەنەبازی دەکەم و نازانم بۆ ئەم چەنەبازییە دەکەم و چ دەڵێم. هەندێ جار لە نمایشێک دا، دەورێک وەردەگرم، بەڵام نازانم نمایشەکە چی یە؟ دەچمە ئۆپرا تا گوێم لە «داپیرە پیک» بێ، کەچی کاتێ پەردە لادەبرێ هەنگینێ بیرم دەکەوێتەوە کە ئەم چیرۆکە بەنێویانگەی پۆشکین-م نەخوێندوەتەوە، یان ئەگەر خوێندبێتمەوەش لەبیرم چوەتەوە.

نمایشنامەیەک ئامادە دەکەم و دەیخەمە سەر شانۆ، کە نمایشەکەم دووچاری بێ بازاڕی دەبێت و بەساردی پێشوازی لێدەکرێ ئەوجا تێدەگەم کە وێنەی نمایشنامەکەی من پێشتر لەلایەن «و.ئالکساندروف»ەوە نووسراوەو پێش ئەویش لەلایەن «فدوتف» و پێش «فدوتف»ش «ئەسفازیتسکی» عەینی نمایشنامەکەی منیان نووسیوە! من ناتوانم قسە بکەم، یان باسێک بکەمەوە یان سەرە باسێک بگەینمە کۆتایی. کە چەند کەسێک دەکەونە باسو گفتوگۆ لەسەر بابەتێک کە من چ زانیارییەکم دەربارەی نییە، خێرا دەکەومە قسە هاوێشتن، رووی خۆم گرژ دەکەم و خەم لەخۆ دێنم. دانم لێکدی دەسووم. یەخەی بەرانبەرەکەم دەگرم و دەڵێم: «برای ئازیز! ئەم بابەتە کۆن بوەو باوی نەماوە!» یان دەڵێم: «کاکی خۆم تۆ قسەی بێ سەرو بەر دەکەیت. لەدەرفەتێکی تردا دێینەوە سەر ئەم بابەتە ناسک و حەساسە و قەناعەت بەیەکدی دەکەین، بەڵام توخوا پێم بڵێ بزانم تۆ «یوگمن»ت دیوە؟..»

ئەمە بابەتێکە کە رەخنەگرانی مۆسکۆیی زۆریان لەسەر گوتووەو دەتوانم پیشانتی بدەم!. کاتێ کە دەچمە کۆڕی باسی نمایشنامەی هاوچەرخەوە وا دەزانم گوێزم بۆ دەژمێرن، بەڵام خۆم لە گورە نابەم و بۆ وەڵام دانامێنم. ئەگەر یەکێک رام بپرسێت خێرا وەڵامی دەدەمەوە!» کوڕینە من چ ناڵێم. بەڵام پێم بڵێن نێوەرۆکی مەبەستەکە لە کوێیە؟ فیکرو مەبەستی نوسەر چییە؟» یان پاش ئەوەی هەناسەیەک هەڵدەکێشم، دەڵێم: «مولیری نەمر لەکوێی، گۆڕ هەڵتەکێنە؟» و بە خەمبارییەوە دەست دەدەم بەیەکداو بۆ رۆژێکی دی دەچم.

شانۆنامەنووسێکی داماو هەیە بەنێوی «لوپ دو-ڤگا» وابزانم دانیمارکییە، ئەوم کردووە بەداردەستی خۆم و دەمی گوێگرەکانمی پێ دادەخەم. دەم وە پەنا گوێی ئەو کەسەی تەنیشتمەوە دەنێم و بەچپە دەڵێم: « هەر بەینی خۆمان بێ «کالدرون» ئەم رستەیەی لە «کوپ دو-ڤگا» دزیوە..» ئەوانیش بێ چەندو چۆن باوەڕ دەکەن؛ باشە تەقوو هات بەسەریانداو بچن تاقیب بکەن!

وێڕای هەموو نەزانی و جەهالەتێکم، تەربیەتیش نەدراوم. راستە بەگوێرەی مۆد جلوبەرگ لەبەردەکەم. لە دەلاکخانەی «تیودور» سەر دەتاشم. رواڵەتی ماڵەکەم جوانە، بەڵام هێشتا هەر ئاساییم و زمانم نەگۆڕاوە.

سەر مێزەکەم، دایمە پڕە لە کاری نەکراو و نیوەچڵ، مێزەکە بەخۆی چوار سەد رۆبڵ دێنێ. پەردەکانم هەموو بەجێی خۆی، بەڵام کونی سۆپاکەم بەکراسی ژنێک گرتووە، لەهەموو ماڵەکەمدا قاپێکی خاوێن بەچنگ ناکەوێ. هاوڕێکانیشم لەخۆم باشتر نین! لەلای قاڵدرمەکانەوە بۆنی گۆشتی سورەوکراو دێت. سەرپەرشتیاری موبەقەکە خەواڵووە. موبەقەکە زۆر پیسە. ژێر سیسەم و کەرەوێتەو ناو تاقەکان هەر گەردو تۆزە. جۆڵاتەنە، کۆنە پێڵاوی کەرو لێداو و کاغەزە شڕ کە بۆنی پشیلەی تۆپیوی لێدێ، هەمیشە شتێکی ماڵەکە سەقەت و خراپە، یان دوکەڵێکیشی سۆپاکە دوکەڵ دەکات یان با، لەلای دەستشۆرەکەوە ئاو دەستەکەوە دێتە ژورێ، یان سەری کڵاو رۆژنەکە نانرێتەوە، منیش بۆ ئەوەی باسرشک نەیەتە نووسینگەمەوە، نزیکترین سەرینی بەردەستم هەڵدەگرم و دەیتەپێنمە کڵاو رۆژنەکەوە. هەندێ جار ژورێکی موبیلەدار بەکرێ دەگرم. لە سەر تەختێکی ژوورەکەم پاڵدەکەوم و بیر لە بابەتی «نارەحەتی و بێزاری» دەکەمەوە. لە ژورەکەی لای راستمەوە، ژنێکی ئەڵمانی کرێنشین هێلکەو رۆن لەسەر سۆپایەکی زوخاڵی بەرد، دروستدەکات. لەژوورەکەی لای چەپمەوە هەندێ کچۆڵە بە بوتڵە بیرە بەردەبنە یەکدی،لە



ژوورەکەمەوە دەکەومە تاوتێکردنی «ژیان» چاو لەهەموو شتێک دەپۆشم و تەنیا سەبارەت بەژنە ئەڵمانییەکە، کیژۆڵەکان و دەستەسڕی سفرە پیسەکان شت دەنووسم. خۆم لەم نوسینانەدا دەوری مەستان یان ئایدیالیستانی بێ رەونەق و لەرەواجکەوتوو دەبینم، گرنگترین بابەت کە بایەخی دەدەمێ، خانووی کرێ ی هەرزانەو رۆشنبیرانی بێکارو دەستبەتاڵە. لەگەڵ ئەمەشدا هەست بەهیچ ناکەم. بەتەواوی خۆم لەگەڵ حاڵە نزمەکەم، لەگەڵ سیسرکی رەش، لەگەڵ شێ و تەڕە شوع، لەگەڵ دۆستانی مەیخۆرمدا کە بە پێڵاوی پیسەوە لەسەر تەختەکەم رادەکشێن، رادەهێنم. نە گەرد و تۆز، نە دەرگاپیسەکان، نە تابلۆی بێزەونی ئیعلانات، نە دەرۆزەکەران، هیچیان و بەهیچ جۆرێ هەستی جوانیناسی من ناتۆرێنن و ناڕەنجێنن، وەکو سام لێنیشتو و لە عەرەبانەیەکی تەنگ و باریکدا کزو بێدەنگ دادەنیشم، با ، لەهەموو لایەکەوە هێرشم بۆ دێنێ، کابرای عەرەبانچی بێئەوەی پێیبزانێ قامچی یەکەی بەمنیشدا دەکێشێت؛ ئەسپە لەڕو لاوازەکانی بەهەزار حاڵ هەنگاو هەڵدێنن، بەڵام من هەقم بەسەر ئەمانەوە نییە، من هەقم چییە؟ دەڵێن تەلارکارانی مۆسکۆیی لەبری خانوو، قاڵبی سابونیان دروستکردووە، بۆیە شار هێندە شپڕێو و ناپوختەیە، بەڵام بەدڵی من قاڵبی سابون شتێکی خراو نییە، دەڵێن موزەخانەکانمان هەژارانەیە، زانستانە نین و بەکەڵکی هیچ نایەن. خۆ من ناچمە موزەخانان، گلەیی دەکەن، کە گوایە یەک گەلەری چاکمان هەیەو، ئەویش «تریتاکف» دایخستووە. خوای دەکرد دەرگاکەشی هەڵدەچنی. من هەقم چییە؟

هۆی دووەمی بێزارییەکەم ئەمەیە کە دڵنیام یەکجار زرنگ و فامیدەم. کە دەچمە ماڵێک، یان قسەیەک دەکەم، یان بێدەنگ دەبم یان لە کۆڕێکی ئەدەبیدا شیعرێک دەخوێنمەوە، یا لە چایخانەی تیستف دا هەرزە وێژی دەکەم، هەموو ئەم کارانە بە غرورێکی تایبەتییەوە ئەنجامدەدەم. باس نییە خۆی تێهەڵنەقورتێنم، لەهەموو مەنجەڵێک ئەسکوێمە. راستە کە قسەی ماقوڵ بەگوێمدا ناچێت، بەڵام دەتوانم زەردەخەنەی تەوسامێز بکەم. دەتوانم بە تەوسەوە شانهەڵتەکێنم. دەتوانم تیرو توانج. بهاوێژم. من کە لە ناخی ناخدا کێویم و بابایەکی ئاسیایی تەر بییەتنەدراوو رام نەبووم و بەهەموو شتێک رازی و قاییل دەبم. هەمیشە وا دەنوێنم و خۆم نیشاندەدەم کە هەندێ جار خەریکە خۆشم باوەڕ بەخۆم دەکەم. کاتێ نمایشنامەیەکی کۆمیدی نیشاندەدەن، پڕ بەدڵ حەز بەپێکەنین دەکەم، بەڵام خێرا جڵەوی خۆم دەگرم، خوا نەکا رێگەی تاقە بزەیەکیش بدەم کە بکەوێتە سەر لێوانم: ئاخۆ ئەوەی

تەنیشتنم چ دەڵێ؟ یەکێک لە پشتمەوە پێدەکەنێ. ئاوڕدەدەمەوەو مۆڕەیەکی لێدەکەم، ئەفسەرێکی بەدبەختە، هاملێتێکی خۆم ئاسایە، عوزر دێنێتەوە، بۆ ئەوەی پاساوی پێکەنینە نابەجێیەکەی بداتەوە دەڵێ: «چ ساردوسڕە، دەڵێی بوکەڵە بازییە!»

لەناوەندی پەردەکاندا سەرێ بە بارەکەدا دەکەم و بەدەنگی بەرز دەڵێم: «کە تەمسیلێکی قۆڕو قێزەوەرە. بەراستی حەیابەرەیە!»

یەکێک لەولاوە هەڵدەداتێ: «بەڵێ، بوکەڵەبازییەکی ئاساییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی پێیە، بیرێکی تێدایە.»

- بەڵام، ئەم بیرە کۆنە، چەندین ساڵ لەمەوپێش «لوپ دوو ڤگا» ئەم بیرەی خستۆتە روو و بەهیچ جۆرێ لەگەڵ ئەمەدا بەراورد ناکرێ. ئەمەیان بەڕاستی بێزەوەرە! تەحەمول ناکرێ!

بەڵام لە «ایموگن» هێندە باوێشکان دەدەم، شەویلاگەم دێتە ژان، چاوانم لە نارەحەتیدا بەقوڵا دەچن، زارم هیشک دەبێ. بەڵام ماکی بزەیەکی شادمانی دەکەوێتە سەر روم. لەبن لێوانەوە دەڵێم: «ئەمە، لاساییکردنەوەیەکی ریالیزمە، لەمێژە لەزەتی وەهام بەخۆوە نەدیوە.»

هەندێ جار دێ بەسەرمدا کەکەرێتییەک بکەم و لەنمایشێکی کۆمیدیدا دەورێک وەربگرم زۆر حەز دەکەم ئەم کارە بکەم و دەزانم کە بۆ ئەمڕۆژە تاریک و خەمناکە، ئەمە چاکترین چارەو دەوای دەردی منە، بەڵام لەکۆڕی هونەرمەندان و ئەکتەراندا چم پێدەڵێن؟ نا ،نا. خوا نەکا..

لە گەلەرییاندا، بەئانقەست چاوان خێل و قیچ دەکەم و وەکو خەڵکانی زانا سەر دەلەقێنم و بەدەنگی بەرز دەڵێم: «لێرەدا هەموو شتێک بەرچاو دەکەوێ، جەو، حاڵەت، ئاهەنگ و...هتد، بەڵام حەقیقەت و جەوهەری ئەسڵی کوا؟ فیکرو بیری بنەڕەتی لە کوێدایە؟ من ناڵێم، ئێوە بڵێن فکر لەمەدا کەی هەیە؟».

دەمەوێ رۆژنامەکان داکۆکی لەپرەنسیپی ئابڕومەندانە بکەن. هەر بەوەوە ناوەستم، دەمەوێ هەموو گوتارەکان لەلایەن پرۆفیسۆرانی گەورەوە یان لەلایەن ئەو کەسانەوە بنووسرێن کە تاراوگەی سیبریایان دیوەو جەڕباندووە. کەسێک بۆ سیبریا نەفی نەکرا بێ، یان پرۆفیسۆر نەبێت چوزانێ گوتارنووسین چییە؟

دەمەوێ کە تەنیا «مەدام یرملوف» دەوری کیژانی نموونەیی ببینێ. کیژانێک کە هەرگیز لەبیست و دوو ساڵان تێنەپەڕن. سوورم لەسەر ئەوەی ئەو ئەکتەرانەی کە



دەوری قۆشەنکێشی دەبێ شارەزای ئەدەبیات و شەکسپیر بن. تا ئەگەر بۆ وێنە ئەکتەرێک لەسەر شانۆ بڵێ: «شەوباش برناردو» هەموو تەمەشاکەران هەستبکەن کە ئەو ئەکتەرە هەر هەشت بەرگە گەورەکەی «بنەمای رەخنە»ی خوێندۆتەوە.

بەردەوام سەری چاپخانە دەدەم. بۆ وێنە دوێنێ چوومە نک بڵاوکەرەوەی گۆڤارێکی مانگانەو لێم پرسی کە ئایا ئامادەیە کتێبێکی نۆ سەد لاپەڕەییم هەیە، بۆم چاپبکات؟

کابرای بڵاوکەرەوە بە شپرزەییەوە گوتی: «بەڕاستی نازانم چبکەم؟ بەخۆتدەزانیت کە زۆر درێژەو وەختی دەوێت و ماندوومان دەکات.»

گوتم: «راستە، بەڵام کتێبێکی واقیعییە». بڵاوکەرەوەی بێنەوا بە نە بەدڵیەوە رازی دەبێت: باشە. چاپی دەکەم.

دۆستەکەم و ژنانی دیکەی ئاشنام-ش لە خوا بەزیاد بێ هەموو زرنگ و بەهۆش و فامیدەن. هەموو وەکو یەکن. جلوبەرگ، قسەکردن و رەفتاریان وەکو یەکە. تەنیا جیاوازییان لەوەدایە کە لێوی یەکێکیان لەشێوەی دڵدایەو یەکێکی دیکەیان کە پێدەکەنێ زاری وەکو تۆڕی ماسییانی گەورە دەکرێتەوە.

کیژە لێودڵەکە دەپرسێت: دوا گوتاری پروتوپوپوف-ت خوێندوەتەوە؟ گوتار نییە، یەکپارچە ئیلهامە.

کیژە دەمزلەکە دەڵێت: باوەڕ بکە کە ئیڤان ئیڤانوفچ ئیڤانوف بە گوتارە بەتامەکانی، بلینسکی وەبیری مرۆڤ دێنێتەوە. من تەنیا ئومێدم بەوە ئەگەر شتێک بکات.

دەبێ ئەوەش بڵێم کە سەردەمانێک بەینم لەگەڵ «ئەودا» هەبوو، تەنانەت ئەوەشم لەیادە کە چۆن ئاشقێنمان پێکەوە دەکرد. ئەو لەسەر قەنەفەکە دادەنیشت. هەمان کیژ کە لێوی لەشێوەی دڵدا بوو، جلوبەرگەکەی ساکارو ناشیرین بوو- لە رواڵەتبازی بێزارە- قژی شێواو شانەنەکراو بوو. دەست لە قەدی دەئاڵێنم، مەمکلغەکەی لەبن دەستمدا دەپچڕێ. گۆنای رادەموسم، سوێرە. بیری ئاڵۆزە. گێژوویژە. جلەوی لەدەست بەر بووە. دەڵێت: «خوایە چۆن دەکرێ ریشەو سەرەتا ئابڕومەندەکان لەگەڵ شتێکی نابەجێی وەکو ئەشقدا تێکەڵ بکرێ؟ ئەگەر پروتوپوپوف، بەمحاڵەوە بماندینێ چدەڵێت؟ وازم لێبێنە بابڕۆم. دۆستایەتییەکەمان تێک مەدە»

وەڵامی دەدەمەوە: «من بەدۆستایەتی رووت قەناعەت ناکەم.» ئەوجا

قامکەکانی تێک دەئاڵێنێ و دەڵێ: «بەمەرجێ خۆشمەدەویی کە هەمیشە ئامادەو لەسەر پێ بی.» کە لە ئامێزی دەگرم دەڵێ: «وەرە باپێکەوە بین»

ئیدی پێکەوە دەژین وردە وردە بۆم دەردەکەوێ کە کونی دوکەڵکێشی سۆپاکە بە بلوزێکی ئەو گیراوە. کاغەزەکانی بن تەختەکەی بۆن تەگەوری لێدێت. ئەویش لە موناقەشە و قسەکردندا قسەی بەتوێکڵ دەکات و قسان دەهاوێت. لەگەڵەربدا توتی ئاسا باسی «جەو و حاڵەت» دەکات. دیارە دەبێ ئەویش فیکرێکی هەبێ! بەدزییەوە ڤۆدگا دەخواتەوە. بەر لەوەی بخەوێ بەکرێمێکی تاڵ دەموچاوی سواغ دەدات تا گەنجتر بنوێنێ. مویەقەکەی پڕە لە پاکەتە شرپی کلینکس و پیسی دیکە. کە ئاشپەزەکەی کولیجە دروستدەکات بەشانەکەی سەری هەویرەکە دەنەخشێنێ و ئەوجا دەیخاتەوە نێو مێزەکە. کە کێک دروستدەکات بەتف کشمیشەکانی بەهەویرەکەوە دەلکێنێ. ئەوجا من ناچار هەڵدێم و خۆشەویستەکەم لێدەبێت بەشەیتان و جنۆکە. ئەویش کە فامیدەو زرنگ و زماندرێژە رووداکاتە هەر شوێنێک بەخراپە باسم دەکات و دەڵێت: «لەپرەنسیپەکانی خۆی هەڵگەڕاوەتەوە. پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی خۆی پێشێلکردووە.»

سێیەمین هۆی ناڕەحەتی و بێزاریم، حەسودی و بەغیلی لەرادەبەدەرمە. کە دەبیستم «فلان، گوتارێکی جوانی نووسیوە»و «نمایشی فیسار سەرکەوتنێکی چاکی بەدەستهێناوە»و «ی- دوسەد هەزار رۆبڵی لە قورعەکێشیدا بردۆتەوە»و «خوتبەکەی-ن-کاریگەرییەکی زۆری بووە» چاوم دەپەڕنە تەوقی سەرم. چاوەکانم دەنوقێنم و دەڵێم: «پێم خۆشە. باشبوو ئەمەی بۆ رێکەوت.. دەزانی لە ساڵی ٧٤دا لەسەر دزی گیرابوو.».

لە حەژمەتاندا دین و هار دەبم. لەناخی ناخەوە قین لەکابرای سەرکەوتوو هەڵدەگرم و لەسەری دەڕۆم: «زۆر خراپە لەگەڵ ژنەکەیدا! سێ «دۆستی» هەیە. تێکڕا کابرایەکی ناجسنە.

چیرۆکەکەی خراپ نییە، بەڵام درێویەتی، پیاوێکی هیچ و پوچ و فشەکەرە. ئەوی راستی بێ، من لەم چیرۆکەشیدا شتێکی جوان وماقوڵ نابینم، بەڵام ئەگەر شانۆنامەی یەکێک لاواز بێ و خەڵکی لێی بخوێنن ئەوا خێرا لایەنی نووسەرەکەی دەگرم و هاوار دەکەم: «نە، برادەران. نە. وانییە، بۆ خۆی شتێکە، بەهەر حاڵ ئەدەبیات هەر ئەوەیە.»

ئایا دەزانن کە هەر دەمگۆوشتێکی خراپ دەربارەی خەڵکی مۆسکۆ دەکەوێتە



سەر زاران، لەمنەوە بڵاوبووەتەوەو داهاتووە؟ بڕۆن بە بەرپرسی شار بڵێن کە ئەگەر رێگاوبانی چاکمان بۆ دروستبکات، من رقی لێهەڵدەگرم و لێی دەکەم بە قاو کە شای دزانە. ئەگەر ببیستم رۆژنامەیەک هەزار خوێنەری هەیە، ئیدی تەپڵی بۆ لێدەدەم و بەخەڵکی دەڵێم کەجلەوی خاوەنەکەی بەدەستی ژنێکەوەیە.

سەرکەوتنی خەڵکی مایەی پەستی و شەرمەزارییە بۆ من. دڵم ئەنجن ئەنجن دەکات. رەنگە بپرسن ئەدی ویژدانی کۆمەڵایەتی و سیاسیت؟ ویژدانی چی! ئەگەر رۆژێ لە رۆژان ویژدانم بووبێ ئەوا دەمێکە خۆرەی بەغیلی و حەسودی تێ ی داوەو وێرانی کردووە! بەم هەموو نەزانی و بێ تەربیەتی و بەختەیاڵی خۆم زرنگی و هوشیارییەوە، بەم دنیا بەغیلی و حەسودییەوە، بەرەنگی زەردو، بەسەری بۆزو کەچەڵمەوە، ماڵەوماڵ دەگەڕێم و ژیان لەبەرچاوی خەڵکی دەخەم. دەچمە هەر ماڵێک، زەردی و تاریکی و کەچەڵی لەگەڵ خۆدا دەبەم و بەوپەڕی نائومێدییەوە شەکران دەشکێنم: «ئەمە چ حاڵێکە خوایە، بە راستی مایەی ناڕەحەتی و بێزارییە، بنیادەم نازانێ چیبکات، تاقەتی لە هەموو شتێ دەچێت!» وەکو هەڵامەت و پەسیو و ئەنفلۆنزا بەخێرایی بڵاو دەبمەوە. لە «بێزاریدا» دەناڵێنم، دادو بێدادمە، ژیرو فامیدە دەنوێنم و کارێکی وەهادەکەم دۆستان و ئاشنایانم پەی بەو بەغیلی و حەسودییەی ناخم هەر نەبەن.. ئیدی ئەوەتا قوتابییەکی گەنج وەکو ئەوەی هەنگوینی لەدارا دۆزیبێتەوە، قسەکەی من هەڵدەگرێتەوە، بە بێزاری و بێتاقەتییەوە، کتێبەکەی تورِ دەدات، بە نائومێدییەوە سەری دەخاتە نێو هەردوو دەستی و دەڵێ: «هەموو قسەی رووتە. بنیادەم تاقەتی لە هەموو شتێک دەچێت!». وەکو من چاوانی بچوک دەکاتەوەو دەڵێ: «مامۆستایان کەوتونەتە خوتبەخوانی تا پیتاک بۆ زەرەرمەندانی قاتوقڕی و گرانی کۆبکەنەوە. دەترسم نیوەی پارەو پیتاکەکە برژێتە گیرفانی موبارەکیانەوە!».

وەکو سێبەر دەسوڕێمەوە. چ کارێک ناکەم. جگەرم رۆژ بە رۆژ پتر دەئاوسێت و گەورە دەبێت. کات دەگوزەرێ و دەگوزەرێ. پیروکەنەفت بووم. ئاقیبەت رۆژێک ئەنفلونزا دەگرم و دەمبەن بۆ گۆڕستانی «واگانکف». دۆستەکانم یەک-دوو رۆژێک بیرم لێدەکەنەوەو پاشان لەبیرم دەکەن و چ دەنگ و رەنگێکم نامێنێ.

تەمەن هەرگیز دووبارە نابێتەوە. ئەگەر لەرۆژی خۆیدا نەتوانی بەدروستی بژیت، ئەوا حیسابی لەدەست چوو بۆ تەمەنت بکە. بەڵێ بەفیڕۆچوو وگوم بوو!. لەگەڵ ئەمەشدا، من دەمتوانی هەموو شتێک فێرببم. ئەگەر ئەم بونەوەرە «ئاسیاییە»م

لەخۆ دوورخستباوە دەمتوانی مەدەنیەتی ئەوروپایی، تیجارەت، سەنعەت، کشتوکاڵ، ئەدەبیات، مۆسیقا ، نیگارکێشی، تەلارکاری، تەندروستی ئەوروپاییم خۆشبووێ و فێری ببم. دەمتوانی ڕێگەی گەورەو شەقام و جادەی پانو بەرین لەمۆسکۆدا چێبکەم. پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ چین و ئێراندا بەرپا بکەم. مەرگ و مردن کەم بکەمەوە. دژی جەهالەت. بجەنگم. دژی هەموو کۆسپ و تەگەرەیەک بخەبتم کە ئێمەی لەکاروانی ژین و ژیان دواخستووە. دەمتوانی بابایەکی بەتەربێت و بە ئەدەب، نەجیب و دڵاواو پڕ هیوابم. دەمتوانی لەزەت و سوود لەسەرکەوتنی خەڵکانی دیکە ببینم، چونکە «بچوکترین سەرکەوتن خۆی لەخۆیدا هەنگاوێکە بەرەو بەختەوەری و حەقیقەتناسی.» .

بەڵێ، دەمتوانی. دەمتوانی، بەڵام من پەڕۆکۆنێکی پیسم. زڕوزبڵێکی بێفایدەم. خەوم لێناکەوێ. بەدرێژایی شەو بیر دەکەمەوە کە لەبەرچی هێندە پەستوو بێزارم؟ ئەم وشانە تاکو سپێدە لە گوێمدا دەزرنگێتەوە: «پارچە وایەرێکی تەلەفۆن پەیدا بکەو خۆت بگەیەنە نزیکترین عامودی تەلەفۆن و خۆت لە سێدارە بدە. ئەمە تاقە ڕێگەو چارەو دەوای دەردتە.»

# جۆزیف

## ١

دنیـا تاریک بوو بوو. لەشکری شەو لێکدا لێکدا دەهاتە پێشێ. جۆزیف، سەرباز بوو، دەچووە مادونی.لەسەر جۆلانەکەی خۆی پاڵکەوتبوو. کەمێ خۆی بەرز کردەوەو لە بن لێوانەوە گوتی:«گوێت لێمە پاڤل ئیڤانوڤچ؟ لە-سوشان- سەربازێک پێی گوتم کە ماسییەک قایەغەکەیانی هەڵ لوشیوەو لە پشتی ماسییەکەوە دەرچووە!»

ئەو کابرایەی کە جۆزیف قسەی بۆ دەکرد، لە نەخۆشخانەی کەشتییەکەدا بوو. هەموو کەسێک هەر پێی دەگوت پاڤل ئیڤانوڤچ. بێدەنگ بوو و خۆی گێلکرد وەک بڵێی گوێی لە قسەکەی جۆزیف نەبووبێ.

دیسان بێدەنگی باڵی بەسەرا کێشان. با بەگڤ و هوڕ خۆی بە چارۆکەی کەشتی یەکەدا کرد. جەڕو بورغوی کەشتییەکە کەوتنە جیڕەجیڕ. شەپۆلان، هەر یەکەی بە باڵای زەلامێک دەهاتن و خۆیان بە کەشتییەکەدا دەکێشاو دەیانشۆردەوە جۆلانەکانی کەوتبوونە جیڕەجیر. بەڵام ئەوان لە مێژ بوو گوێیان بەم هەراو هەنگامەیە راهاتبوو و پێیان وابوو هەموو شتێک ئارام و خامۆشە. وەزع و حاڵێکی خەماوی بوو. سێ کەس لە نەخۆشەکان- کەشتیوانێک و دوو سەرباز- کە بەدرێژایی رۆژ وەرەقبازیان کردبوو، هەنوکە نوستبون و بەدەم خەوەوە ئەمدیوو ئەو دیویان دەکرد.

کەشتییەکە، کەوتە تەکاندان. جۆلانەکەی جۆزیف بە ئەسپایی دەهاتوو دەچوو. دەتگوت لەهەر هاتوچۆیەکدا دەڵێ: یەک، دوو، سێ. شتێک کەوتە سەر زەوی و شکا. شتێک بە قوڵپە قوڵپ رژا، پێدەچوو گۆزەی ئاوەکە بوو بێ.

جۆزیف بەدەم گوێ هەڵخستنەوە گوتی: «جلّە وی بایەکەیان بەرداوە.»

ئەمجارەیان پاڤل ئیڤانوڤچ کۆکەیەکی بۆ کردو بە بێزارییەوە وەڵامی دایەوە:



«تۆزێ لەمەوپێش گوتت ماسییەک کەشتییەکی هەڵ لوشیوە، و ئێستا دەڵێی جلّەوی بایەکەیان بەرەڵڵاکردوە، چما با حەیوانە تا جلّەوی هەبێ؟»

– خەڵکی وا دەڵێن.

– خەڵکیش وەکو تۆ نەفامن. جا خەڵکی چ ماوە نەیلێن؟ پیاو دەبێ مێشکی هەبێ و بیر بکاتەوە، گەوجە!

پاڤل ئیڤانوڤچ، هەمیشە لەدەریادا تێک دەچوو. کە کەشتییەکە دەکەوتەرێ بەدەم شەپۆلانەوە دەبوو بە بووکە سەماکەرە،توڕە دەبوو، و بە بچوکترین شت پەستدەبوو. جۆزیف نەیزانی پاڤل ئیڤانوڤچ بۆچی وەها دەهری بوو. چما شتێکی خراپی لەمەڕ ماسی و جلّەو بەر بوونی با گوتبوو کە دەماری ئەوی گرتبێ؟-«وای دابنە ماسی بە ئەندازەی کێوێک بێ و پشتی بەقەد ئەستوری و قایمی پێستی سەگی ئاوی بێ، وای دابنە ئەو سەری دنیا شورەی بەرد بێ و ئەم بایەی کە بەگڤ و هوڕ دێت لەوێندەر جلّەو کرابێ. ئەگەر یەکێک جلّەوی بەرنەدات ناتوانێ بەمجۆرە ناخۆشی بکات و وەکو سەگ پەلامار بدات و هەموو شتێک بخاتە لەرزە؟ باشە ئەگەر باجلّەو نەکرابێ بۆچی لەپڕا دەوەستێ و بێدەنگ و خامۆش دەبێت؟»

جۆزیف، ماوەیەکی زۆر بیری لە زل ماسییەکی کێوئاسا کردەوەو پاشان بیری لەزنجیری ئەستوری ژەنگگرتوو کردەوە. کە ماندوو بوو کەوتە خەیاڵی گوندەکەی خۆی. ئەو گوندەی، کە هەنووکەو پاش پەنجا ساڵ خزمەت لە رۆژهەڵاتی دوور، بۆی دەگەڕایەوە.

بە خەیاڵ حەوزە گەورە پڕ بەفرەکەی گوندی هێنایە بەرچاوی خۆی لایەکی حەوزەکە، کورەخانەیە. دوکەڵکێشەکەی چووە بە حەل حەلەی ئاسماناو دووکەڵێکی رەشی بەسەرەوەیە. گوندەکەش کەوتۆتە لایەکەی دیکەی حەوزەکەوە.

حەوشەی پێنجەم ماڵی ئەوانە. ئەلکسی ی برای لەسوچێکی حەوشەکەوە بە خۆو سورتمەکەیەوە وەدەردەکەوێ. کوڕە چکۆلەکەی «ڤانکا» لە پشتییەوە دانیشتووەو جوتێ پۆتینی لبادی لە پێیە کیژەکەشی «ئاکولکا» پۆتینی لبادی لە پێکردووە. ئەلکسی مەستە. ڤانکا پێدەکەنێ ودەموچاوی «ئاکولکا» دیار نییە، دەمامکی کردوە. جۆزیف لە دڵی خۆیدا گوتی:«ئەو منداڵانە سەرمایان دەبێ. خوایە دەست بە باڵیانەوە بگری و هێندەیان ئەقڵ و ئاوەز بدەیتێ کە حورمەتی داک و بابیان بگرن و لە داک و بابیان باشتر دەربچن.»

لەم کاتەدا کەشتیوانە نەخۆشەکە هاواریکرد:«دەبێ جێیەک بۆ ئەم پێڵاوانە

چاکبکرێ!»

پەتی بیرکردنەوەو خەیاڵی جۆزیف پچڕاو لەبری حەوزەکە، لە پڕ سەروکەلکەی گایەکی بێچاو لەبەرچاوی بەرجەستەبوو. ئەسپ و سورتمەکە لە جێی خۆ وەستان و چیدی نەچوونە پێشێ. لە جێی خۆ خولانەوەو لە نێو تەمێکی خەستی ڕەشدا لەچاو گومبون. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، جۆزیف دڵخۆشبوو بەوەی کە لە دنیای خەیاڵدا کەسوکاری خۆی بینی بوو. لە کەیفان پێکەنی. ئازای لەشی کەوتە مێرولە و قامکەکانی کەوتنە لەرزین.

بەدەم خۆ دواندنەوەو بەو تاریکی یە کەوتە چاوگێڕان بۆ ئاوی خواردنەوە. ئاوی خواردەوەو لە جێیەکەی خۆی ڕاکشایەوە. جارێکی دیکەش سورتمەکە بە خەیاڵی دا تێپەڕی، پاشان سەری گایە بێچاوەکەو ئەوجا دوکەڵە ڕەشەکە، یەک لە دووی یەک بە بەرچاویا هاتن و ڕۆیین، تاکو سپێدە بەم حاڵەوە تلایەوە.

## ٢

هەوەڵجار، لەنێو تاریکی یەکەوە تەنیا بازنەیەکی شینباوی کڵاو ڕۆژنەی کەشتیەکە دەرکەوت. پاشان جۆزیف، بەرە بەرە پاڤلئیڤانوڤچ-ی بینی کە لەسەر جۆلانەکەی خۆی و بەدانیشتنەوە خەوی لێکەوتبوو. بۆیە بەدانیشتنەوە خەوتبوو، چونکە گەر ڕابکشایە دڵی تێکدەچوو و هەناسەی بۆ نەدەدرا.ڕەنگی زەردو کەپوی درێژو چاوانی درشت بوو. بە خۆیشی تا بڵێی باریک و بنێس بوو. دەموچاوی درابوو بە یەکداو ردێنێکی تەنکی هەبوو. بەڵام بە هیچ جۆرێ پایە چینایەتی یەکەی لە سیمایدا نەدەخوێنرایەوە، ئایا خانەدان و دەوڵەمەند بوو. بازرگان بوو، دێهاتی و جوتیار بوو؟ بەرواڵەت و قژە درێژەکەیدا لە ڕەبەنێکی گۆشەنشین دەچوو. یان بەلانی کەمەوە لە گۆیەندەیەکی کڵێسا دەچوو. بەڵام دەم ودووی لەدەم و دووی کەشیشان نەدەچوو. کۆکەو نەخۆشی و گەرمای لە توانا بەدەر هێزو پرزەی لەبەر بڕی بوو. بەهەزار حاڵ هەناسەی پێدەدرا. لێوە وشکەکانی بەردەوام دەبزوان. کە هەستیکرد جۆزیف سەیریدەکات، ڕووی تێکردو گوتی:

– ئێستا خەریکە تێدەگەم کە..

– لەچی تێدەگەی پاڤل ئیڤانوڤچ؟

– بەڵێ. هەوەڵجار عەجایەبم ما کە ئێوەی نەخۆش لەبری لە خەستەخانەو



شوێنی ئیسراحەت پەرستاری بکرێن. لەم کەشتییەدا وێڵیان کردون. ئاخر ئەم کەشتییە گەرمە، ئەم هەڵبەزو دابەزە بۆ ئێوە گەل یەکجار خەتەرە، دەتانکوژێ. بەڵام ئێستا لە هەموو شتێک حاڵی بووم. هەموو شتێکم بۆ ڕونبووەتەوە. بەڵێ. دکتۆرەکان بۆیە ئێوە دەنێرنە ئێرە تا لەدەستتان ڕزگار بن. دکتۆرەکان لە ڕەفتارو ئەتواری ئێوەی کێوی بێزار دەبن.

خۆ ئێوە پارەیان نادەنێ. بۆیە ئێوە بەلای ئەوانەوە وەکو پەز وان، ڕادانتان بۆ ئەوان کارێکی ئاسانە، هیچی ناوێ تەنیا ئەوە نەبێ هەندێ بێویژدان و کەمێک دڵڕەق بن و سەبارەت بە خاڵی یەکەم دا شیان سوارە، واتا لە بێویژدانیدا بسپۆڕن و کەس بەتۆزی پێیاندا ناگات. بەڵام سەبارەت بەخاڵی دووەم ئەوا پێویستی بە هەندێک پرۆڤە هەیە. لەنێوان چوارسەد نەفەر سەربازی ساغ و کەشتیوانی مل، ئەستوردا، پێنج نەخۆشی دەغەزار هەر دیار نابێ. بەئاسانی تێکەڵ بە سەربازە ساغەکان دەکرێن،ئەم هەموو سەربازەی کە ئەوەندە بەپەلە سەرژمێر دەکرێن، ئاگایان لە هیچ نییە. بەڵام کەکەشتییەکە دوور دەکەوێتەوە، لەپڕ بۆیان دەردەکەوێ کە خەڵکی سیلاوی و نەخۆش لەسەر کەشتییەکە، شەکەت و ماندوو بوراونەتەوە.»

جۆزیف، سەری لەم قسانەی پاڤل ئیڤانوڤچ دەرنەکرد. بەڵام پێی وابوو مەبەستی ئەوە جا بۆ ئەوەی داکۆکییەک لە خۆ بکات گوتی: «من لێرە، نەخۆشکەوتم چونکە کە لە قایەغەکە هاتینە دەرێ سەرمام بوو.» پاڤل ئیڤانوڤچ گوتی: «سەیرە! کارەساتەکە لەوەدایە کە خۆیان زۆر چاکدەزانن ئێوە بڕناکەن و ناگەنە کۆتایی سەفەرەکەو کەچی هەر دەشتان نێرن. ڕەنگە هەموو ئۆقیانوسی هند ببڕن. بەڵام ئەدی پاشان! ئا ئەمەیە پاداشتی خزمەتی بێ غەل و غەشتان! بەمجۆرە چاکەتان دەدەنەوە، پاڤل ئیڤانوڤچ زۆر توڕە دەهاتە بەرچاو. کێشای بەنێوچەوانی خۆیداو، پێکەنی:«دەبێ ئەمانە لە ڕۆژنامەکاندا ڕیسوا بکرێن و دەستیان بخرێتە ڕوو.» دوو سەربازە نەخۆشەکەو کەشتیوانەکە هەنوکە هەستا بوون و دەستیان کردبووەوە بە کاغەزبازی. کەشتیوانەکە لەسەر جۆلانەکەی خۆی دانیشتبوو و سەربازەکان بە زەحمەت لەسەر عەردەکە پان بوبونەوە. یەکێک لەسەربازەکان دەستی ڕاستی بەگەردنییەوە هەڵبەستبوو، مەچەکیان بە سارغی یەک توندتوند بەستبوو، بۆیە یان دەبوو بەدەستی چەپ یاری بکات یان کاغەزەکان لە پێچی ئانیشکی دا بگرێ. کەشتییەکە هێندە خێرا هەڵبەزو دابەزی دەکرد کە مەحاڵ بوو کەسێک بتوانێ هەستێ وچایەک یان دەرمانێک بخوا. پاڤل ئیڤانوڤچ لە جۆزیف-ی پرسی:«تۆ

خولامی؟»
– بەڵێ.
پاڤل ئیڤانوڤچ بەوپەڕی خەمبارییەوە گوتی:«ئەی خوایە، وەرە پیاو لەشاری خۆی دوور بخەنەوە، پازدە هەزار میل لە ئاو خاکی خۆی دوور بکەویتەوە، لە شوێنێکی پیسی پڕ میکرۆبی سیل، بەرەڵلای بکەن و ئەوجاش جەنابی، خولام و موراسیل بێ خولامی فلان مولازم یان فیسار سەرتیپ نازانم شعوریان لە کوێیە؟».

جۆزیف گوتی:«کارێکی خراو نییە پاڤل ئیڤانوڤچ. پیاو بەیانی زوو لەخەو رادەبێت. پۆستاڵەکان بۆیاخدەکات. سەماوەرەکە دادەگیرسێنێ ژورەکە رێک دەخات و ئیدی چ کارێکی دیکەی نییە. جەنابی ئەفسەر رۆژ تا ئێواریێ خەریکی نەخشەدانانە. پیاو ئەگەر خۆی بیەوێت دەتوانێت بەدرێژایی رۆژ نوێژ بکات و وێردان بخوێنێ. یان کتێبێک بخوێنێتەوە یان بۆ خۆی پیاسەی کوچەو کۆڵانان بکا. ژیانێکی باشە.».

– بەڵێ، زۆرچاکە جەنابی ئەفسەر نەخشە دادەنێ و تۆش بەدرێژایی رۆژ لە موبەقەکەدا کەوتووی حەسرەت بۆ گوندەکەی خۆتان هەڵدەکێشیت نەخشە! نەخشە چ نییە. ژیان، ژیانی مرۆڤ گرینگە! ژیان دوبارە نابێتەوە، مرۆڤ دەبێ بە تەنگییەوە بێت.»

– پاڤل ئیڤانوڤچ. مرۆڤی بەدو خراو، خێروخۆشی نابینێ جاچ لە مالا بێ چ لە دەرێی ماڵ. بەلام ئەگەر مرۆڤ بۆ خۆی راستگۆو گوێرایەڵ بێ، کەس هەقی نییە بەسەرییەوە. ئەوانەخەڵکانی ماقوڵن و چاکو خراوەدەناسن، پەنجا ساڵی خشتە من ئێستاش رۆژی زیندانم نەدی. تەنیا تاقە جارێک لێدانم خواردووە. پەنابە خوا! خۆم بە چاوەوە نەکەم.

– لەسەر چی لێدانت خوارد؟

– شەڕم کرد، پاڤل ئیڤانوڤچ من دەستم قورسە چوار کەسی چینی هاتبونە حەوشەمان. باش لە بیرم نییە، پێموایە چیلکەیان هێنا بوو.من وەزعم تەواو نەبوو، چوم بەگژیانداو خوێنی کەپوی یەکێکیان بەربوو. جەنابی مولازم لە پەنجەرەکەوە ئەمەی دیتبوو و دارکارییەکی چاکی کردم.»

پاڤل ئیڤانوڤچ لە بن لێوانەوە گوتی:«ئەی گەوجی بەستەزمان لە هیچ تێناگەی!» و پاش تۆزێک پرسی: «بۆ لەگەڵ ئەو چینیانەدا بەشەڕ هاتی؟»

– لە خۆڕایی. ئەوان هاتنە حەوشەکەمانەوەو منیش تێیان کەوتم. بێدەنگی



باڵی بەسەردا کێشان. قوماربازەکان دوودانە سەعاتی خشت یارییان کرد. نارەحەت بون و جنێویان دەدا. هەڵبەزو دابەزی کەشتییەکە ماندووی کردن. وەرەقەکانیان فڕێداو راکشان خەیاڵ جارێکی دی جۆزیف-ی بردەوە بۆلای حەوزە گەورەکە، کورەخانەکەو گوندەکەیان جارێکی دی عەرەبانەکە بە شاشەی خەیاڵیدا رەت بوو جارێکی دی ڤانکا بۆی گرژی یەوەو ئاکولکا پاڵتۆ چەرمەکەی کردەوە. لاقەکانی درێژ کردوواهاتە بەرچاوی جۆزیف کە دەیگوت:«تەماشا بکەن، هەژارانی داماو! پۆتینەکەی من نفت و نوێیە،وەکو ئەوەی ڤانکا کۆن نییە.»

جۆزیف گوتی:« خەریکە پێ دەنێتە شەش ساڵان، بەلام زۆر بێ شعورە، لەبری ئەوەی پێڵاوەکانت نیشانبدەی بۆ ناچی ئاو بۆ مامە قۆزاقەکەت بێنی؟ شتێکی چاکت دەدەمێ.» ئەوجا «ئاندرێ»ی هاتە بەرچاو کە تفەنگێکی لە شان بوو و کەروێشکێکی کوشتبوو بەدەستی یەوە بوو.«تیشک» بە شەلە شەل بەدوویدا دەهات. دەیویست بە پولکە سابونێک کەرۆیشکەکەی لێ بسەنێ. گوێرەکە رەشەکەیان لە حەوشەدا بەسترابووەوە.و«دوما» خەریکی پینەکردنی تەنورەیەک بوو و بەدەم تەقەڵ و دورمانەوە هێواش هێواش دەگریا. دیسان سەری گایە بێ چاوەکەو دوکەڵە رەشەکە لەبەرچاوی بەرجەستە بوون. لەسەروی ئەوانەوە دەنگە دەنگ وهاوار بوو و کەشتیوانەکان بەپەلە غاریاندەدا. دەنگی راکێشانی شتێکی قورس لەسەر کەشتییەکە دەهاتە گوێ. وەک بلێی لە پڕ شتێک شکا. دیسان دەنگی پێی خەڵکانێک دەهات کە غاریاندەدا. جۆزیف لە دڵی خۆیدا گوتی:«چی بووە» ؟ تەواو گوێی هەڵخست. سەری هەڵبڕی: دوو سەربازەکەو کەشتیوانەکە هێشتا هەر قوماریان دەکرد. پاڤل ئیڤانوڤچ دانیشتبوو و لێوی دەلەرزین. دنیا زۆر گەرم بوو. جۆزیف هەناسەی سواردەبوو. تینوی بوو. بەلام ئاوەکە هێندە گەرم بوو نەدەخورایەوە. هەڵبەزو دابەزی کەشتییەکە هێدی تر بووبوو. لە پڕ یەکێک لە سەربازەکان بە جۆرێکی سەیر گۆڕا گوتی:«نەقش!» حیسابەکەی لەدەست دەرچوو و کاغەزەکانی توڕ دایە سەر زەوی. لە جێی خۆی راپەڕی و دەستی بە پێکەنین کرد، پێکەنینێکی گەوجانە. ئەبلەق ئەبلەق دەیڕوانییە دەوروبەری. گوتی:« دەقیقەیەک سەبر بکەن، برادەران!» ئەمەی گوت و لەسەر عاردەکە راکشا هەموو گێژو وێژ بوون.هاواریان لێکرد. بەلام بەرد وەدەنگ هات ئەو وەدەنگ نەهات. ئەو سەربازەی کەمەچەکی پێچرابوو گوتی:« استیفن نەخۆشیت؟ کە شیش-ت بۆ بانگ بکەم؟ ها؟»..کەشتیوانەکە گوتی:«استیفن هەستە ئاو بخۆرەوە وەرە ئاو بخۆوە

گیانەکەم.»

جۆزیف تورە بوو و هاواریکرد :«ئاوی چی؟ نابینن گەوجینە؟.»

– چی؟

– چی، چی؟ لێ بۆتەوە.مردووە. خوایە لەم قەلپیاوانە!

# ٣

هەڵبەزودابەزی کەشتییەکە هێدی تر بووبوو. پاڤل ئیڤانوڤچ هاتەوە سەرخۆ. .تایەکەی نەمابوو. سیمای بێباک دەهاتە بەرچاو. دەتگوت رستەیەکی لەسەر زارەو دەیەوێ بڵێ:«چیرۆکێکتان بۆ دەگێرمەوە کە لە پێکەنیندا ببورێنەوە» کڵاو رۆژنەی کەشتییەکەیان واز بوو و شنەیەکی فێنک و خۆشی لە دەموچاوی پاڤل ئیڤانوڤچ دەدا. غەڵبە غەڵبی خەڵک و شڵپە شڵپی سەوڵ و ئاو دەهاتە گوێ. لەژێر پەنجەرەکەوەدەنگێکی ناسک و سامناک دەهاتە گوێ، دەتگوت کابرایەکی چینی یەو ستران دەبێژێت.

پاڤل ئیڤانوڤچ گوتی: هەنوکە واین لە بەندەردا» و بزەیەکی تەوساوی بۆ کرد و: «مانگێکی دی دەگەینە روسیا ئەی جەنگاوەرانی دلێرو نەجیب راستە من دەچمە ئۆدیساو لەوێندەرەوە یەکراست دەچم بۆ خارکوف لە خارکوف دۆستێکم هەیە کە ئەدیب و نووسەرە دەچمە نک وی و پێ ی دەڵێم: دۆستی ئازیز بەسە واز لە چیرۆکی ئاشقانەی بازاری و حەیابەرە بێنە، واز لە وەسفی سروشت و ئەم شتانە بێنە، لەبری ئەوە پۆخڵەواتەکانی ئینسانی دووپێ بخەروو. من یەک دنیا بابەتم پێ یەو دەیخەمە بەردەستت بیکەبە هەوێنی نوسینەکانت» کەمێ لە فکرانرا چوو و ئەوجا گوتی: «جۆزیف دەزانی چۆنیان هەڵخەڵەتاندم؟».

– مەبەستت کێیە پاڤل ئیڤا نوڤچ؟

– هەموویان. دەزانی لە کەشتیدا تەنیا ئەوانە سواردەکەن کە بلیتی نمرە یەک ونمرە دوو دەبرن و تەنیا جوتیاران بۆیان هەیە بلیتی نمرە سێ ببرن. ئەگەر سەروسیمات رێکوپێک بێت و وەکو خانەدان بێیتە بەرچاو ئەوا مەجبوری بچی یە نمرە یەک لەوەیە ئیفلاس بکەی بەڵام ئەمەو ئەوەی بۆ نییەو «.. دەبێ ٥٠٠رۆبڵی کاش بدەی. من پرسیم. مەبەستتان لەمە چییە؟ دەتانەوێ پلەو پایەی خەڵکی بەرز بکەنەوە؟ گوتیان: نەخێر تەنیا لە بەر ئەوە رێگەت نادەین بچی یە نمرە سێ، چونکە



نمرە سێ بۆ پیاوی رێکوپێک و پاکوخاوێن بەکەڵک نایەت. نمرە سێ جێگەی لات و لەوێر و خەڵکی رووتەیە. گوتم: هەقی خۆتانە لە راستی بەتەنگی خەڵکی پاکو خاوێن و خانەدانە وەن بەڵام وێرای ئەمەش من ٥٠٠ رۆبڵم نییە چونکە نەگەنجم دۆزیوەتەوە و نەکەسم تاڵانکردووە نە مامەڵەی قاچاغم کردوەو نەکەسم بە کوشتداوە. پێم وایە ئەم پێشەکییە بەس بێ بۆ ئەوەی رێمبدەن بە نمرە سێ سەفەر بکەم و ببم بەهاورێ و هاودەرەجەی رۆشنبیرانی روس» . بەڵام گوێ لە کەس دەگرن؟ منیش ناچار بووم بکەومە فڕوفێڵ پاڵتۆیەکی دێهاتیانەم لە بەرکرد و جوتێ پێڵاوی گەورەم لە پێکردو خۆم مەست و گەوج نواند وەکو لات و لەوێران خۆم بە نوسینگەکەیاندا کرد و گوتم «قوربان بلیتێکم بدەنێ»

بەرپرسی نوسینگەکە گوتی «ئیشت چییە؟»

گوتم: سکرتێر. بابم کەشیشێکی شەریف بوو و چونکە درۆی نەدەزانی و هەمیشە راستی دەگوت، زۆری چەرمەسەری بینی» پاڤل ئیڤا نوفچ هیلاک بوو. هەناسەی سوار بوو. بەڵام درێژەی بەقسەکەی خۆیدا: «بەڵێ من کابرایەکی راستگۆم هەمیشە قسەم لە روەو لە هیچکەس و هیچ شتێک ناترسم بەینی من و ئێوە زۆرە ئێوە گەوج، دڵڕەق و گێلن چ شتێک نابینن و ئەگەر بشیبینن ئەقڵتان پێیدا ناشکێت پێتان دەڵێن جڵەوی با بەربوە دەڵێن ئێوە حەیوانن و لە حەیوان کەمترن و باوەڕیش نەکەن دارکاریتان دەکەن و ئەوجایش دەستیان ماچ دەکەن کردەی ئێوەیەو بردەی ئەوان تۆزێ پارەتان بۆ فڕێ دەدەن و ئێوەش دەڵێن «قوربان با دەستتان ماچ بکەم ئێوە لە هەموو شوێنێک هەر رەتێنراوو رەنجەرۆن من وەکو ئێوە نیم من بە ئەقڵ دەژیم من رێک وەکو هەڵۆیەک کە هەڵدەفڕێ لە بەرزی یەوە دەروانمە هەمووشتێک و لە هەمووشتێک تێدەگەم من کابرایەکی خەباتگێڕم ستەم و زوڵم دەبینم. دژی دەوەستم. فڕوفێڵ و تەزویر دەبینم، دژی دەوەستم کە دەبینم بەراز سیفەتان سەرکەوتوون، دژیان دەجەنگم من بابایەکی کۆڵنەدەرم نەئەشکەنجەو ئازاردان، نەدادگای تاقیب کردنی بیرو باوەڕ ناتوانن زمانم بگرن گەر زمانم هەڵکێشن بە ئیشارەتی دەست و سەر نارەزایی خۆم دەردەبڕم گەر حەپسم بکەن، هاوارێکی وەها دەکەم کە دەنگم سەعاتە رێ یەک بڕوات یان ماندەگرم و دەم بەزەوادەوە نادەم تا باری وێژدانی رەشیان قورستر بێ ئەگەر بشمکوژن، روحم لێیان هەڵدەگەڕێتەوە هەموو ئاشناکانم دەڵێن: پاڤل ئیڤا نوفچ تۆ کابرایەکی گەلەمە رەقی، کەس لەگەڵت هەڵناکات.. من شانازی بەم شۆرەتەوە دەکەم ٣سالان لە

رۆژهەڵاتی دووردا خزمەتم کردووەو بەشی سەد ساڵان ئەزمونی تاڵم لا کۆبۆتەوە من هەر لە سەر هەڵوێستی خۆم مامەوە دۆستەکانم لە روسیاوە نامەم بۆ دەنوسن «مەیە» بەڵام من دەرۆم و عینادییان لەگەڵ دەکەم بەڵێ ئەمەیە ژیان، من تێدەگەم بەمە دەگوترێ ژیان»

جۆزیف، گوێ ی نەدەگرت بەڵام لە پەنجەرەی کەشتییەکەوە دەیڕوانییە دەرێ. بەلەمێک بەسەر ئاوە پیرۆزەییەکەوە خنەخن دەڕۆیی بەلەمەکە لەبەرتیشکی رۆژدا دەدرەوشایەوە پیاوێکی چینی قوتو قەڵەو لەسەری دانیشتبوو. بە دوو چیلکە دار برنجی دەخوارد ئاوەکە کشومات تەیروتوی دەریایی بە سەرییەوە لە فڕین و نیشتنەوەدا بوون. جۆزیف، نیگایەکی کابرای چینی کرد. باویشکێکی داو لەفکرانڕا چوو: «چەند خۆشە زللەیەکی مزر بە بناگوێ ی ئەم زەلامە زلەدا بکێشم» و بە خۆیشی کەوتە وەنەوزدان وای هاتە بەرچاو کە هەموو جیهان لە شیرین خەودایە کات بە لەز دەبوری بێئەوەی بە خۆبزانێ شەو دەهاتوو رۆژ دەچوو کەشتییەکە، هەر چەندە بەتەکان بەرەوپێشێ دەڕۆیی، بەڵام لە تۆ وایە لە جێ ی خۆی چەقیوە ناجوڵێت.

## ٤

دوو رۆژان بوری پاڤل ئیڤانوفچ هەڵنەستا. یەک تەختە راکشا بوو چاوی نوقاندبون. کەپوی لە جاران درێژتر دەهاتە بەرچاو جۆزیف، گازیکرد «پاڤل ئیڤا نوفچ، پاڤل ئیڤا نوفچ،» پاڤل ئیڤا نوفچ چاوانی هەڵێنان و لێوەکانی جوڵاند

– چییە؟ وەزعت باش نییە؟

– پاڤل ئیڤا نوفچ بە هەناسە برکێوە وەڵامی دایەوە:– ترسم نییە. هیچم نییە. نا زۆر باشترم ئەوەتا بە خۆت دەبینی کە دەتوانم رابکشێم حاڵم زۆر باشترە.

– پاڤل ئیڤا نوفچ شوکری خوا بکە!

کە خۆم لەگەڵ ئێوەدا بەراورد دەکەم دڵم پێتان دەسوتێ سی پەلاکم سپ و ساغن کۆخەکەم خەتای بەد هەرەسییە لەم دۆزەخەدا هەڵدەکەم. بەڵام نێوی دەریای سورم لانەیەنن. ئەمە جگە لەوەی کەمن دژی نەخۆشیش دەجەنگم سەنگەری بەرگریم لێ ی گرتووە گاڵتەم پێ ی دێت وەکو چۆن گاڵتەم بەدەواو دەرمانەکانم دێت. بەڵام ئێوە،ئێوە جاهیلن. کاری ئێوە زەحمەتە، زۆریش زەحمەتە» کەشتییەکە هێدی هێدی دەڕۆیی هێدی و ئارام بوو، بەڵام هێندە گەرم بوو لەتۆ وایە گەرماوی رۆژهەڵاتییە



قسەکردن زەحمەتە و گوێگرتن زەحمەتتر بوو. جۆزیف ئەژنۆکانی لە باوەش گرتن. سەری خستنە سەریان وکەوتە بیرو خەیاڵی زێدی خۆیەوە «خوایە لەم گەرمایە خۆزگەم بە بەفرو سەرماکەی لای خۆمان» بە خەیاڵ خۆی لە سەر «سورتمەیەک» بینی یەوە و لە پڕ ئەسپەکانی رەوینەوە نەگوێیان بە جادە، نە بە کەندو دۆڵان نەدا. وەکو شێت و هاران بە چوار ناڵە بەرەو گوند بوونەوە. لە حەوزەگەورە لە کورەخانەکە تێپەڕین و ملیان نا بەکێڵگە و مەزراکانەوە خەڵکی و رێبواران هاواریاندە کرد «جڵەوەکەیان راکێشە. جڵەوەکەیان راکێشە» بەڵام بۆ جڵەویان بگرم؟ با، بای تەزی لە دەموچاو دەستەکانت بدات. واز بێنە با بەفری پەڕیوی ژێر سمی ئەسپەکان پتر بە ئاسماندا بچێ و بەسەرو گوێلاکت دا بێتە خوارێ و بەگەردن و سینگت دا داگەڕێت. واز بێنە با ئەوانەی بەغاردان خۆ لە بەر ئەسپەکان لادەدەن بپلیشێنەوە با، زین و هەو ساری ئەسپەکان پارچە پارچە بێ. چەند خۆشە عەربانەکە وەرگەڕێ و پیاو بکەوێتە چاڵە بەفرێکەوە دەموچاوی لە بەفر بچەقێ و سەراپای سپی سپی بێ و سمێلی بیبەستێ، کڵاوەکەی ئێرەو هۆ ئەوێ بپەڕێ دەستکێشەکانی لە دەست دا بکەندرێ و پشتێنەکەی بکرێتەوە، خەڵکی لە قاقای بێکەنین بدەن و کسۆکان بکەونە حەپە حەپ.. !»

پاڤل ئیڤا نوفچ، بەلا چاوێکەوە روانییە جۆزیف و بە ئەسپایی لێ ی پرسی– جۆزیف، فەرماندەکەی ئێوە دزی دەکرد؟

–پاڤل ئیڤا نوفچ، من چوزانم ئێمە مانان شتی وا نابیستینەوە

ماوەیەک بە بێدەنگی بوری جۆزیف بیریکردەوە، چوە ژێری لەگەڵ خەیاڵدا ژیا، ئاوی خواردەوە قسەکردن زەحمەت و گۆیگرتن زەحمەتتر بوو. دەترسا کەسێک قسەی لەگەڵدا بکات. سەعاتێک بوری، سەعاتی دووەم و سێیەمیش تیپەڕین. خۆراوا بوو، شەو داهات. بەڵام ئەو بەدەقی خۆیەوە دانیشتبوو و بەخەیاڵی بەفر دەژیا لەپڕ گوێ ی لە هاتنی چەند کەسێک بوو. غەڵبەغەڵب و دەنگە دەنگ هەستا بەڵام دوای پێنج دەقیقە هەموو شتێک بوو بە ئاشی ئاولێکەوتوو.

سەربازە مەچەک پێچراوەکە گوتی «خوا عافوی بکات، پیاوێکی چەتون و بزێو بوو.»

– جۆزیف پرسی

– چی یە؟کێ؟

– مردووە هەنوکە بردیانە سەرێ

جۆزیف، باوێشکێکی داو گوتی «ها، باشە باخوا عافوی بکات» سەربازە مەچەک پێچراوەکە پاش ماوەیەک پرسی
– جۆزیف بەرای تۆ دەچێتە بەهەشت؟
– کێ؟
– پاڤل ئیڤانوفچ!
– بەڵێ دەچێتە بەهشت. زۆری رەنجکێشا. ئەمە جگە لەوەی کوڕەکەشیش بوو، و کەشیشان کە سوکاریان زۆرە. هەموویان لە خوا دەپارێنەوە کە بیبەخشێت.»
سەربازە مەچەک پێچراوەکە لەسەر جۆلانەکەی جۆزیف دانیشت و بە دەنگی نزم گوتی:
– جۆزیف تۆش نۆرەت هاتووە، هەرگیز روسیا نابینی.
– جۆزیف گوتی: « دکتۆرەکەیان پەرستارە کە هیچیان پێگوتویت؟
– نەء، کەس هیچی پێنەگوتوم. خۆم دەزانم پیاو دەتوانێ بزانێ کێ زوو دەمرێ. تۆ نە نان دەخۆی و نە ئاو، هێندە لاواز بویت پیاو دەترسێت سەیرت بکات. تۆ سیلتە. من کە ئەمەت پێدەڵێم، بۆ ئەوە نییە کە نارەحەتت بکەم. بەڵام گوتم رەنگە بتەوێ تۆبە بکەیت و کەشیش بێتە دیارت. ئەگەر پارەو مارەیەکت هەیە وا چاکە لای فەرماندەکە داینێیت.
– من چ وەسێتنامەیەکم بۆ کەسوکارم نەناردوەو لە نامەکانمدا باسی مردنم نەکردوە، دەترسم بمرم و ئەوان پێنەزانن.
کەشتیوانەکە گوتی:« پێدەزانن. کە مردیت دەتخەمە تابوتێکەوەو لە ئو دیسادا یاداشتنامەیەک دەدەن بە فەرمانداری سوپایی و ئەوانیش یاداشتنامەکە وەکو خۆی دەنێرن بۆ گوندەکەی خۆت یان بۆ زێدی خۆت لە هەر کوێیەک بێت.
ئەم گفتوگۆیە جۆزیف-ی غەمبار کردو ئارەزویەکی ئاڵۆز باڵی بەسەریدا کێشا. هەستیدەکرد حەزی لە شتێکە. ئاوی خواردەوە، ئەو شتە ئاو نەبوو. خۆی گەیاندە بەر کلاو رۆژنەی کەشتییەکە، هەندێ هەوای گەرم و شێداری هەڵمژی، ئەو شتە هەوا نەبوو. هەوڵیدا خۆی بە زێدی خۆی و بەفرەوە مژوڵ بکات، ئەویش هەونە بوو. ئاقیبەت هەستیکرد کە ئەگەر یەک تۆزی دی لە نەخۆشخانەی کەشتییەکەدا وەمێنێ، دەخنکێ.« برادەران حاڵم خراپە. دەمەوێ بچمە حەوشەی کەشتییەکە، بیکەن بەخاتری عیسا بمبەنە حەوشی کەشتییەکە.»
جۆزیف، باسکی خستە سەر ملی سەربازە مەچەک پێچراوەکە و سەربازەکەش بە



دەستە ساغەکەی بن باڵی گرت و لە رارەوەکەوە بردی. لە حەوشی کەشتییەکەدا، کەشتیوانان و سەربازان بەریز خەوتبوون. هێندە زۆر بون رێنە بوو بە نێویاندا رەتبێ سەربازە مەچەک پێچراوەکە گوتی:« رێک بوەستە کراسەکەم توند بگرەو هیواش هێواش بەدومدا وەرە.» دنیا تاریک بوو. پاسەوانێک لە پێشێ کەشتییەکەوە وەکو پەیکەر بێ جوڵە راوەستا بوو. پێدەچوو بەپێوە خەوتبێ. کەشتییەکە وەکو ئەوە بوو بەرەڵلا کرابێ و بە ئارەزووی خۆی بڕوات. سەربازە مەچەک پێچراوەکە گوتی:«دەیانەوێ پاڤل ئیڤانوڤچ بخەنە دەریاکەوە. دەیخەنە تەلیسەوەو لەسەر کەشتییەکەوە تورِی هەڵدەدەن.
– ئا، وایە، وای لێدەکەن.
– مردنیش لە شوێن و رێ خۆتدا باشترە. هەر نەبێ دایکت دێتەسەر گۆڕەکەت و بۆت دەلاوێنێتەوە.
– ئەدی مەعنای چی. بۆنی کاو پەین دەهات. گایەکی زۆر لە تەویلەی حەیواناتەکەدا وەستابوون. یەک، دوو، سێ..هەشت دانە بون. ئەسپێکی چکۆلە شیان لەوێندەر بەستبووەوە جۆزیف، دەستی برد کە بیلاوێنێ، بەڵام ئەسپەکە قولاغ بووەوە، دەمی داچەقاندو ویستی قۆڵی جۆزیف بەدەمدا بەرێ. جۆزیف بە توڕەییەوە هاواری لێکرد:«عەمرت نەمێنێ! زریکەم لێدایت!»
جۆزیف و سەربازەکە هێواش هێواش خۆیان گەیاندە بەرایی کەشتییەکە. پشت لە تەویلەی حەیوانەکان و روەو دەریا راوەستان و ماتو بێدەنگ کەوتنە تەماشاکردن. ئاسمان، بەسەر سەریانەوە ستێرانی بەجریوەی گرتبووە باوەش بێدەنگی و ئارامی یەکی تایبەتی هەبوو. رێک وەکو ئاسمانی گوندەکەی خۆ یان وابوو. بەڵام ژێر پێیان تاریکی یەکی بێڕەزا بوو. شەپۆلانی رازئامێز وەکو منارە بەرز دەبوونەوە. شەپۆل بە شەپۆلی دەگوت بەولاوە. شەپۆلەکان لە پاڵە پەستۆدا بوون. یەک، یەکی دەدایە دواوە.
بەڵام هەمدیس شەپۆلانی تازە دەهاتنە پێشێ و بێباک و ناشرین خۆیان بە شەرگەکەدا دەکرد.
دەریا نەبەزەیی هەیەو نەهیچ دەچێت بەگوێی دا. ئەگەر کەشتییەکە تۆزێ بچوکتر باو لە ئاسن دروست نەکرا بوایە، ئەوا شەپۆلەکانی بێ سێ و دوو،و بێ پەشیمانی هەم کەشتییەکەو هەم خەڵکەکەی نێو کەشتییەکەیان لە چاوتروکانێکدا هەڵدەلوشی.

كـەشـتـيـيـەكـەش بێگوێ و ملهـور دەهاتە بەرچاو. ئەم دێوە كـەپو زەلامـە وەپێشدەكەوت و لەنێو مليۆنان شەپۆلدا ڕێی خۆی دەكردەوە.

نەخەمی تاریکی بوو و نەبا، نە ترسی تەنیایی هەبوو نە ترسی کاتوشوێن. گوێی لە هیچ نەبوو. ئەگەر دەریا لە جێی ئەو باو ئەو خەڵكەی هەڵگرتبا ئەوا ئەم دێوە «كەشتييەكە» تێیان دەوڕوكاو شەلم كوێرم، چاكو خراپ نابوێرم-ی هەڵدەلوشی.

جۆزيف پرسی:- ئێستا لە کوێین؟

- نازانم. لە ئوقيانوسداين.

- ووشكاييەک ديار نييە.

- دەڵێن تا حەوت ڕۆژی دی ووشكايی نابينين.

جۆزيف و سەربازەكـە چاويان بڕيە ئەو كەفـە سپـيـيـانەی كـە دەبريسكانەوە. جۆزيف، بێدەنگييەكەی شڵەقاندو گوتی: «ڕاستت دەوێ چ شتێک سامناك نيە، بەڵام پيـاو وەكو ئەوەی لە جەنگەڵێكی تاريک و نوتەكدا بێ هەست بە نارەحەتی دەكات.

ئەگەر بەلەمێكيان دێناو بە منيان دەگوت سەدميل لێخوڕەو پاشان بۆ خۆت ڕاوە مـاسی بكە، دەمكرد. ئەگـەر كـەسێكم ديتـبـا بكەوتبا دەرياكـەوە خۆم هەڵدەدايە دەرياكـەوەو ڕزگـارم دەكـرد. هەڵبـەتە ئەگەر چينی يان ئەڵمـانی بوايە خۆم لێ بە ساحێب نەدەكرد. بەڵام ئەگەر ڕوسی بوايە بێ چەندو چون فرياى دەكەوتم.

- لە مردن ناترسيت؟

- چۆن ناترسم. خەمی كەسوكارەكەمە. تاقەبرايەكم هەيە. پياوێكی ڕێكوپێک نييە. مەشروب دەخواتەوەو لە خۆڕايی ژنەكەی داركاری دەكات. ڕەنگە پيرە داک و بابەكەم خراويان بەسەر بێت.

بەڵام ئێستا لاقەكانم دەلەرزن و ناتوانم خۆم بە پێوە بگرم.

ئێرەش زۆر گەرمە برای ئازيز، با بڕۆم بخەوم.

## ٥

جۆزيف، گەڕايەوەو لەسەر جۆلانەكەی خۆی ڕاكشا. وەكو پێشوتر ئارەزوويەكی ئاڵۆز ئازاری دەدا. خۆيشی نەيدەزانی ئارەزوی چدەكات خـڵـت و خاشـەيەكی زۆر سينگی گرتبوو. سەری زرينگەی دەهات. دەمی هێند ووشک بوو هێند ووشک بوو



زاری نەدەگەڕا وەنەوزی دا، خەياڵبردييەوە، لە گەرما، لە كۆكە، لەو تارماييانەی دەهاتنە بەرچاوی وەڕز بوو. تا نزيكی سـپـێـدە كـە خـەوی لێكەوت هەر خـەونی بينی:«لە خەونيدا لە سەربازخانەيە تازە نانيان لە تەنور دەرهێناوە. لەو خەوەدا بە سينگەخشكێ خۆی خزاندە نێو تەنورەكەو خۆی دايە دەم گڕی ئاگرەكەوە. پاشان دوو ڕۆژی تەواو خەوت.

ڕۆژی سێيەم دوای نيوەڕۆ دوو كەشتيوان هاتن و لەو بەشەيان بردە دەرێ. تەپاند يانە نێو پارچە قوماشێكی ئەستورەوەو ئەوجا دوريیان، بۆ ئەوەی قورستر بێ، دوو پارچە ئاسنيان پێوە بەست، لەنێو پارچەكەدا وەكو بنجە تورێكی لێهاتبوو. سەری زل و قـەدی باريک بـوو. بەر لە خـۆراوا برديانە حەوشی كـەشـتـيـيـەكـە و لەسـەر تەختێک دايانا. سەرێكی تەختەكە بەسەر تەميانی تەويلەی حەيوانەكانەوە بوو. سـەرەكەی تری خـرابوە سـەر جانتـايەک و جـانتـاكە لەسەر تەپڵەكێكی قايم بوو. سەربازی نەخۆشو بێتاقەت لە دەوری وێستابوون. كەشيشەكە دەستپێكرد:«خوا بەروحـمی خۆی ڕەحـمی لێبكات..»سێ كەشتـيـوان گـوتيـان:«ئامين» سـەربازو شاگردانی كەشتـيـيـەكە دانەوينەوەو بەلاچاو تەماشايەكی شـەپۆلەكانيان كرد. زۆر سەير بوو كە پياو لە پارچە مـوشـەمـايەكەوە بدورن و تورِی بدەنە دەرياوە! ئايا تا ئێستا كەس وايكرد بوو؟ كەشيشەكە، جۆزيفی بە خاك تەبەڕوک كردو دانەوييەوە. سرودێک خوێنرا. ياساوڵەكە سەرێكی تەختەكەی هەڵبڕی. جۆزيف، بەسەر سەردا تل بووەوە. لە ئاسمـاندا تەقـڵـەيەكی داو ئەوجا شـڵپ كـەوتە ئاوەكـەوە. لە كـەفی دەرياكەدا وونبوو شەپۆلان وەبنيان خست. خەريک بوو بەرەو بنكی دەريا دەڕۆيی.. ئايا دەگاتە بنكی دەريا؟ دەڵێن دەريا يەكجار قوڵەو ناگەيتە بنكی. ئەو، شەست-هەفتا پێيەک چوبوە خوارێ. ئەوجا وردەوردە چوە خوارێ و بەلاو بەلادا تلی دەدا. ڕێک وەک ئەو كـاتەی خـەريک بوو بيری دەكـردەوە. ئەوجـا شـەپۆلی ئاوەكـە لەگـەڵ خـۆيدا بردی. پـتـر بـەم لاو بەولادا دەيبـرد تـا بەرەو بنكی دەريا. بەڵام لە پڕ پۆلە ماسييەكی ڕەنگاورەنگی بينی. ماسييەكان كە جەستەيەكی تاريكيان بينی تۆزێ سڵـەمينەوە ئەوجا لە پڕ هەموو بەرەو پاش گـەڕانەوە. پاش كەمـتر لە دەقيـقـەيەک وەكو گولله بەرەو جۆزيف هێرشيان هێنا. بەدەوريدا دەهاتنو دەچون. پاشان شتێكی بۆری زەبەلاح هات. سەگی دەريايی بوو. بێباک و بێسڵكردن دەهاتە پێشێ. وەكو ئەوەی چ كارێكی بە جۆزيف نەبێت، بە مەلە خۆی بەژێريدا كرد. بە پشتـا مەلەی كردو ورگی هێنايە سەرەوە.

لە ئاوە گەرمورونەکەدا خۆی خاوکردەوە. پاشان بە ئەسپایی دەمی کردەوە. دوو ریز ددانی پێوە بوو هەر مەپرسە. ماسییە رەنگاورەنگەکان کە نەوسیان بزوا بوو، وەستان تا بزانن چدەبێت. سەگە دەریاییەکە لوتێکی لە جەستەکەدا. ئەوجا بە ئەسپایی دەمی کردەوە. ددانەکانی لە جەنازەکە سوو، ئەوجا تەقەڵەکانی لەسەرێ تا خوارێ هەڵپچڕی. یەکێک لە پارچە ئاسنەکان کەوت. ماسییەکان هەڵاتن و پارچە ئاسنەکە کەوت بە قەبرغەی سەگەکەداو بەرەو بنی ئاوەکە داکشا...»

لەسەر دەریاش، هەوران دەوری هەتاوی تازە ئاوابویان گرتبوو. هەر پەڵە هەورێک بە شێوەیەک دەهاتە بەرچاو، پەڵەیەک لە شێرو یەکێکی دی لە تاقی سەرکەوتن و یەکێکی دی لە مقەست دەچوو. لە پشت هەورەکانەوە رستێکی روناکی سەوزباو تا ناوەندی ئاسمان هەڵکشابوو. تۆزێ لەولاترەوە روناکییەکی وەنەوشەیی هاتو باڵی بەسەر روناکییە سەوزەکەدا کێشاو ئەوجا روناکی یەکە رەنگێکی دی گرتە خۆ، بوو بەزەردو مەیلەو سورو ئەنجام ئاسمان شین و ساف و جوان بوو. ئۆقیانوسی گەورەش لە هەوەڵەوە لە ژێر ئاسمانی دەرخشانو جواندا مۆنی کردو شێوا. بەڵام هێندەی پێنەچوو ئەویش رەنگی هەڵێنا، رەنگی دڵگیر، جۆراجۆر،و لە زەتبەخشی گرتە خۆ. رەنگی وەهای هەڵێناو گرتە خۆ کە مەحاڵە لە زمانی مرۆڤدا ناویان هەبێ و ناویان بۆ بدۆزرێتەوە.

# لەدەفتەری بیرەوەری کیژێکەوە

## ١٣/ ئۆکتۆبەر

ئەورۆ گەلەک بەکەیفم.. ئاقیبەت ئەشق رووی کردە دڵم.

لەچاوی بەد بەدوور هیچ ناچێتە ئەقڵەوە. ئەوەتا لەبەیانی زووەوە. پیاوێکی باڵا بەرزی مووڕەش بە بەر پەنجەرەی ژورەکەمدا دێت و دەچێت. سمێڵی جوانە! چەند رۆژێکە لەبەیانی زووەوە، تا ئێوارەیەکی درەنگ بەبەر پەنجەرەی ژورەکەمدا پیاسە دەکات و بەردەوام دەڕوانێتە پەنجەرەی ژوورەکەم.

منیش بەرواڵەت وا دەنوێنم کە ئاگام لێی نییەو گوێ بەنیگاکردنەکەی ئەو نادەم.

## ١٤/ ئۆکتۆبەر

ئەورۆ، باران وەکو سێڵاو لە سپێدەوە تا شەوێ بەردەوام دەباری. بەڵام ئەو پیاوە بەستەزمانە وەکو رۆژانی پێشوو، لەبەیانی زووەوە خۆی گەیاندبووە بەرانبەر پەنجەرەی ژورەکەم و وەکو رۆژان خەریکی پیاسەکردن بوو. دڵم پێی دەسوتا، هەر بۆ ئەوەی دڵی خۆشبکەم و سارد نەبێتەوە، چاوێکم لێداگرت و ماچێکی هەواییم بۆ هەڵدا، ئەویش بەبزەیەکی شیرن وەڵامی ماچەکەی دامەوە. من نایناسم و نازانم کێیە. «ڤارای»ی خوشکم وا دەزانێت کە ئەو پیاوە مورەشە ئاشقی ئەوبووە؛ بۆیە ئەمرۆ پێی گوتم:

– ئەشقی من وایلێکردوە لەو بەر بارانە بوەستێت، هەر چەندە سەراپای تەڕ تەڕ بووە، کەچی هەر لەبەر پەنجەرەکە دوور ناکەوێتەوە..

پێم وایە ڤارا کیژێکی بێئاوەزە، دەنا چۆن دەشێت پیاوێکی مووڕەش ئاشقی کیژێکی چاوو ئەبرۆ رەش بێ؟



دایکم بەمەسەلەکەی زانی. من و ڤاریا بە تەگبیری ئەو باشترین جلکی خۆمان لەبەرکرد، سەرو سیمای خۆمان بەجوانترین شێوە ئارایشت کردو لەبەر پەنجەرەکە لێی دانیشتین. دایکم گوتی:

– لەوەیە ئەم پیاوە، مرۆڤێکی فێڵبازو دەستبڕبێت، لەوەشە مرۆڤێکی لەبارو باشبێ. بەڵام هەرچونێ بێت، دەبێ ئێوە زیاتر سەرنجی رابکێشن.

من گوتم:– دایکە تۆ سەهویت، مرۆڤێکی فێڵباز نییە.

## ١٥/ ئۆکتۆبەر

ڤاریا، زۆر نارەحەتە. لای وایە من رێی بەختەوەری ئەوم گرتووە. باوەڕی وایە من سەرچاوەی هەموو نارەحەتییەکی ئەوم. بەڵام من چ تاوان و گوناحێک لەخۆمدا شک نابەم؛ من چبکەم کابرای مووڕەش ڤاریای ناوێ و ئاشقی منە.

دەمەو عەسر، کاغەزێکم نوسی و بۆ کابرای مووڕەش-م هەڵدایە خوارەوە.. کابرا کاغەزەکەی هەڵگرت و خوێندییەوە، بەڵام دیارە کە کابرایەکی زۆر فێڵبازە؛ پارچە دەباشیرێکی لە بەرکی دەرهێناو لەسەر قوڵی چاکەتەکەی بە پیتی درشت نوسی: (جارێ). چەند دەقیقەیەک بە بەر پەنجەرەکەدا پیاسەی کردو ئەوجا خۆی گەیاندە شۆستەکەی ئەو بەرو بە دەباشیرەکە لەسەر دیوارەکە، نوسی: «بەپێشنیازەکەت قاییلم، بەڵام جارێ..» پاشئەوەی نوسینەکەی ئەوم لەسەر دیوارەکە خوێندەوە، بەلەز سڕییەوە. نازانم بۆچی دڵم بەو توندییە کەوتە لێدان؟!.

## ١٦ ئۆکتۆبەر

ڤاریا-ی خوشکم ئەمڕۆکە لە بەغیلی و حەسودی خۆیدا سیخورمەیەکی توندی بەسینگم داکێشا، ژانی بردە دڵمەوە کیژێکی شوم و پیسە، زۆر کینە لەدڵە.

کابرای مووڕەش، ئەمرۆش وەکو رۆژانی پێشوو بە بەر پەنجەرکەدا پیاسەی دەکرد. تەنانەت چەند جارێک پەنجەرەی ژوورەکەمی بەپاسەوانی گەڕەکەکە نیشاندا. بۆ چەند دەقیقەیەک قسەی لەگەڵدا کرد. لەوەیە ستایشی منی لەلا کردبێ. یان ویستبێتی فێڵ و دەهۆیەک سازبکات. یان بەقسەی لوس و زمانی تەڕو بەلێنان دڵی کابرای پاسەوان نەرم بکات و بیکات بەدۆستو ئاشنای خۆی..

ئامان لەدەست تیرەو توخمی پیاوان.. ئێوەی پیاو لەرادە بەدەر ناجسن و فێڵبازو زاڵمن، بەڵام لەگەڵ هەموو زاڵمی وناجسنی یەکتاندا، بونەوەرێکی هێندە بێ

هاوتان هەر شایستەی پەرستنن.

## ١٧/ ئۆکتۆبەر

دوێنێ شەو، براکەم لەسەفەر گەڕایەوە. فریای چوونە نێو جێ و خەوتن نەکەوت، پۆلیس گرتیان و حەپسکرا.

## ١٨/ ئۆکتۆبەر

ئەو پیاوە خوێڕییە، چەپەڵ و ناکەسبە چەیە. تازە بۆم دەرکەوت کە لەو ماوەیەدا نە لەبەر خاتری من دەهاتە بەر پەنجەرەکەو نە لەبەر خاتری ڤاریا. بەڵکو بۆ گرتنی برایەکەم، کە پارەی دایەرەیەکی دزی بوو، دەهاتە ئەوێندەرو تاقیبی دەکرد.

بەرێکەوت، ئەمڕۆش کابرای مووڕەش-م لەبەر پەنجەرەکەدا بینی. چەند سات‌ێک بەشەقامەکەدا پیاسەی کرد. پاش ئەوەی شەقامەکە چۆڵ بوو، لەسەر دیوارەکە نوسی: «لەمڕۆوە دەستم بەتاڵەو کارێکم نییە، ئامادەی فرمانی تۆم».

لەتوڕەییدا، دەموچاوم گرژ کرد. مۆڕەیەکم کرد. زمانم لێدەرهێنا... حەیوانی پیس، خوێڕی.

## حەمە کەریم عارف

* کەرکوکییەو لە ساڵی ١٩٥١ دا لە دایک بووە.
* لە ساڵی ١٩٧٥دا کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردوە.
* لە ساڵی ١٩٧٧ وە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاودەکاتەوە.
* نۆ ساڵی هەرەتی لاوی، بێ وابە ستەگی حیزبی، لە پێشمەرگایەتیدا بەسەر بردووەو، وەکو بەشداریەکی مەیدانی و، ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کورد دا، شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکوک، نووسەری کوردستان، کەلتور، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢ بە ناوی؛ گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محمدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح.ع بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.
* لە هەشتاکانەوە تا ئێستا ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکوکی یەکێتی نووسەرانی کوردی کردووە.
* زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردۆتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە، لە نرخی نەبوودان..

تەنیا ئەوەندەیە لە فەوتان رزگاربوون و هیچی دی، هەندێک لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆک.
٢- کۆچی سوور، چیرۆک.
٣- بەیداخ، چیرۆک.
٤- داوەتی کۆچەریان، کۆ چیرۆک.
٥- لەخۆ بێگانە بوون، کۆ چیرۆک.
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆک بە فارسی.

وەرگێڕان:

٧- نینا، ڕۆمانی سابت ڕەحمان.
٨- نامۆ، ڕۆمانی ئەلبێر کامۆ.
٩- ڕێبەر، ڕۆمانی مەهدی حسێن.



١٠- شکست، ڕۆمانی ئەلکساندەر فەیداف.
١١- هاوماڵەکان، ڕۆمانی ئەحمەد مەحمود.
١٢- بێناسنامەکان، ڕۆمانی عەزیز نەسین.
١٣- قوربانی، ڕۆمانی هێرب میدو.
١٤- دوورە وڵات، ڕۆمانی ع. قاسمۆف.
١٥- ئازادی یا مەرگ، ڕۆمانی کازانتراکیس.
١٦- هاوماڵەکان، ئەحمەد مەحمود «بەرگی ٢»
١٧- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، بەرگی یەکەم.
١٨- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، بەرگی دووەم.
١٩- ئامانجی ئەدەبیات، م. گۆرکی.
٢٠- دلێری خۆ ڕاگرتن، یاداشتنامەی ئەشرەفی دەهقانی.
٢١- مەسەلەی کورد لە عێراقدا، عەزیز شەریف.
٢٢- مێژوی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا.
٢٣- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعود ئەحمەد زادە.
٢٤- کورد، گەلی لەخشتە براوی غەدر لێ کراو، د.گوینتەر دێشنەر.
٢٥- لەمەهابادی خوێناویەوە بۆ کەنارێن ئاراس. نەجەف قولی پسیان.
٢٦- گوزارشتی موسیقا، د. فواد زەکەریا.
٢٧- دەرباری شیعرو شاعیر، ڕەزا بەراهەنی.
٢٨- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایزلەر.
٢٩- بەدوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل ئەلقەیسی.
٣٠- جولەکەکەدی ماڵتە، شانۆنامە، مالرو.
٣١- داد پەروەران، شانۆنامە، ئەلبێر کامۆ.
٣٢- بەد حاڵی بوون، شانۆنامە. ئەلبێر کامۆ.
٣٣- چاو بەچاو، شانۆنامە، گەوهەر موراد «غولام حوسێن ساعدی».
٣٤- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە. شکسپێر.
٣٥- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عبدوڵلا ئەلبوصێری «لەهەشتاکانەوە لای کاک مەحمود زامدارە».
٣٦- کورد لەئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا.
٣٧- هونەر و ژیانی کۆمەڵایەتی. پلیخانۆف.

٣٨- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت. ئیڤلین ریید.
٣٩- لێکدانەوەیەک لەمەڕ نامۆی ئەلبیر کامۆ.
٤٠- مندالّە دارینە، چیرۆکێکی درێژە بۆ مندالاّن.
٤١- فاشیزم چی یە، کۆ چیرۆک بۆ مندالاّن، یەلّماز گونەی.
٤٢- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بومندالاّن.
٤٣- دوژمنان، دوو کۆ چیرۆکی چیخۆف.
٤٤-ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی.
٤٥- هەلّبژاردەی چیرۆکی فارسی(١) کۆ چیرۆک: لاله، گێژاو، جێ پێ، کورتە مێژووکی ژوورەکەم، کتێب.
٤٦- چوار چیرۆک و هەلّسەنگاندنیان: کامۆ، موپاسان، پیراندیللو، چیخۆف.
٤٧- چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، حەمەکەریم عارف.
٤٨- فەرهەنگی فارسی کوردی پیتی(ا-١)، حەمەکەریم عارف.
٤٩- نوسینێت پەراگەندە «کۆمەلّە نوسینێکی هەمەجۆرە»، حەمەکەریم عارف.
٥٠- چەندین چیرۆکی بێگانە.
٥١- چرنیشڤسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس.
٥٢- چایکوفسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٣- صادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی.
٥٤- خافروغ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- رێبازە هونەریەکانی جیهان.
٥٦- ئەدگارئالن پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٧- یەلّماز گونەی هونەرمەندی شۆرشگێر، ژیان و بەرهەمی.
٥٨- ئەهلی دۆزەخ، جاک لەندەن، ژیانی بەرهەمی.
٥٩- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا.
٦٠- کۆمەلّێک ئەفسانەی جیهانی.

* لەراپەڕینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیری کوردی دەکات و بەرهەمی هەمە جۆری نووسراو و وەرگێردراو بلاّودەکاتەوە، بەتایبەتی لە رۆژنامەو گۆڤاری: برایەتی، خەبات، رێگای کوردستان، پەیمان، دەنگی میللەت، ڕامان، گولاّن، کاروان، مەتین، گازی، پەیڤ، سەنتەری برایەتی، رۆژنامەی یەکبوون.



* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و هەرکەس وگروپ و لایەنێک تەماحی بلاّوکردنەوەی هەبن، ئامادەیە بەخۆڕایی پێشکەشیان بکات...